ئەحمەد ساعی

# ڕێبازە هاوچەرخەکانی بیری گەشەسەندن

وەرگێڕانی : لوقمان سەمیعی







## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **ڕێبازە هاوچەرخەکانی بیری گەشەسەندن**
- **نووسینی: ئەحمەد ساعی**
- **وەرگێڕانی:** لوقمان سەمیعی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** ڕێمان
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٥٣٢)ی ساڵی (٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٢٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## پێشکەش بە :

سەرجەم ئەو کەسانەی وێڕای ڕێزگرتن لە جیاوازییە هزرییەکان، لە ڕێگەی ئازادی و یەکسانی و گەشەی زانستیی مرۆڤەکاندا هەوڵیان داوە.

# نێوەرۆک



## نەسکی یەکەم

## نەسکی پێنجەم

## بەسکی شەشەم

# پێشەکیی وەرگێڕ

«گەشەسەندن» یەکێک لە بابەتە گرینگ و سەرەکییەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و یەک لەوان زانستە سیاسییەکانە. «گەشە» یان «گەشەسەندن» کۆبەندێک لە ستراتیژی، پرۆگرام و سیاسەتە سەرەکییەکانی دەوڵەتەکان، بە تایبەت لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدایە، کەوا بە مەبەستی باشترکردنی ژیانی ماددی و دەرونیی هاووڵاتیان پێشکەش دەکرێ.

گەشەسەندن، پێشکەوتن و سەقامگیریی سیاسی یەکێک لە بابەتە سەرەکی و گرینگەکانی هەر نەتەوە و وڵاتێکە. هەر نەتەوەیەک بۆ مانەوەی خۆی پێویستە بەردەوام تەکنیک و ستراتیژییە نوێیەکان بناسێ و بتوانێ بۆ گەشەی خۆی کەڵکی لێ وەرگرێ. ناسینی ڕێباز و ستراتیژییە سەردەمییەکان و ئاشنابوون و خوێندنەوەی ئەزموونی گەشەی وڵاتەکان کە هەر کام ڕێباز و ستراتیژییەکی تایبەتییان بۆ گەشەی وڵاتەکانیان هەڵبژاردووە، دەتوانێ لە لایەکەوە یاریدەدەرێکی بەکەڵک بێت، بۆ تێگەیشتن لە بابەتی گەشە و کێشەکانی ئەو، لە لایەکی دیکەشەوە بەستێنێک بێ بۆ بیرکردنەوە و دارشتنی تیۆریی و ستراتیژییەکی خۆماڵیی گەشەسەندن لە کوردستاندا.

پێشگریمانەی گەشەسەندن، ئاشتی و ئاسایش و سنووری ئەمن و هەڵسوکەوتی ژیرانە و یاسامەندە. «ئادام سمیت» یەکێک لە هۆکارە گرینگەکانی گەشەی ئابووری هەر وڵاتێک لە ئاشتی و ئاسایشدا دەبینێ.

لە پێوەندییی نێوان دوو تاک، دوو دەزگا، دوو بنەماڵە، دوو حزب، دوو نەتەوە، دوو وڵاتدا، کێشەی هەرە گرینگ، کێشەی ئاسایشە. هەر وڵاتێکی گەشەخواز دەبێ ستراتێجییەکی نەتەوەیی ئەوپەڕسیاسی هەبێت. واتە ستراتێجییەکی سیاسی و نەتەوەیی کەوا سەربەخۆ بێت لە گرووپ و لایەنە سیاسییەکانی نێو ئەو وڵاتە. گرووپ و لایەنە سیاسییەکانی نێو وڵاتێک دەبێ لە بابەت سەرچاوەکانی هەڕەشە و مەترسی و، سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی هێزی نەتەوەیی و سەرچاوەکانی بەدەستهێنان و فرەوانکردنی زەخیرەی ئابووری کۆک بن. کاتێک کەوا گرووپە سیاسییەکانی نێو یەک وڵات گوریسی سیاسەت بە لای خۆیاندا بکێشن، سروشتییە کەوا ئەو وڵاتە لە گۆڕەپانی سیاسەتی دەرەوەش توانایی پێشبینیکردن و هەڵسوکەوتی یاسامەند لە دەست دەدات. ئەو بابەتە دەبێتە هۆی لاوازی و سەرلێشێواوی ئەو وڵاتە لە بەرامبەر وڵاتانی دیکە و دیارە لەو حاڵەتەدا ئەو وزەیەی کە دەبوایە بۆ چارەسەرکردنی کێشە دەرەکییەکان و بەرژەوەندییە نەتەوییەکان لە لایەن سیاسییەکانەوە تەرخان کرابایە، لە کێشە و ململانێ نێوخۆییەکان بەفیڕۆ دەچێت و جیا لە لاوازکردنی لایەنی نەتەوەیی و لە دەستدانی متمانەی نەتەوەیی هاووڵاتیان شتێکی تری لێ ناکەوێتەوە.

بەبێ بوونی ڕێباز و ستراتێجییەکی نەتەوەیی و کۆکبوونی گرووپە سیاسییەکان کە بەرهەمی هۆگریی ئەوان بە کولتووری نەتەوەییە، ناتوانین هەنگاوی پتەو بۆ گەشەسەندنی کوردستان هەڵگرین. پاژەکانی پێکهێنەری فرمولی گەشەی کوردستان دەتوانێ بریتی بێ لە: پاراستنی سەروەریی نەتەوەیی، پاراستنی کولتوور و ڕەوشتی کوردستانی (وەکو ژاپۆن و مالزی)، چارەسەرکردنی هەمیشەیی قەیرانی ڕەوایی، بەشداریی ڕێکوپێکی و بەهێزی جەماوەر لە دەستنیشانکردنی چارەنووسی وڵات، پێشکەوتن و گەشەی ئابووریی وڵات و پێوەندییی ژیرانە و دوولایەنە لەگەڵ چوارچێوەی نێونەتەوەیی.

کارامەترین حکوومەتەکان ئەوانن کەوا دەستوور و یاساکان بە سەریاندا زاڵـە، نـەک تـاک و تەفسـیرە تاکییـەکان. لـە جیهـانی مۆدێرنـدا، شـێوەی کۆنترۆڵکردن زۆر ناڕاستەوخۆیە و بەپێی پاراستنی دەروونناسانەی ئاسایشی تاک و گرووپ و کۆمەڵگە پێکهاتووە. بە هۆی وەها گۆڕانکارییەکی جیهانی و هەسـتی ڕاسـتەقینەی دەروونـی ئێمـە، فرەوانکردنـی ئەقڵانییـەتی تاکەکەسـی، گشـتی و دەوڵـەتی گرینگتـرین کـاری کردەیـی ئێمەیـە کـە هـەم ئێمـە بـەرەو حکوومـەتێکی کارامـە ڕادەکێشـێ و، هـەم لـە نێوان کەسایەتی و بیروڕاکـانی هاووڵاتیـانی کوردسـتان، نـاکۆکی و سەرلێشـێوان تـا ڕادەیـەکی زۆر کـەم دەکاتەوە. گەورەترین سەروەری و تایبەتمەندی بۆ دەسـەڵاتداران، تێگەیشتن و درکی ڕاستییەکان و چەشنی پلانڕێژی بە مەبەستی تێپەڕبوون لە ڕەوشی هەنووکەیی بەرەو ڕەوشی دڵخوازە. هەر حکوومەتێک پێویستی بە چاودێر و دیدەبانێک هەیە تا ئاسۆ بە باشی دیاری بکات. ئەو دەزگایانـەی کـەوا بیر لـە داهاتوو دەکەنەوە وەکو چاودێری دەوڵـەتـەکانن. پلانڕێژی بۆ تێپـەڕبوون لـە ڕەوشـی هەنووکـەیی بـەرەو ڕەوشـی دڵخـواز ئـەرکی دەزگاگەلێکـە کـەوا پێشەنگە کەرەسەییەکان (نخبگان ابزاری) بەڕێوەی دەبەن. سـەروەریی بیر و ئەقڵانییـەت لـەو دەزگایانـە و پاراسـتنی بەرژەوەنـدیی نەتـەوەیی، هۆکـاری دەستنیشانکەر بۆ سازکردنی بنەمایەکە، کەوا گۆڕانکاری کەسایەتی دروست دەکات و دواتر گەشەی وڵاتی لێ دەکەوێتەوە.

کۆمەڵگـەی کـوردی لـە حـاڵی گـۆڕانی ئـەرێنی و گەشـەی کولتـووری و ڕێکخسـتنی خۆیدایـە، بـەڵام تـا ئێسـتا نـەیتوانیوە بڕیـاری سـەربەخۆ بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکانی بـدات. حزبـە کوردییـەکان کـاری زۆریـان لـەو بورەدا کردووە، بەڵام بە هـۆی بەرژەوەنـدیی حزبییەوە کۆمەڵگەی کوردیان بـەش بـەش کـردووە و ئـەوە لەگـەڵ سروشـتی کۆمەڵگـەی بەهێز و پتـەو کـە بتوانێ دواڕۆژ لەسەر بابەتە چارەنوسسازەکان بڕیاری ڕژد بدات، دژایـەتی هەیـە. کەوایـە بـە هـۆی لاوازبـوونی کۆمەڵگـە، پاشـکۆبوونی مـاڵی زۆربـەی هاووڵاتیان بە حکوومەت، نەبوونی میدیای سـەربەخۆ و نـەبوونی کولتووری

تاکگەرایی ئەرێنی بەرپرسیارێتی گەشەسەندن تا ئێستاش لە سەر شانی حزبەکان و ئەو حکوومەتەیە کە ئەوان پێکیان هێناوە. هەڵبەت ئەو کێشەیە تایبەت بە کوردستان نییە و زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم ئەو کێشانەیان هەیە. وڵاتێکی وەکو ئێران تا ئێستا تەنانەت نەیتوانیوە (یان نەیهێشتووە) سیستەمێکی حزبی لە کۆمەڵگە جێ بکەوێ تا بگا بەوەی کە بیهەوێ کۆمەڵگەی ئازاد و بڕیاردەر پێکبێنێ. بەهەرحاڵ تا گەیشتن بە ڕەوشی دڵخواز، پێشەنگە سیاییەکانی (یان کەرەسەیی) کوردستان بە هاوکاری پێشەنگە فکرییەکان دەبێ «بەرپرسیارەتیی کاتیی» گەشەسەندن بە ئەستۆ بگرن. بە هەڵە تێنەگەین، ئەم بابەتە بە واتای پێشەنگسالاری (نخبە سالاری) نییە، بەڵکو بە واتای هاتنە ژورێی باشترینەکان، شارەزاترینەکان و تێرترینەکان بۆ ڕووبەری سیاسی و بڕیاردان بۆ بەڕێوەبردنی یەک وڵاتە.

بۆ دۆزینەوە و دروستکردنی پێشەنگی فکری، پێویستیمان بە پەرتووک و دەقی زانستیی باش هەیە کە ڕێباز و ستراتیجییە هاوچەرخەکان لە خۆ بگرێ. بەو مەبەستە و بۆ هەنگاونان بەرەو پێکهێنانی ڕێباز و ستراتیجییەکانی گەشەسەندن لە زانکۆکانی کوردستان دەستم بە وەرگێرانی ئەو پەرتووکە کردووە. دەبێ بگوترێ کەوا، بابەتەکانی « گەشەسەندن، کێشەکانی جیهانی سێیەم و ڕێبازەکانی گەشەسەندن» لە زانکۆکانی ئێران و زۆر لە وڵاتان، کورسیی تایبەتی هەیە و لە قۆناغەکانی کارناسی، کارناسی باڵا (مەستێر) و تەنانەت دوکتوراشدا دەگوترێتەوە.

دۆزینەوەی پەرتووکێکی باش لە بابەت گەشەسەندن و تیۆرییە جۆربەجۆرەکانییەوە کارێکی ئاسان نییە. کتێبی «ڕێبازە هاوچەرخەکانی بیری گەشە» یەکێک لەو پەرتووکە بە نرخانەیە لە بابەت باسی گەشەسەندن و کێشە ئابووری و سیاسییەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا. «ئەحمەدی ساعی» مامۆسای زانکۆی تارانە و وەکو مامۆستای میوان لە هەندێک لە زانکۆ گرینگەکانی ئێران خەریکی وانەگوتنەوە لە بواری گەشەسەندن و کێشەکانی ئابووری و سیاسیی وڵاتانی جیهانی سێیەمە. پەرتووکەکانی ئەو

سەرچاوەی سەرەکیی وانەی "گەشەسەندن و کێشە سیاسی و ئابوورییەکانی جیهانی سێیەم" لە قۆناغەکانی کارناسی و کارناسی باڵان. «ساعی» پەرتووک و نامیلکەی زۆری لەم بابەتەوە چاپ و بڵاو کردووەتەوە. پەرتووکی «رێبازە هاوچەرخەکانی بیری گەشە» لە پێشەکی خۆیدا باسێکی گشتی لە بابەت پۆلێنبەندیی تیۆرییەکانی گەشە و گەشەنەسەندن کردووە. «ساعی» بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە بابەت وێژەی گەشەسەنەن و گەشەنەسەندن، نەسکی یەکەمی تەرخان کردووە بە پێناسەکردنی بابەتە سەرەکییەکانی وەکو "سەرمایەداری و سوسیالیزم"، "دەوڵەت و چین"، "کەڵەکەکردن و دیسان بەرهەمهێنانەوەی سەرمایە"، "گەشەسەندن و گەشەنەسەندن". نەسکی دووەمی کتێبی «ساعی» لە بابەت تەفسیرە کلاسیکەکانی گەشەسەندن و گەشەنەسەندنە. «ساعی» بە لێکدانەوەی تیۆرییەکانی سێ بیرمەندی سەرەکیی ئەم ڕەوتە واتە «مارکس»، «لێنین» و «ترۆتسکی» دەیهەوێ پێمان بڵێ کەوا ئەم سێ بیرمەندە کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر کۆڕە ڕوناکبیرەکانی پێوەندییدار لەگەڵ باسی گەشەسەندن و گەشەنەسەندن و هەروەها ڕەخنەگرانی مارکس بووە. «ساعی» دەڵێ بۆ ئەوەی کە تێگەیشتنێکی هەڵەمان لە تیۆرییەکانی ئەم سێ بیرمەندە نەبێ، پێویستە بە شێوەیەکی ڕوون کێشە پێوەندییدارەکانی "کەڵەکەکردن"و "دژە کەڵەکەکردن"ی سەرمایەداری لە تیۆرییەکانی ئەوان بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. نووسەر لە نەسکەکانی سێیەم، چوارەم و پێنجەمدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و سیستەماتیک لێکدانەوەی لەسەر سێ پاڕادایمی "نوێسازی"، "پاشکۆبوون" و "سیستەمی جیهانی" کردووە. کارێکی گرینگ کەوا لە پێوەندیی لەگەڵ باسی ڕێبازەکانی ناوبراو لەم کتێبەدا کراوە، هەڵسەنگاندنی ئەو ڕێبازانە لەگەڵ یەکتر و دیاریکردنی بابەتە جیاواز و لێکچووەکانی ئەوان لە چوارچێوەی خشتەکانی هەڵسەنگاندایە. نەسکی کۆتایی و شەشەمی ئەم پەرتووکە لێکدانەوەیەکە لەسەر بابەتی گەشەسەندن لە دۆخی جیهانیبووندا. «ساعی» لەم نەسکەدا

وێــڕای پێناســـەکردنی بابـــەتی "*جیهـــانیبوون*" و جیاکردنـــەوەی ئـــەو لـــە "*جیهانیســازی*" کێشــەی گەشەســەندن لــە دۆخــی نــوێی ئــابووری و سیاســی جیهانـدا لێک دەداتـەوە. «سـاعی» خاڵـە وردەکان لـە بابـەت جیاوازیی نێوان "جیهـانیبوون" وەکـو پرۆسـەیەک و «جیهانیسـازی» وەکـو پـلان و بەرنامـەی داڕێژراو لە لایەن ئەمریکا دەخاتـە بـەرچاو و لایـەنی هۆشـیاری زانسـتی لـەو بابەتــەوە دەپــارێزێ. لــە کۆتاییــدا «ســاعی» لەســـەر ئــەو باوەڕەیــە کــەوا "جیهانیبوون" گۆڕانێکی لـە مـەودای نێوان گەشەسـەندن و گەشەنەسـەندن و هــەژاری و دەوڵەمەنــدی لــە ئاســتی جیهانــدا دروســت نــەکردووە و ئــەو مەودایانە لە دۆخی جیهانیبووندا زۆرتر بوونەوە.

**پێشەکی:**

# چەمکبەندی

## گەشەسەندن لە بۆچوونە جیاجیاکانی گەشەدا

لەگەڵ ئەوەی کە بابەتێکی وەکو گەشەسەندن بەردەوام یەکێک لە کێشە گرینگەکانی پانتایی کردەیی و هزری بووە، بەڵام لە بنەڕەتدا لە پاش شەڕی جیهانیی دووەم وشەی "گەشە" بە واتایەکی تایبەت و نوێ دەچێتە گۆڕەپانی سیاسەتە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکانەوە. لەو کاتەوە تا ئێستا کەمتر وشەیەک ئەوەندە لە پانتایی سیاسەتە نێوخۆیی و دەرەکییەکاندا کەوتووەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. گەشە و کێشەکانی ئەو هەر بەم چەشنە جێگەی خۆیان لە نێو وانە و باسەکانی زانکۆدا کردوەتەوە و، لە هەندێک لە وانەکاندا پێگەیەکی تایبەتیان هەیە. کێشەی گەشە لە پانتایی تیۆرییدارشتنە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان هەروەها پێگەیەکی گرینگی هەیە. بەشێک لە تیۆرییدارێژەکان خۆیان سەرقاڵی پرسی گەشەسەندن کردووە و کاری باشیان لەو بوارەدا پێشکەش کردووە. ئەگەرچی پێشینەی گەشە دەگەڕێتەوە بۆ پێش شەڕی جیهانیی دووەم، بەڵام پاش شەری جیهانیی دووەم وشەی "گەشەسەندن" بە شێوەی خۆوشیارانە دەچێتە نێو باسە تیۆرییەکان و پانتاییەکی گرینگ لە سەرقاڵیە هزرییەکان لەخۆ دەگرێ و ڕەوت و ڕێبازە هزرییە گرینگەکان پێک دێنێ. پێناسەکردنی ئەم ڕووداوە هزرییانە بابەتی ئەم کتێبە پێک دێنێ. پێش ئەوەی کە دەست بە پێناسەکردنی ئەم ڕووداوە هزرییانە بکەین، پێویستە چاوخشاندنێکمان لە سەر چەمکبەندیی گەشەسەندن و شێوازە سەرەکییەکانی پێوەندییدار لەگەڵ ئەم بابەتە هەبێ.

**پۆلینبەندیی تیۆرییەکانی پێوەندییدار بە گەشەسەندن:**

کێشەی گەشەسەندن بە هۆی گرینگییەک کە هەیەتی سەرقاڵییەکی زۆری بۆ هەموو کەس، لە بیرمەند، لێکۆڵەر، سیاسەتمەدار، زانکۆیەکان و تەنانەت مرۆڤی ئاسایی ساز کردووە. جگە لەوەی کە بابەتی گەشەسەندن بۆتە ڕووبەرێکی تۆێژینەوەی گرینگ، هەموو ڕەوتە سەرەکییەکانی بۆچوونە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیش ئەم بابەتەیان وەکو بابەتێکی گرینگ و سەرنجڕاکێش داناوە. گەر بمانەوێ لە ڕێبازە هزرییە کلاسیکەکان تێپەرین ڕێبازە هزرییەکانی پاش شەڕی دووەمی جیهانی، جگە لەوەی کە بابەتی گەشەیان خستۆتە ناو ڕووبەری تۆێژینەوەی خۆیان، تیۆرییگەلێکی گرینگیان لەو بابەتەوە پێشکەش کردووە. بەربڵاویی ئەم باس و لێکۆڵینەوانە تا ڕادەیەکە کەوا لە یەکەمین هەوڵدان بۆ پۆلێنبەندیی بابەتەکانی گەشەسەندن دەتوانین ئەوان بە یەکێک لە شێوەکانی سیاسی، ئابووری، کولتووری یان کۆمەڵایەتی دابەش کەین. کەوایە لە یەکەمین هەنگاودا دەتوانین بڵێین تیۆرییەکانی گەشەسەندن لەسەر کام هۆکار دامەزراون و ئەمەش بەسەر چوار دەستەی سەرەکیدا دابەش دەبێ:

١- ئەو تیۆرییانەی کەوا گرینگی بە هۆکاری کولتووری دەدەن.

٢- ئەو تیۆرییانەی کەوا گرینگی بە هۆکارە ئابوورییەکان دەدەن.

٣- ئەو تیۆرییانەی کەوا گرینگی بە هۆکارە سیاسییەکان دەدەن.

٤- ئەو تیۆرییانەی کەوا پێداگری لەسەر دابەشکاری و تایبەتیبوونی بنەماکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەکەن.

هەرکام لەم تیۆرییانە هەندێک باسی تەفسیری و هەندێک باسی ئامۆژگارانەیان تێدا دەبینرێ. لە باسە تەفسیرییەکان سەرەتا لە سەر هۆکارەکان، هۆکان یان لەمپەرەکانی گەشەسەندن قسە دەکەین و هەوڵ دەدەین لەگەڵ دیاریکردنی هۆکارە ئەرێنی یان نەرێنییەکانی گەشەسەندن، ڕێگەکانی وەدەستهێنانی گەشەسەندن نیشان بدەین، لە باسە

ئامۆژگارییەکاندا زیاتر پێداگری لەسەر ئەو شتانە دەکرێ کەوا بۆ کۆمەڵگە چاک یان خراپن. لە باسە ئامۆژگارییەکان شتە باشەکان و ئەوەی کە چ شتێک باش یان خراپە قسە دەکرێ.

**سەرگرتن و سەرنەگرتنی گەشەسەندن:**

تیۆرییەکانی گەشەسەندن لە لایەکەوە دەتوانین بە دوو دەستە؛ تیۆرییە گەشبینەکان و تیۆرییە ڕەشبینەکان دابەشیان کەین. تیۆرییە گەشبینەکان باوەڕیان بە سەرگرتنی "گەشە" هەیە بەو واتایە کە گشت وڵاتەکان توانای گەشەسەندن و تێپەڕکردنی ئەم ڕێگەیان هەیە. یان باشتر وایە بڵێین هیچ کۆسپێکی بنەڕەتی لەم بابەتەوە نابینێ. تیۆرییە ڕەشبینەکان هەندێک لە مرۆڤەکان بە هۆی ڕەوشی کولتووری یان ناوچەیی – مێژوویی ئەوان شایانی گەیشتن بە گەشە نابینن.

ڕەوتی هزریی ناسراو بە نوێسازی (مۆدێرنیزم) کەوا لە دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ لە نێوان بیرمەندان و لێکۆڵەرانی ڕۆژئاوا بەتایبەت لە ئەمریکا باو بوو، لە سەر ئەم باوەڕە بوون کەوا گشت کۆمەڵگەکان لە دۆخی نەریتی یان گەشەنەسەندوو بەرەو دۆخی مۆدێرن یان گەشەسەندوو هەنگاو دەنێن.

لە بەرامبەر تیۆرییەکانی نوێسازیدا دەستەیەک لە تیۆرییە ڕەشبینەکان لە سەر ئەم باوەڕە هاودەنگن کەوا ڕێگەی گەشەسەندن (سا ئابووری و سا سیاسی) بۆ گشت کۆمەڵگەکان کراوە نییە. ڕێگەی گەشەسەندن سەردەمێک بە هۆی زنجیرە هۆکارێکی کولتووری یان ئابووری–کۆمەڵایەتی، بۆ هەندێک لە کۆمەڵگە تایبەتە ئەورووپییەکان کراوە بووە و ئەم کۆمەڵگەیانە قۆناغەکانی بەرزبوونەوە بەرەو دۆخی گەشەسەندنیان تێپەڕاندووە. بەڵام ئەم چەشنە هۆ و هۆکارانە لە سەرجەم شوێنەکان سەرناکەوێ. کەوایە دۆخی گەشەسەندن دۆخێکی تایبەتی، مێژوویی کولتوورییە. تیۆرییە ڕەشبینەکان دەتوانین بە دوو دەستەی سەرەکی دابەشیان کەین : دەستەیەک کە جەخت لەسەر هۆکارە کولتوورییەکان دەکەن و دەستەیەک کەوا جەخت

لەسەر هۆکارە ئابووری – کۆمەڵایەتییەکان دەکەن. جگە لەوە تیۆرییە ڕەشبینەکان لەو لایەنەوە کە ئایا "گەشەی نێوخۆیی" تەنیا بە کۆمەڵگە تایبەتەکانەوە تەرخان بووە یان لەو ڕووەوە کەوا ئەگەری "گەشەی دەرەکی" بۆ هەندێک لە کۆمەڵگەکان بوونی نییە، بە دوو دەستە دابەش دەبن: دەستەیەک کەوا هەر چەشنە گەشەیەک، نێوخۆیی یان دەرەکی بۆ هەندێک کۆمەڵگەی گونجاو نابینن. تیۆرییەکانی ناسراو بە "پاشکۆبوون" کە لە نەسکە داهاتووەکان باسیان دەکەین، لە دوایین بۆچوونەکانی خۆیاندا بەم چەشنە بیر دەکەنەوە. تیۆرییە پاشکۆبوونەکان، لەوانە بەناوبانگترین تیۆرییدارێژی پاشکۆبوون، واتە «ئاندرێ گوندر فرانک»، لە دوایین نوسراوەکانی خۆی بە ڕەشبینیی ڕەها گەیشت. ئەوان بە تەواویی لەسەر ئەوەی کە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان، گەشە بسێنن پاشگەز بوونەوە.

تیۆرییە ڕەشبینەکانی باسی گەشە لە ڕووی سەرچاوە و هۆکارەکانی گەشەسەندوویی و گەشەنەسەندوویی بە دوو دەستەی سەرەکی دابەش دەبن: ئەو تیۆرییانەی کەوا جەخت لەسەر کولتوور دەکەن و ئەو تیۆرییانەی کەوا پێداگری لەسەر هۆکارە کۆمەڵایەتی–ئابوورییەکان دەکەن. لە نێو دەستەی یەکەمدا تیۆرییەکانی «ماکس ڤێبر» کۆمەڵناسی ناسراوی ئاڵمانی ناوبانگێکی تایبەتی هەیە. «ماکس ڤێبر» "نوێسازی" یان "مۆدێرنیزەبوون" بە واتای "عەقڵانیبوون" لێک دەداتەوە. عەقڵانیبوون بە هۆی گۆڕانکاری نێوخۆی جیهانبینیی مەسیحی، یان بە واتایەکی گشتیتر بە هۆی *"ئەفسوونسڕینەوەی"* ئایینی پێکهاتووە.[١] ئەورووپای ڕۆژئاوا لە ژێر کاریگەریی ئەفسوونسڕینەوەی ئایینی و سەرهەڵدانی ڕەوشێکی پرنسیپانە لە نێوان توێژی سەرمایەداری و جێگورکێی ئەو بە ئۆرگانە یاسایی و ئابوورییەکانی کۆمەڵگە ڕێگەی عەقڵانیبوونی تێپەڕ کردووە. ئەم گۆڕانکاریانە تەنیا لە کۆمەڵگە ئەورووپییە ڕۆژئاواییەکان ڕووی داوە و دیاردەیەکی گشتی نییە. ئەگەرچی بە ڕای «ڤێبر» گشت ئایینەکان بەرەو عەقڵانیبوونی هەنگاو دەنێن، بەڵام ئەوەی لەم قۆناغە مێژووییەدا مۆدێرنیزمی پێکهێنا، لە

ئەورووپای رۆژئاوا ڕووی داوە. چارەنووسی نوێسازی لە کۆمەڵگەکانی دیکەدا لەمەو بەدوا بە پەرەگرتنی دامودەزگا پێکهاتووەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا گرێ دراوە. گرینگترین دامودەزگاکان بریتین لە "یاسا سەرمایەدارییەکان" و "سیستەمی بیرۆکراسی دەوڵەتی مۆدێرن". ئێمە لێرەدا بەم ئاماژانەی سەرەوە باسەکە کورت دەکەینەوە و پاشان بە تێروتەسەلی باسی تیۆرییەکانی «ماکس ڤێبر» دەکەین:

## زۆرداریی ڕۆژهەڵاتی و لەمپەرەکانی گەشەسەندن:

لەو بەشەدا بەوردی لەمەڕ یەکێک لە ڕوانگە ڕەشبینەکان کە بەجێی کولتوور جەخت لەسەر هۆکارە ئابووری – کۆمەڵایەتییەکان دەکات، قسە دەکەین. لە نێوان بۆچوونە مارکسیستەکان کە لە پاشان باسی دەکەین، بۆچوونێک هەیە کەوا لێکۆڵینەوەی لەمەڕ لەمپەرەکانی گەشە لە نێوان هەندێک لە کۆمەڵگەکان کردووە و تێزێکی تایبەتی پێشکەش کردووە. ئەم بۆچوونە لە نووسراوەکانی «کارێل ویتفۆگێل» کاریگەری وەرگرتووە. «ویتفۆگێل»کە لەکاتی خۆیدا بەرەنگاری ڕەوتی باوی مارکسیزم ناسراو بە «مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس» بۆتەوە، "گەشەسەندوویی تاکهێڵی"، شێلگیرانە خستە ژێر لێکۆڵینەوە. «ویتفۆگێل» دەڵێ دەزگای کۆمەڵایەتی، دەزگای بەرهەمهێنان و ڕەوتی ژیانی سیاسی لە "وڵاتانی ئاسیایی" لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەوەی کە لە وڵاتە ئەورووپییەکان بوونی بووە جیاوازی بووە. ئەو کۆمەڵگەیانەی کە خاوەن سیستەمی ئاسیایی بوون بە هۆی دۆخی ناوچەیی- مێژوویی کۆمەڵگەکەیان بەهرەمەندی تێپەڕکردنی قۆناغە گەشەکانیان وەکو ئەوەی «مارکس» بۆ کۆمەڵگە ئەورووپییەکان پۆلێنبەندی کردبوو (سیستەمی هۆزەکی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری) نەبوو. ئەو کۆمەڵگەیانە کە لەناوچە کەم ئاوەکان دروست بوون، خاوەن سیستەمی ئابووری کۆمەڵایەتی تایبەت و جیاواز لە سیستەمە ئەورووپیەکانن و بە «سیستەمی ئاسیایی» ناویان دەرکردووە. دەوڵەت لە سیستەمە

ئاسیاییەکاندا بە هۆی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی کە کۆنترۆڵکردنی سیستەمی ئاوداشتن و پاراستنی ئاسایشە پێگە و هێزێکی تایبەتی گرتۆتە دەست. ئەم دەوڵەتە کەوا بنەمایەکی بیرۆکراسی بە خۆوە گرتووە، دیاردەی «زۆرداریی ڕۆژهەڵاتی» پێکهێناوە. لە زۆرداری ڕۆژهەڵاتیدا کۆمەڵگەی مەدەنی و شەڕی چینایەتی دروست نابێ. لێرەدا شەڕی چینایەتی ناتوانێ بەو جۆرەی کەوا «مارکس» و «ئینگلس» لە مانیفێستی کۆمۆنیزمدا گوتوویانە مۆتۆڕی بزوێنەری مێژوو بێت. زۆرداریی ڕۆژهەڵاتی هەر چەشنە »وزەی مێژوویی» بۆ شەڕ و چالاکی سیاسی مانادار دەخنکێنێ. شەڕی سیاسی بۆ ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی ڕوو نادات و ئەم کۆمەڵگەیانە تووشی زنجیرەیەک ململانێی کۆمەڵایەتی (بەڵام نە سیاسی و چینایەتی) بێ ئەنجام دەبن و بە دەوری خۆیاندا دەسووڕێنەوە.[٢] نەبوونی سەرمایەداری سەربەخۆ و شەڕی چینایەتیی شێلگیر دەبێتە هۆی سستبوونی سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی.[٣] ئەم کۆمەڵگەیانە لە قۆناغی منداڵی و سەرەتای گەشەی کۆمەڵگە مرۆڤییەکاندا دەمێننەوە.[٤]

ئایا ئەم وڵاتانە بۆ هەمیشە لەو قۆناغە منداڵییە دەمێننەوە یا ڕێگەیەکی دەرچوونیان هەیە؟ بە پێی بۆچوونێک کە بەم چەشنە دەڕوانێتە گۆڕان و گەشەسەندن، کۆمەڵگە ئاسیاییەکان (کە هەڵبەت مەبەست لە ئاسیا مانا جوگرافییەکەی نییە، بەڵکو ئەمریکای باشووریش لە خۆ دەگرێ) ڕێگەی دەرچوونی «نێوخۆیی»یان نییە. بەڵام ڕێگەی دەرچوونی «دەرەکی»یان هەیە. کۆمەڵگەی ئاسیایی لەگەڵ هاتنی سەرمایەداری کەوا هێرشی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزمی لەگەڵدا بوو، خولێکی نوێی لە گۆڕانکاری بە خۆیەوە دی. هەندێک لە تیۆرییداڕێژان لەسەر ئەو باوەڕەن کە سیستەمە ئاسیاییەکان لە ژێر کاریگەری سەرمایەداریی ڕۆژئاوادا بە یەکجاری چوونەتە نێو سیستەمی نوێی سەرمایەدارییەوە. سەمایەداری کە لە بنەڕەتدا سیستەمێکی جیهانییە، گشت جیهانی لەخۆگرتووە.

بەڵام لە بابەت ئەوەی کە ئایا ڕۆیشتن بەنێو ڕووبەری سەرمایەداریی جیهانی گەشەسەندنی پێ دەگوترێ و گەشەسەندنی وڵاتانی بە دواوەیە یا نا، بۆچوونی جیاجیا هەیە کە لە دوو دەستە تیۆریی ڕەشبینانە و گەشبینانەدا دەتوانین جیایان بکەینەوە. دواتر باسی ئەوە دەکەین کە »مارکس» لە کاتی وتوویژ لە بابەت ڕۆڵی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیس لە هێند، وێڕای وەبیرهێنانەوەی شوێنەواری خراپی کۆلۆنیالیزم، لە هەندێک لایەنەوە بەم جۆرە بیروڕای خۆی دەربڕیوە، کەوا کۆلۆنیالیزمی ئینگلیس کۆمەڵگەی خەوتووی ئاسیایی لە خەوی چەند سەدەیی ڕاپەڕاند و جووڵەیەکی نوێی پێبەخشی.(٥) بەڵام «ویتفوگێل» لە سەر ئەو باوەڕە سوور بوو کە ئەزموونی مێژوویی، بۆچوونەکەی «مارکس» پشت ڕاست ناکاتەوە. هەلومەرجی هێند نابێ بۆ گشت ناوچەکان گشتی کرێتەوە. تیۆرییداڕێژانی نێزیک بە ڕەوتی تیۆرییە پاشکۆبوونەکان هەروەها لەو بابەتەوە بەرەو لای ڕەشبینی پەلیان کوتاوە.

**پاشکۆبوون و گەشەنەسەندوویی مۆدێرن:**

ئەو دەستە تیۆرییەی کە وەکو تیۆرییە پاشکۆبوونەکان پێناسەکراون، دەربڕینێکی تایبەتیان لە بابەت گەشە و گەشەنەسەندوویی هەیە. ئەم دەستە تیۆرییانە بەرهەمی شکستهێنانی ئەو چاوەڕوانیانە بوون کەوا لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی بۆ گەشەی وڵاتە نوێ سەربەخۆکان پێشکەش کرابوون. هەروەها دژکردەوەیەک بوو لە بەرامبەر تیۆرییە گەشبینەکانی مۆدێرنیستەکان (تیۆرییە نوێسازیەکان) لە دەیەی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ کە باوەڕیان بە تێپەربوونی بێگەڕانەوەی کۆمەڵگە نەریتیەکان بەرەو کۆمەڵگە مۆدێرنەکان بوو. دەستەیەک لە تیۆرییە پاشکۆبووەکان لەسەر ئەو باوەرە بوون کەوا گەشەنەسەندوویی و گەشەسەندوویی دوو دیاردەی جیا لەیەک نین بەڵکو دوو لای ڕاستیەکی یەکن. گەشەسەندوویی هەندێک لە وڵاتەکان گەشەنەسەندوویی وڵاتانی دیکەی لەدوایە. «پۆل باران» کە یەکێک لە

تیۆرییداریژانی ئەم بوارەیە دەڵێ بۆ هەڵسەنگاندنی گەشەی سەرمایەداری لە وڵاتە گەشەسەندووەکان دەبێ سەرنج بدەینە ڕادەی ئەو سەرمایانەی کەوا لە وڵاتە دواکەوتووەکان بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان دەگواسترێتەوە. ئەم تیۆرییدارێژانە دابەشکردنی وڵاتەکان بە »نەریتی» و «مۆدێڕن» پەسەند ناکەن و لەسەر ئەو باوەڕە نین کە وڵاتە دواکەوتووەکان بە هۆی ڕەوشی نەریتی خۆیان گەشەیان نەکردووە و وڵاتە پێشکەوتووەکان بە هۆی ڕەوشی مۆدێرنی خۆیان گەشەیان سەندووە. ئەوان دەڵێن هەر دوو دەستە لەم وڵاتانە مۆدێڕنن. لە پێش سازبوونی ئەم دۆخە مۆدێڕنە، هەر دوو دەستە لەو وڵاتانە لە ڕەوشێکی هاوشێوەدا بوون. دەستەیەک لە تیۆرییەکانی پاشکۆبوون تەنیا ڕێگەی دەرچوون لە دوواکەوتوویی مۆدێرن، لە شۆڕشی سوسیالیستیدا دەبیننەوە.[٧] ڕەشبینەکان لەسەر ئەم باوەڕەن *"دابەشکاری جیهانی کار"* کەوا هەنووکە دۆخێکی چارەسەرنەکراوی بە خۆیەوە گرتووە، بەو ڕەوشەی کەوا لە پرۆسەی "جیهانیبووندا" بە خۆیەوە دەگرێ، دابڕان لە سیستەمی جیهانی نامسۆگەر دەکات.[٨]

**گەڕان بە دوای چوارچێوەیەکی چەمکیانە:**

باس و لێکۆڵینەوە لە بابەت چۆنێتی گەشەی کۆمەڵگە مرۆڤییەکان و هەروەها گەشەی ژیانی سیاسی و ئابووریی ئەوان پێشینەیەکی دێرینی هەیە. لەوانە دەتوانین ئاماژە بە ئەندیشەی دامەزرێنەرانی ئابووری کلاسیک وەکو «ئادام سمیت» و «دەیڤید ڕیکاردۆ» لە سەدەی هەژدە و دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی، وەکو «سێن سیمون» و «ئاگوست کۆنت» لە سەدەی نۆزدەدا بکەین کە هەڵگری ڕوانگە سەرنجراکێشەکان لە بابەت جموجۆڵی کۆمەڵایەتین. بەڵام باسێکی ڕوون لە بابەت کێشەکانی گەشەسەندن، بە تایبەت لەو لایەنەوە کەوا پێوەندیی بە وڵاتە گەشەنەسەندووەکانەوە هەیە، لەشەڕی دووەمی جیهانی بەم لاوە بە لوتکەی خۆی گەیشتووە.

چارەنووسی وڵاتگەلێک کە پاش شەڕ سەربەخۆبوون و ململانێی دوو سیستەمی بەربەرەکانیکەر لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بۆشایەکی نوێی لە باسی گەشەسەندن ساز کرد. لە دەیەی ١٩٥٠ تیۆرییە نوێیەکانی گەشەسەندن پەرەیان سەند. ئەم باسانە بابەتی گەشەیان لە گشت بوارە سیاسی، ئابووری و کولتوورییەکان خستبووە بەرچاو. یەکەمین کێشە کەوا ڕووبەڕووی لێکۆڵەران و بیرمەندانی چەمکی گەشەسەندن بۆوە، دۆزینەوەی چوارچێوەیەکی چەمکی گونجاو بۆ تێگەیشتن لە دۆخی وڵاتگەلێک بوو کە تەنیا لایەنی هاوبەشیان دوواکەوتوویی لە بەرامبەر جیهانی پێشکەوتووی پیشەسازیدا بوو. بیرمەندانی سەر بە جیهانی ڕۆژئاوا بۆ پشکنینی چوارچێوەیەکی چەمکی بە دوای نەریتە هزرییەکانی تیۆرییە کۆمەڵایەتیەکان لە سەردەمی کلاسیکی گەشەی کۆمەڵناسی ڕۆیشتن. نەریتە هزرییە گرینگەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم پێشکەوتنیان بە دەست هێناوە. نەریتەکانی «ئاگوست کۆنت»، «هێربێرت سپەنسەر»، «کارڵ مارکس»، «ئێمیل دورکیم» و کەسانی دیکە لە وەها نەریتگەلێکن.

لە نێوان ئەم بیرمەندانە »ماکس ڤێبر»، «دورکیم» و«سپەنسەر» لە لایکەوە و «مارکس» لە لایەکی دیکەوە وەکو سەرچاوەی زنجیرە تیۆرییەکی پێوەندییدار بە "گەشە" لە قەڵەمدراون. تیۆرییەکانی «ماکس ڤێبر» لە لایەکەوە سەرچاوەی ئەو تیۆرییانەن کەوا جەختیان لەسەر کولتوورە. لە لایەکی دیکەوە تیۆرییەکانی "سیستەمی" و "نوێسازی" هەروەها لە بۆچوونەکانی «ماکس ڤێبر» سەرچاوەیان گرتووە. «سپەنسەر»، «دورکیم» و «ماکس ڤێبر» سەرچاوەی تیۆریی سیستەمین کە سەردەمێک بۆچوونەکانیان بەسەر "تیۆرییە گەشەکاندا" زاڵ بوو. بەم شێوەیە بە کەڵکوەرگرتن لە سەرچاوەکانی ئەم سێ بیرمەندە، تیۆرییەکانی "سیستەمی"، "کارکردگەرایی سیستەمی" و "بنەماخوازی سیستەمی" سازبوون. ئەم دەزگا تیۆرییانە، تیۆرییە نوێسازییەکانیان لەنێو ڕووبەڕی خوێندنەوەکانی گەشەسەندن پێکهێنا. تیۆرییە "نوێسازییەکان" دەچنە ڕیزی

تیۆرییه گەشبینەکانەوە و لەسەر ئەم پێش گریمانەیە دروستبوون کەوا گشت کۆمەڵگە مرۆڤییەکان لە دۆخی نەریتییەوە بەرەو مۆدێرنیزم هەنگاو دەنێن. مەبەستی ئەوان لە مۆدێرنیزم لە پانتایی گەشەدا زۆربوونی سیستەمە لیبراڵەکانە.[٩] «واڵت ڕۆستۆ» هاودەنگ لەگەڵ ئەم بۆچوونە، تیۆریی خۆی لە مەڕ قەڵمبازلێدانی ئابووری پێشکەش کرد. گریمانەی ئەو ئەمە بوو کەوا گشت کۆمەڵگەکان لە پێنج قۆناغی پێشکەوتن و قەڵەمبازلێدان تێدەپەڕن. یەکێک لەو کەسە بەناوبانگانەی کەوا لە کۆمەڵناسیدا ئەم چەشنە ستراتیژیەی پەرەپێدا، «تاڵکۆت پارسۆنز» بوو کەوا لە بەشەکانی دیکە بە وردی باسی دەکەین.

«کارڵ مارکس» بیرمەندێکی دیکەی سەدەی بیستەم بوو کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم سەرچاوەی زنجیرە تیۆرییەکی گەشەسەندن بوو. ئێمە سەبارەت بەوەی کە ئەم تیۆرییانە تا چ ڕادەیەک نێزیک یان وەفادار و یان ئەوەی کە جیا لە بۆچوونەکانی «مارکس» بوون کارمان نییە. هەر وەکو لە بابەت بیرمەندانی پێشتر ئاماژەپێکراوەوە، «ماکس ڤێبر» و «دورکیم» بەم چەشنەیە. تیۆرییدارێژانی سەربە تیۆرییە مارکسیستیەکان سێ دەستە لە تیۆرییەکانی گەشە و نوێسازی دروست دەکەن : "تیۆریی پاشکۆبوون"، "تیۆرییە نوێ مارکسیستیەکان" و "تیۆرییەکانی سیستەمی جیهانی". دوو دەستەی یەکەم زۆر لە یەک نێزیکن و سنووری هاوبەشی زۆریان هەیە. بەڵام لە هەندێک خاڵی گرینگدا جیاوازن. هەر دوو دەستە لە سەر ئەم باوەڕەن کە کۆلۆنیالیزم، ئیمپریالیزم و ئەڵقە پاشکۆکانی کۆمەڵگە گەشەنەسەندووەکان بە کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان لە هۆکارە گرینگەکانی گەشەنەسەندوویی کۆمەڵگەکانی دەستەی یەکەمە. بەڵام لە حاڵێکدا کەوا، "تیۆرییە پاشکۆبوونەکان" پێشکەوتنی کۆمەڵگە گەشەنەسەندووەکان دەبەستنەوە بە پێشکەوتنی کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان، "نوێمارکسیستەکان" پێشکەوتنی نێوخۆیی کۆمەڵگە گەشەنەسەندووەکان بە گرینگ دەزانن، ئەگەرچی کاریگەری ئەڵقە پاشکۆکان لەم پێشکەوتنە

لەبەرچاو دەگرن. "تیۆریی سیستەمی جیهانی" کە »والرشتاین« پێشکەشی کردووە تیۆرییەکی تێکچنراوترە. لەم تیۆرییەدا جیهان وەکو پێکهاتەیەکی گشتی دەبیندرێ کە لەوێدا کۆمەڵگەکان بە پێی کارکردەکانیان (ئەرکەکانیان) لە سیستەمی جیهانیدا بە شێوەی هیرارشی بە: "نێوەند"، "کەمەرە نێوەند"، "کەمەرە کەمەرە" چوارچێوبەندی کراون. والرشتاین ئەم ڕوانگە هەنووکەییە کە وڵاتەکان بە شێوەی یەکە (واحد) جیاجیاکان دەبینێ کە لەگەڵ یەکتردا لە پێوەندیی میکانیکیدان دەخاتە بەر ڕەخنەوە و لە سەر ئەم باوەڕەیە کەوا جیهان دەبێ وەکو سیستەمێک چاو لێبکرێ کەوا پێکهاتە و بەشەکانی تایبەت بە خۆی هەیە. سەرمایەداری نێوەڕۆکی ئەم سیستەمە دەستنیشان دەکات.

**کولتوور و گەشە:**

تیۆرییگەلێک کەوا ڕۆڵ و پێگەی "کولتوور" وەکو هۆکاری سەرەکی و بنەڕەتیی گەشە دادەنێن هەر کام بە شێوەیەک لە ژێر کاریگەری «ماکس ڤێبر»دان. هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد «ماکس ڤێبر» گەشە و مۆدێرنیتە لەگەڵ "عەقڵانیبوون" پەیوەند دەدات و عەقڵانیبوون وەکو پاشهاتی "ئەفسونسڕینەوە" لەنێو نەریتی ئایینی و جێگۆرکێی "عەقڵانیبوونی کولتووری" بە "عەقڵانیبوونی کۆمەڵایەتی" لێک دەداتەوە. لەسەر بنەڕەتی ڕۆڵی لەپێشتری کولتوور، تیۆریی «مرۆڤی مۆدێرن» دروست بووە. مرۆڤی مۆدێرن مرۆڤێکە چالاک، پلاندارێژ، بەرزەفڕ، کارامە، خاوەن متمانەبەخۆ و نەرم و نهێن. ئەم مرۆڤە کەسێکە کەوا کۆمەڵگەی نوێساز دەکا. مرۆڤی مۆدێرن خاڵی بەرامبەری «مرۆڤی نەریتیە». مرۆڤی نەریتی بوونەوەرێکە کۆنەپەرەست، پارێزکار، ڕەشبین بە هەرشتێکی نوێ، نەبوونی ورەی بەرزەفڕی، بێتوانا لە پلانداڕشتن و شێواو. «پارسۆنز» لە سەردەمی گەشەی هزری خۆی بۆچوونێکی هاوشێوەی ئەم بۆچوونەی بووە.

«دەیوید مەککلەند» یەکێک لە تیۆرییەکانی سەر بەم بۆچوونەی چوارچێوەبەندی کردووە. «مەک کلەند» تیۆرییەکی هەیە کەوا، تەوەرەی

ئەم تیۆرییە لەسەر ورەی «سەرکەوتنخوازی» دامەزراوە. ئەم ورە سەرکەوتنخوازە وەکو هۆکاری مۆدێرنیزم و گەشە دەژمێردرێ. بە ڕای «مەک کلەند» هەندێک لە کولتوورەکان کارئاسانی باشتر بۆ ڕاهێنانی ورەی سەرکەوتنخوازی دەکەن. ئەو دەڵێ لە پێش دەستپێکردنی قۆناغەکانی گەشە لە ئەورووپا سەرەتا شەپۆلێک لە ڕووداوە سەرکەوتنخوازییەکان لە کتێبەکانی منالان بلاو کرابوونەوە.

**ئاڵۆزبوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەگونجاندن لەگەڵ پاراستنی مانەوە:**

دەستەیەک لە تیۆرییەکان کە زۆرتر لەسەر "شیکردنەوەی سیستەمی" و "شیکردنەوەی کارکردی" کاریان کردووە، لەگەڵ بۆچوونەکانی "ماکس ڤێبر"، «ئێمیل دورکیم»، «هێربێرت سپەنسەر» و«نیل سملسر» پێوەندییان هەیە. ئێمە لە درێژەی باسەکەدا لە بابەت تیۆرییەکانی هەرکام لەو بیرمەندانە دەدوێین. «تالکۆت پارسۆنز» کۆمەڵناسی ناوداری ئەمریکی بە نیگا لە تیۆرییەکانی بیرمەندانی ناوبراو "تیۆریی سیستەمی" پێکهێنا و خستییە نێو کۆمەڵناسیەوە. کەسانێکی وەکو «گابریەل ئالمۆند»، «بیگهام پائۆل»، «سیدنی وێربا» و «لۆسین پای» کارەکانی پارسۆنزیان درێژە پێدا و پوختیان کردەوە (هەڵبەت هەرکام نوێ کاری تایبەت بە خۆیان هەیە. ) تیۆرییە سیستەمییەکان لە هەمان کاتدا لە بۆچوونی ئۆرگانێک و سایبرنتیک کەڵکیان وەرگرتووە.

لە شیکردنەوەی سیستەمیدا کۆمەڵگە وەکو سیستەمێک دەخرێتە بەرچاو کەوا لە زنجیرەیەک ئەندام یان بنەمای هاوپێوەند دروستبوون، هەرکام لەو ئەندامانە ئەرکێکی تایبەت بە خۆیان هەیە کە لەگەڵ پاراستنی سیستەم و کاری ئەو لە چوارچێوەدا گونجاون. تایبەتیبوونی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژی کاری ئەم ئەندامانە و جیاکاری بنەماکان لە یەکتر جگە لە کاریگەریی بەرانبەری ئەوان، سەرچاوەی گەشەی زۆرتر و زۆرتر بۆ سیستەمە.

تیۆرییگەلی دامەزراو لە سەر شیکردنەوەی سیستەمی بە دوو دەستەی سەرەکی دابەش دەکرێن: یەکەم تیۆرییگەلێک کەوا مۆدێلی خۆیان لە سیستەمە میکانیکییەکان وەردەگرن و دووەم تیۆرییگەلێک کەوا مۆدێلی خۆیان لە سیستەمە ئۆرگانیکییەکان وەردەگرن. «سپەنسەر» لە پێشڕەوانی ئەم بۆچوونەی دوایی بوو. «سپەنسەر» کۆمەڵگە وەکو پەیکەرێکی زیندوو دادەنێ کەوا لە ڕەوشی یەکێتی جیا نەکراوە بەرەو بنەما جیاکراوەکان دەچێتە پێشەوە. لەو پەیکەرانە لە لایەکەوە ئەندامەکان زۆرتر لە جاران تایبەتی دەبنەوە و لە لایکی ترەوە لە هەمان کاتدا پێوەندیی و گرێدراوییان زۆرتر دەبێت. کەوایە کۆمەڵگە لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕ لە بنەما و ئەرکە ڕێکخراوە بنەڕەتیەکانی خۆیەوە بەرەو پێشکەوتن و سەرپاکی دەروا.(١٠) هەر وەکو بوونەوەرێکی زیندوو کە لەگەڵ تایبەتیبوونی ئەندامەکانی، بەرەو سەرپاکی و پێشکەوتن هەنگاو دەنێ.

لە تیۆریی «دورکیم» بەتایبەت لە تیۆریی "دابەشکاریی کار"، شوێنەواری گرینگ لە کارکردگەرایی دەبیندرێ. بەپێی تیۆریی دورکیم دەزگا کۆمەڵایەتییەکان، بۆ وڵامدانەوە بە پێداویستیە کۆمەڵایەتییەکان بوونیان هەیە. دورکیم بنەما کۆمەڵایەتییەکان نە تەنیا بە سەرنجدان لەسەر هۆیەکانی ئەوان ڕاڤە دەکا، بەڵکو هەوڵ دەدا کارکردی ئەوان لە پێکهێنانی هارمۆنی و هاوپێوەندیی گشتی نیشان بدات.

لەگەڵ ئەوەشدا کارکردگەرایی بە پێناسەیەکی ئاشکراتر لە جاران سەرەتا لە مرۆڤناسی کۆمەڵایەتییەوە گەشەی سەند. «ڕادێلف بڕاون» و «برانیسلاف مالینوفسکی» دوو کەس لە مرۆڤناسە لێهاتووەکان لە کاتی خوێندنەوە لەسەر کۆمەڵگە ڕەسەنەکان جەختیان لەسەر ئەم خاڵە کرد کەوا بە چ شێوەیەک نەریت و دەزگا کۆمەڵایەتییە سەرەتاییەکان وەکو ئەندامگەلی پێکهاتەیەکی گشتی لە خزمەت ئەو پێکهاتە گشتییە دان و وێڕای ئەوەی کە لەگەڵ یەکتر پێوەندییان هەیە، بە گشتی یارمەتی بە پێوەندیی نێوان هاوسەنگی گشتەکی لەگەڵ چوارچێوە دەکەن. «پارسۆنز» کە دواتر بە

تێروتەسەلی باسی دەکەین، هەوڵێکی یەکجار زۆری دا تا توانی شیکردنەوەی سیستەمی بە ئاستێکی بەرز لە پێشکەوتن بگەیەنێ، ئەو تیۆرییەکی پوختەتری لەبابەت کۆمەڵگە وەکو "گشتێکی سیستەمی" پێشکەش کرد. ئەو توانی ئەو تیۆرییانەی کەوا لەسەر بنەڕەتی "ئەزمونگەرایی" دامەزرابوون و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەکو ڕەوتێکی سەرەکیی هەنووکە بوونی هەبوو بەرەو دواوە بگەڕێنێتەوە و "تیۆریی سیستەمی" وەکو تیۆریی سەرەکیی کۆمەڵناسی و خوێندنەوە سیاسییەکان جێ بخات. «دەیوید ئیستون» بیرمەندێکی دیکەی ئەمریکی، پەرەی بە شیکردنەوەی سیستەمی لە خوێندنەوە سیاسیەکان دا. «ئالمۆند» یەکێکی تر لە قوتابیانی ڕێبازی «پارسۆنز» لە کتێبی «سیاسەتی بەراورد کردن و ستراتیژی گەشە» کە بە هاوکاری «بینگهام پائۆل» نووسی، "نوێسازیی سیاسی" بە پێی پلەی جیاکاری بنەمایی و تایبەتمەندی کارکردی خستەبەر باس و لێکۆڵینەوە. لە سیستەمێکی سیاسی گەشەسەندوو هەر بنەمایەک بۆ ئەرکێکی تایبەت تەرخان کراوە. لە سیستەمی مۆدێڕن، سیاسەت لایەنی عەقڵانی بە خۆیەوە گرتووە کە لە تایبەتمەندیەکانی ئەو تایبەتیبوونی، گشتی ڕوانین و کارامەبوونە. لە شێوازی نەریتی بە جێگەی تایبەتیبوونی، شێواوی لە ڕۆڵ و ئەرکەکان و بە جێگەی گشتی ڕوانین و شایستە و شایان تەوەرەیی دامەزراندن بە شێوەی (عەشیرەیی، قەومی، ئایینی) جێگەی بنەڕەتی هەیە. «ئالمۆند» و «پاول» لەکارەکانی دواتریان چوارچێوەیەکی چەمکی نوێیان پێشکەش کرد کەوا بە پێی بانگەشەی ئەوان ئاشکرای دەکرد کە چۆن گەشەی سیاسی لەو شتەی کەوا سیستەمی سیاسی لە کردەوەدا بەڕێوەی دەبا، دەنگدانەوەی دەبێ. مەبەستی ئەوان ئاماژەکردن بە تواناکانی سیستەمە مۆدێڕنەکان بە گوێرەی خوارەوە بوو:

١- توانایی دەرهێنان: توانایی سیستەم بۆ دەرهێنانی سەرچاوە ماددی و مرۆڤییەکان لە چوارچێوەدا،

٢- توانایی یاسادانان: توانایی سیستەم لە کۆنترۆڵکردنی کرداری تاک و گرووپەکان،

٣- توانایی دابەشکاری: توانایی سیستەم لە دابەشکردنی کەلوپەل، خزمەتگوزاری، مووچەی خانەنشینی، پلە و کەرەسەکانی دیکەی کۆمەڵگە،

٤- توانایی ئاسایی: توانایی سیستەم لە پیشاندانی هێما نەتەوەییەکان وەکو ئاڵا، نیشانە نەتەوەیییەکان،

٥- توانایی رێکخستن: توانایی سیستەم لە ڕێکخستنی پێوەندییی نێوان تێخروا (in put) و دەرهاتوو (out put).

ئەم توانایانە سیستەمی سیاسی بەهێز دەکات تا بتوانێ لەگەڵ چوارکێشەی بنەڕەتیی گەشەی سیاسی، کە بریتییە لە "دەوڵەتسازی"، "نەتەوەسازی"، "بەشدارییی سیاسی" و "دابەشکارییی یەکسان وێڕای کارامەبوونە" بەرنگار بێتەوە. کەوایە سیستەمی گەشەسەندوو سیستەمێکە کەوا بە هۆی جیاکردنەوەی بنەما و دەزگاکانی و هەروەها تایبەتیبوونی ئەرکەکانی، گەشەی بە تواناییەکانی داوە.

تیۆرییی کارکردگەرایی سیستەمیی «پارسۆنز» لە دوایین فۆرمی خۆیدا، مرۆڤ و کردەوەی مرۆڤ لە شیکردنەوەی خۆی وەلادەنێ و بە جێگەی ئەو بنەماکان، کارکردەکان و ڕۆڵەکان وەکو بکەر دادەنێ. ئەم بۆچوونە لەڕاستیدا، کۆمەڵگەی گەشەسەندووی ڕۆژئاوا وەکو نموونەیەکی شیکاری هەڵدەبژێرێ و لایەنێکی گشتی پێ دەبەخشێ. ئەم پەرەپێدانە دواتر کەوتە ژێر ڕەخنەوە و ئەزموونە مێژووییەکان هەڵەبوونی ئەویان سەلماند. «سی. ڕایت میلز» کارکردگەرایی پارسۆنزی وەکو نموونەیەک لە تیۆرییی گشتیی کۆمەڵایەتی ناوبرد کەوا بەها زاڵەکانی سەرمایەداری ئەمریکا ئاشکرا دەکات.

## پاشکۆبوون وەکو لەمپەری سەرەکیی گەشە:

زانایانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان نەیاندەتوانی ڕوانگەی مۆدێرنیستەکان کە لە ڕاستیدا فۆرمی خەیاڵاویان بە سیستەمە

گەشەسەندووەکانی ڕۆژئاوا دابوو، پەسەند بکەن. بەردەوامبوونی دواکەوتوویی وڵاتەکان بە هۆی کۆلۆنیالیزم، گەشبینی ساکارانەی تیۆرییە نوێسازییەکانی ئاشکرا کرد. لە نێوان زانایان و کاربەدەستە سیاسی و ئابوورییەکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان، تیۆرییە نوێیەکان هاتنە ئاراوە. لە ئەمریکای باشوور و لە ئاسیا کەسانێک سەریان هەڵدا کە لەگەڵ تیۆرییە مۆدێرنەکان دژایەتیان کرد و ڕێگەیەکی تریان بۆ شیکردنەوە و تیۆرییداڕژتن گرتەبەر. ئەو تیۆرییانە گریمانە گۆڕانکەرەکانی مۆدێرنیستەکانیان پەسەند نەدەکرد. زۆربەی ئەم تیۆرییانە کەم یا زۆر، حەزیان لە تیۆرییە مارکسییەکان بوو. هەندێک لەوان لە زانا لێهاتووە مارکسییەکانی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بوون. بە هەر حاڵ ڕەوتێک لە ئەندیشە و تیۆریی سەریهەڵدا کەوا کێشەی گەشە و گەشەنەسەندوویی گەڕاندبۆوە بۆ پاشکۆبوونی گرووپێک لە کۆمەڵگەکان بە گرووپێکی تر و ئەم بابەتەی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هۆی سەرەکی پاشکۆبوون کۆلۆنیالیزم و ئێمپریالیزمە کە یەکێک لە ڕووداوە مێژووییەکانی جیهانی ئێمەیە.

تیۆرییەکانی پێوەندییدار بە ڕەوتی هزری پاشکۆبوون لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ قۆناغێکی نوێیان لە گەشە بە خۆوە دی. ئەم ڕەوتە هزرییە لە نێوان زانایان و ڕۆشنبیران بەتایبەت ڕەوتە ڕادیکاڵەکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە خێرایی پەرەی سەند. ئەم ڕەوتە هزرییە لە قۆناغە یەک لەداوی یەکەکانی گەشەی خۆیدا دەستە و ڕەوتە جیاجیاکانی لەنێو خۆیدا پەروەردە کرد. وێڕای ئەوەش دەبێ بگوترێ کە بۆچوونی پاشکۆبوون چوارچێوەیەکی چەمکی یەکەی (واحد) نییە. لەنێو ئەم بۆچوونەدا چەند چوارچێوە دروست بووە کە خۆی بە شێوەی فورمگەلێکی نوێ جیا کراوەتەوە و گەشەی کردووە. بێ گومان لە نێوان شیکردنەوە نوێ مارکسییەکان و تیۆریی سیستەمیی جیهانی و بۆچوونی پاشکۆبوون خاڵی هاوبەشی زۆر هەیە، بەڵام هەر کام لەوانە خۆیان، چوارچێوەیەکی چەمکی

گرینگیان دروست کردووه کە ویڕای خاڵی هاوبەش، هەروەها خاڵی جیاوازی گرینگیشیان هەیە.

بەڕای بیرمەندانی "تیۆریی پاشکۆبوون" گرینگترین ناتەواویی تیۆرییەکانی پێشوو، لەوانە تیۆرییە نوێسازییەکان ئەوە بوو کەوا پاشکۆبوونی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە وڵاتە گەشەسەندووەکان لەبەرچاو ناگرن. ئەم پاشکۆبوونە کەوا لایەنی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە هەم بۆ وڵاتە پاشکۆکان و هەمیش بۆ وڵاتە خاوەن دەسەڵاتە ئیمپریالیزمەکان کێشەگەلی تایبەتی دروست کردووە.

پاشکۆبوونی بنەما ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە وڵاتە پێشکەوتووەکان، هۆی سەرەکیی دواکەوتوویی ئەو وڵاتانە لە بوارە جیاجیاکانە. بە پێی ئەم روانگەیە پێوەندیی پاشکۆبوون بە درێژایی سەدەی کۆلۆنیالیزم و سەدەی ئیمپریالیزم، تۆڕێکی تێکچنراو لە پێوەندیی نێوان ئەم دوو دەستە وڵاتەی پێکهێنابوو کە یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی بنەڕەتی ئەوان جێگۆڕکێی ڕێکوپێکی زێدەبایی ئابووری لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بۆ وڵاتە گەشەسەندووەکان بوو. بە پێی بانگەشەی تیۆرییداڕێژانی پاشکۆبوون بەشی هەرەزۆری "کەڵەکەکردنی سەرمایە"ی وڵاتە نێوەندەکان لەڕێگەی چوونە دەرەوەی زێدەی ئابووری لە وڵاتە کەمەرەکان جێبەجێ دەکرێ. پاشکۆبوون بە مانای هاوردەکردنی کەلوپەلە دروستکراوە پیشەسازییەکان و هەناردەکردنی ماددە سروشتییەکان بوو؛ جگەلەوە ئەم چەشنە پێوەندییە لەمپەرێکی بۆ گەشەی پیشەسازی وڵاتە پاشکۆکان دروست کردبوو. لەوەش زیاتر، نرخی کەلوپەلە دروستکراوەکان هەمیشە ڕوو لە زیادبوون و نرخی ماددە سروشتیەکان هەموو کات ڕوو لە کەمبوون بووە. ئێستا ئەم چەشنە پاشکۆبوونە یانی بەرهەمهێنانی ماددە سروشتییەکان لە لایەن وڵاتە پاشکۆکان و بەرهەمهێنانی کەلوپەلە دروستکراوە پیشەسازییەکان لە وڵاتە ئێمپریالیزمەکان گۆڕاوە و وڵاتە پاشکۆکان لەبوارە جیاجیاکان خەریکی

بەرهەمهێنانی کەلوپەلە دروستکراوە پیشەسازییەکانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیسان پاوەنی بەرهەمهێنان لە کەلوپەلە پیشەییەکان لە هەندێک بواردا لە دەست وڵاتە ئێمپریالیزمەکان دایە و ئەمڕۆکە تەنانەت بە ئامێری سیاسی و چەکداری لەو پاوەنە بەرگری دەکەن.

لە ئاستی بنەما سیاسییەکاندا، دەوڵەتەکانی وڵاتە پاشکۆکان لە بنەڕەتدا وەکو ئامێری پاراستن و پەرەپێدان بە پێوەندییە پاشکۆکانن. ئەم دەوڵەتانە کە گیرۆدەی قەیرانی کەڵەکەکردنن و لە جەماوەری خۆیان دوورن جگە لە شێوەی زۆرداری بە شێوەیەکی دیکە ناتوانن دەسەڵاتدارێتی بکەن. حکوومەتەکانی ئەم وڵاتانە لە ڕاستیدا ئامێرێکن بۆ خزمەتکردنی سەرمایەداری پاوەنخواز. بە پێی ئەم ڕەوتە هزرییە، گەشەی وڵاتە پاشکۆکان ئەگەری نییە مەگەر لە ڕێگەی شۆڕشێکی سوسیالیستی جیهانی.

### پاشکۆبوون بەدەربڕینی نوێ مارکسیستی:

دەستەیەک لە ڕەوتە هزرییەکانی پاشکۆبوون، لەگەڵ چەشنێک شیکردنەوەی تایبەتی پێوەندییان دروست کردووە کە چەشنی نوێی مارکسیستی دەژمێردرێ. لە مارکسیستی کلاسیکدا ئازادیی سیاسی لەگەڵ سوسیالیزم پێوەندیی ئۆرگانیکی هەیە. تەنیا دیمۆکراسی سوسیالیستییە کە ئازادی تا کۆتایی لۆژیکی ئەو یانی سڕینەوەی بەهرەکێشانەوەی تاک لە تاک پێش دەخات. «مارکس» جەختی لەسەر سوسیالیزم بوو و لە بابەت ئازادییە سیاسییەکان لە بورژوازی و دیمۆکراسی بورژوایی و هەروەها لە بابەت ڕۆڵی کۆلۆنیالیزم لە گۆڕانکاری وڵاتە ژێردەستەکان بابەتی زۆری لە خۆی بەجێ نەهێشتووە. ئەم بابەتە بۆتە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان لایەنگرانی ئەو لە سەر کێشە باسکراوەکان. ئەم ناکۆکییە تا ڕادەیەک پەرەی سەند کەوا گرووپێک لە مارکسیستەکان کۆلۆنیالیزمیان تەنیا هۆکاری دەربازبوونی نەتەوە ژێردەستەکان لە دەست سیستەمە دواکەوتووە ئاسیاییەکان و دەوڵەتە زۆردارەکانی ڕۆژهەڵات دەزانی. گرووپێکی تر، ڕێک

له بەرامبەر دەستەی یەکەمدا، کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزمیان بە هۆکاری بنەڕەتی دواکەوتوویی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان دەزانی. ئەم دەستەیە لە ڕاستیدا "تیۆریی پاشکۆبوون" بەو واتایە کەوا لە باسەکەی پێشوودا گوترا، پێشکەش دەکەن.

بیروباوەڕی نوێ مارکسیستی لە نێوان ئەم دوو دەستە زیادەڕۆیەدا جێ دەگرێ. نوێ مارکسیستەکان هەم باسی شوێنەواری گۆڕانکاری کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم لە فۆرمی ئەڕێنی و هەم شوێنەواری خەسارهێنەری ئەوان دەکەن. ئەوان نایانهەوێ بابەتەکە ساکار کەنەوە. دەربڕینی زیادەڕۆیانەی "تیۆریی پاشکۆبوون"، چینی دەسەڵاتدار لە وڵاتە پاشکۆکان وەکو "سەرمایەداری پاشکۆ" چاو لێ دەکات کە لە ڕاستیدا سێبەرێک لە بورژوازی دەسەڵاتداری وڵاتە زۆردارەکانە و هیچ پێناسەیەکی لە خۆی نییە. بەڵام "نوێ مارکسیستەکان" دەڵێن لە وڵاتە پاشکۆکان ناتوانین قسە لە هێژمۆنی بورژوازی بکەین. سەرمایەداری لەنێو وڵاتە زۆردارەکاندا هێژمونی هەیە، بەڵام لە وڵاتە ژێردەستەکان هێژمۆنی نییە، کەوایە نابێ ڕۆڵی "وردە سەرمایەدرای" و "خاوەن زەوییەکان" لە چالاکیە سیاسییەکان لە بیر کەین. وردە سەرمایەداری لە پانتایی ئابووری و بازرگانی و لەنێو چینە مامنێوەندیە شارییەکاندا ڕۆڵی باش دەگێڕێ. بۆیە ناتوانین دەوڵەتەکان، چینی دەسەڵاتدار و گۆڕانکارییە سیاسییەکانی وڵاتە پاشکۆکان ساکار کەینەوە و بە وشەی "بورژوازی پاشکۆ" دەریبڕین. جگە لەوە ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیمۆکراتیک لە وڵاتە پاشکۆکان وەستاو یان کەم بەها نابێ. سەقامگیربوونی وەها دەوڵەتێک هەنگاوێک بەرەو سەقامگیربوونی دیمۆکراسی سوسیالیستییە.

## گەشە و سیستەمی جیهانی:

«ئیمانۆئێل والرشتاین» تیۆرییەکی نوێی پێشکەش کرد و بەم چەشنە ئامێرێکی شیکردنەوەی باشتری بۆ لێکۆڵینەوە لەمەڕ کێشە جیهانییەکانی

ئێمە پێک هێنا. ئەم تیۆرییە بە تیۆریی "سیستەمی جیهانی" ناوبانگی دەرکرد و بە گشتی جیهانی وەکو سیستەمێکی یەکە کە خاوەن پێکهاتەیەکی هیرارشییە خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەم هیرارشییە بریتییە لە وڵاتانی "نێوەند"، "کەمەرە نێوەند" و "کەمەرە کەمەرە". وڵاتە "نێوەندەکان" بریتین لە وڵاتە پلە یەکەکانی پیشەسازی. ئەم وڵاتانە هەموکات بەرزترین ئاستی تەکنولۆجی بە خۆیان تەرخان دەدەن. ئەمڕۆکە ئەم تەکنۆلۆجییە بریتییە لە پیشەسازییە پێشکەوتوو و تێکچنراوەکانی زانیاریەکان. وڵاتانی "کەمەرە نێوەند" لە ئاستێکی نزمتردان. ئەم وڵاتانە لە بەراورد لەگەڵ وڵاتە نێوەندەکان جۆرێک پێوەندیی پاشکۆبوونیان هەیە. وڵاتە "کەمەرە کەمەرەکان" لە ئاستێکی نزمتردا جێ دەگرن کە لە بەراورد لەگەڵ هەر دوو ئاستی بەرزتر، لە دۆخێکی پاشکۆبوون جێگیر بوون. هەر کام لەم سێ ئاستەی سیستەمی جیهانی یەکە، ئەرکە تایبەتییەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

نەسکەکانی ئەم کتێبە بەپێی ئەم چوارچێوە شیکارییەی سەرەوە پێک هاتووە. لەوێدا سەبارەت بە کێشەگەلێک کەوا لێرەدا ئاماژەمان پێکرد، زیاتر دەدوێین. سەرەتا لە نەسکێکدا باس لە تیۆرییە کلاسیکەکانی گەشە دەکەین.

## پەراوێزەکان:


1- Alan Swingwrod ،*A Short History of Sociological Thought* ،NY ، Mac Millan , 1991,p. 153.

٢- احمد ساعی، ***«مسایل سیاسی – اقتصادی جهان سوم»***، تهران : انتشارات سمت، 1376، صص 192-190

٣- حسین بشیریه. ***« تاریخ اندیشه‌ها و جنبش های سیاسی در قرن بیستم»***، قسمت شانزدهم، اطلاعات سیاسی- اقتصادی، شماره 90-89، صص 21-17

٤- ***هەمان سەرچاوە***

٥- ***هەمان سەرچاوە***

6- Poul Baran , ***Politische okonomi des wirtchaftlichen wachstums*** , Neu wied Berlin 1966, S. 452.

7- Poul Baran and poul M. Sweezy, ***Monopolkapital***, Frankfurs a. M. ,1973,S. 205.

٨- حۆسەین بەشیریە، ***هەمان سەرچاوە***، بەشی حەڤدەیەم، ژمارە ٩٢-٩١، لا ٢٣-١٨.

٩- ئەحمەد ساعی، ***هەمان سەرچاوە***، نەسکی یەکەم، لا ٢٦-٢١.

١٠- ***هەرمان سەرچاوە***

١١- ***هەمان سەرچاوە***

# گەشەسەندن و جیهانی سێیەم

زیاتر لە سی ساڵە کە وێژەی گەشە و گەشەنەسەندوویی مێشکی بیرمەندان، لێکۆڵەران و خوێندکارانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە. لێکۆڵەرەوەکان لەگەڵ هەزاران کتێب و نامیلکەی جیاواز و زۆر جار ناکۆک لەو بابەتەوە ڕووبەڕوو بوونەتەوە. هەر کام لەوانە نوێنەرایەتیی دەیان هەڵوێست و ڕوانگەی هزری دیکەن. زاڵبوون بەسەر ئەم وێژەیەدا پێویستی بە تێگەیشتن لە چەمکە سەرەکییە دیاریکراوەکان وەکو "سەرمایەداری"، "سوسیالیزم"، " دەوڵەت"، "چین"، "کەڵەکەکردن"، "دیسان بەرهەمهێنانەوەی سەرمایە"، "گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی" هەیە و دەبێ بە شێوەی سەربەخۆ لە بابەت هەر کام لەوانەوە قسە بکەین. زۆربەی تەفسیرەکانی گەشە و گەشەنەسەندوویی بە شێوەیەکی بێ ڕێسا و بە فۆڕمە جیاجیاکانەوە لە وشەی «جیهانی سێیەم» کەڵک وەردەگرن. بۆیە پێویستە سەرەتا باسێکی ورد لەسەر ئەو وشەیە بکەین. بێ شک هەر چەشنە تێگەیشتنێک لەمەڕ چەمکە سەرەکییەکانی پێوەندییدار بە گەشە و گەشەنەسەندوویی پێویستی بە پێناسەیەکی ورد لە سەر وشەی «جیهانی سێهەم» هەیە.

### مەتەڵی جیهانی سێیەم ؟

جیاوازی و فەرەیی پێناسەکانی «جیهانی سێیەم» ڕەنگە ئەو گومانە بخاتە زەینەوە کە ئەو چەمکە لە لایەنی شیکردنەوە یان بیرکردنەوە هێندە بە سوود نەبێ. لە تێگەیشتنی زاڵ لە سەر وشەی «جیهانی سێیەم» ڕەهەندی "جێگەیی" گرینگییەکی تایبەتی هەیە. ئەو وشەیە بۆ شوێنە جوگرافییە تایبەتەکانی وەکو وڵاتانی ئاسیایی، ئەفریقایی و ئامریکای باشوور بە کار

دێ. زۆربەی ئەو وڵاتانە لە پاش شەڕی جیهانیی دووەمەوە سەربەخۆ بوون و پاشان هەوڵێکی زۆر لە دیپلۆماسی نێونەتەوەیی دەستی پێکرد بە مەبەستی جیاکردنەوەی ئەو وڵاتانە لە وڵاتانی جیهانی یەکەمی سەمایەداری و یان جیهانی دووەمی سوسیالیستی. لەم جیاکردنەوەدا پێوەری هەڵسەنگاندن، بوونی توێژی هەژار لەو وڵاتانەدا بوو و لە کردەوەدا بووە هۆی بەها نەدان بە دەوڵەمەندەکان و چینە خۆشگوزەرانەکانی وڵاتە هەژارەکان. بە پێی ئەم بنەمایە وڵاتی ڤێنزۆڤێلا لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ وڵاتانی دیکەی ئەمریکای باشوور بە هۆی زۆربونی داهاتی سەرانە (هەرکەسی) وەکو وڵاتێکی «لە حاڵی دەرچوون» لە بازنەی دواکەوتوویی دێتە ئەژمار. ناتەواویی ئەو پێوەرە کاتێک دەردەکەوێ کەوا بە پشکنینی ورد لەسەر هەژاری و دەوڵەمەندی لە وڵاتی وێنوزوئێلا تێبگەین کەوا سەرەتا هەژاری لەم وڵاتەدا دیاردەیەکی بەربڵاوی هەیە. دووەم، سامانەکانی ئەم وڵاتە لە دەستی چینێکی دەسەڵاتداری بچووکدایە کە زۆربوونی سامانی ئەوانیش زۆرجار بە هۆی زۆربوونی لەناکاوی نرخی نەوت (پترۆل) بووە. نموونەیەکی دیکە کووبایە کەوا دەتوانێ بنەمای ئەم بۆچوونە بخاتە ژێر پرسیارەوە. وڵاتی کووبا ئاسایانە بە هۆی نزمبوونی داهاتی سەرانە و ئاستی ژیانی ماددی لە بازنەی وڵاتانی جیهانیی سێیەمدایە. بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە لەو وڵاتەدا هەژاری بوونی نییە. لە تێگەیشتنی جێگەیی لە جیهانی سێیەم، ئەم وردەکاریانە زۆر جار لە بەرچاو ناگیردرێ. وڵاتی ڤێنزۆڤێلا داهاتی سەرانەی زۆری هەیە و زۆربەی جەماوەری ئەم وڵاتە هەژاران، لە حاڵێکدا کووبا داهاتی سەرانەی کەمی هەیە، بەڵام ئەو وڵاتە هەژاریی تێدا نییە. لە هەر پێناسەیەک لە وشەی «جیهانی سێیەم» کە بمانەوێ وڵاتەکان لەنێو یەک دەستەبەندیی گەورەدا جێ بکاتەوە، پێویستە ئەو وردەکاریانە بخەینە بەرچاو. سەرنجدان بە ڕواڵەتی وشەی جیهانی سێیەم تووشی هەڵەمان دەکات. بۆ وێنە گرینگییەک بە تاکە هەژارەکانی بەڕەگەز ئیسپانیایی یا ڕەش پێستەکانی ئەمریکا نادرێ. بە واتایەک، دەتوانین بڵێین ئەوانە

گرووپبەندییە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی سێیەمن، کە لە دڵی وڵاتە جیهانی یەکەمەکاندان و تێگەیشتنی جێگەیی لە جیهانی سێیەم، ئەوان لە بیر دەباتەوە. لە سەر ئەم بنەڕەتە من تێگەیشتنێکی دیکە لەسەر جیهانی سێیەم هەڵدەبژێرم کەوا، جەخت لەسەر چەوساندنەوە و دەستدرێژی، نەبوونی تێکنۆلۆجی و گەشە، گەشەنەسەندوویی بە هۆی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم، پاشکۆبوون بە سیستەمی سەرمایەداریی زاڵ و کاریگەری بیانی دەکات و گرینگ نییە ئەم دۆخە لە چ جێگەیەکی جیهاندا بێت، چ لەنێو وڵاتانی ناسراو بە جیهانی یەکەم یان لە هەر جێگەیەکی دیکە.

«لسلی ولف فیلیپس» وشەی جیهانی سێیەمی گەڕاندۆتەوە بۆ مێژووناسی ئابووریی فەڕەنسی «ئالفرێد سووی» کە لە ساڵی ١٩٥١ لە گەرمەی شەڕی سارد، بە مەبەستی جیاکردنەوەی *وڵاتانی لە حاڵی گەشە* کەوا لە دەرەوەی دوو بلوکی دەسەڵاتدار بوون لەم وشەیە کەڵکی وەردەگرت. لە فەڕەنسای ساڵەکانی ١٩٤٧تا ١٩٤٩ دوو وشەی «جیهانی سێیەم» و «مەڵبەندی سێیەم» بە شێوەیەکی ئاشکرا لە جیات یەکتر کەڵکیان لێ وەردەگیرا. «پیتر وڕسلی» هەر ئەو کات لە ئاوریلی ١٩٤٩ ئاماژەی بەوە کردووە کە »کلود بوردێ» لەو وشەیە کەڵکی وەرگرتووە، ئەوە لە حاڵێکدایە کە »جۆزێف لاو» نارەزایەتی دەربڕیوە و سەرچاوەی ئەم وشەیەی بۆ دەربڕینی «دۆخی سێیەم»ی «جوآن پرون» لە ساڵی ١٩٤٩ و کەڵکوەرگرتنی گشتی لەو وشەیە لەپاش کۆنفڕانسی ئەفریقایی ـ ئاسیایی باندۆنگ لە ساڵی ١٩٥٥ گەڕاندۆتەوە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروەها «کۆمیتەی خوێندنەوەکانی سیاسەتی بەراوردکردن» و «گرووپی پشکنینەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان» دەستیان بە خوێندنەوەی چالاکییەکان و دەزگا سیاسییەکانی جیهانی سێیەم لە کۆتایی دەیەی ١٩٥٠دا کرد.

هەندێک پێشنیار لە لایەن ڕێبەرانی جیهانی سێیەم بۆ چاکسازیی ئەم وشەیە کراوە. ڕێبەرانی ئەفریقی وەکو «قەوام نەکرومە «، جیهانی سێیەمیان بە مانای پابەندنەبوون بە سیاسەتە بلۆکییەکانی زلهێزەکان بەکارهێناوە کە

جیا لە جەمسەرە جیهانییەکان، وەکو بلۆکێک لە ململانێی شەڕی سارد لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بۆ ئاشتی لایەنەکان هەوڵی داوە. (١)

«نەکرومە» ئاماژە بە »فرانتس فانون» لە کتێبی «دۆزەخییەکانی سەر زەوی» (١٩٦٣) دەکات و لەو کتێبەدا نووسیویەتی، مرۆڤی جیهانی سێیەم، چەوساندنەوەی سەرمایەداری وەکو دوژمنی خۆی دەزانێ و حەزی لە ڕێگەی ناسەرمایەدارییە.

نەکرومە لە سەر ئەم باوەڕە بوو کەوا ئەم ڕێگەیە بە واتای هەڵاتن لە شەڕی نێوان دوو جیهانی سەمایەداری و سوسیالیزم نییە:

***ململانێی جیهانی و سەرچاوەی گرژی لە جیهاندا نابێ لە بواری سیاسیی کۆنی شەڕی سارد؛ یانی دەوڵەت - نەتەوەکانی بلۆکە دەسەڵاتدارەکان بزانین، بەڵکو ئەم ململانێ یە بە هۆی بوونی مرۆڤی شۆڕشگێڕ و دژ بە شۆڕشە. ئەمە ڕوانینێکە کە سنوورەکانی سەر زەوی دەبەزێنێ و هیچ کارێکی بە ڕەنگ یان نەژادەوە نییە. ئەوە شەڕێکی کۆتایی نەهاتووەی نێوان زوڵملێکراوان و زاڵمەکانە، لە نێوان ئەوانەی ڕێگەی سەرمایەداری درێژە پێدەدەن و ئەوانەی کە بە میتۆدە سوسیالیستییەکان پابەندن.*** (٢)

ئەو لە کۆتاییدا بەم ئەنجامە دەگات کەوا لە ڕاستیدا تەنیا دوو جیهان هەیە، یەکەم جیهانی شۆڕشگێڕی و سوسیالیستی و، دووەم جیهانی دژ بە شۆڕش و سەرمایەداری، وێڕای ڕووداوەکانی ئیمپڕیالیزمی، کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوەی ئەو. بۆیە وشەی جیهانی سێیەم «وشەیەکە کە زۆر جار بە هەڵە کەڵکی لێ وەردەگیردرێ و مانای هەموو شتێک و هیچ شتێک دەدات». جیهانی سێیەم لە سوسیالیزمی ڕاستەقینە جیا نابێتەوە، بەڵکو بە پاژی جیانەکراوەی ئەو دەژمێردرێ و باوەڕی بە شەڕ دژی سەرمایەدارییە بۆ کۆتاییهێنان بە چەوساندنەوەی جەماوەر. (٣)

«مائۆ تسێ دونگ» بە پێداچوونەوە لەسەر "تیۆریی سێ جیهان"، پۆلێنبەندییەکی دیکەی پێشکەش کرد کە لەوێدا نەتەوە یەکگرتووەکانی

ئەمریکا «ئێمپریالیزمی کاپیتالیزم» و یەکێتیی سۆڤییەتیی (پێشوو) «سوسیال ئێمپریالیزم» وەکو دوو زلهێز لە جیهانی یەکەم، ژاپۆن، ئەورووپا و کانادا لەگەڵ وڵاتەکانی خوازیاری پێداچوونەوە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە جیهانی دووەمدا و وڵاتە ئاسیاییەکان و سەرجەم وڵاتانی ئەفریقی و ئەمریکای لاتین لەنێو وڵاتە جیهان سێیەمەکان جێگیر کرابوون. بە بۆچوونی «مائۆ» پێوەندیی ئەو سێ جیهانە بە هۆی ئێمپریالیزم و هێژمۆنی ئەو دوو زلهێزە سنووردار کرابۆوە؛ جیهانی یەکەم، خەریکی چەوساندنەوە و فەرمانڕەوایی جیهانی سێیەمە. جیهانی دووەم، بە هۆی ئەوەی کە مەبەستی فەرمانڕەواییکردن بەسەر جیهانی سێیەمدایە، پەیڕەوی لە جیهانی یەکەم دەکات. بە ڕای «مائۆ» هێز، وەکو بنەمای ئەم جیاوازییە جیهانییە دەژمێردرێ. «مائۆ» یەکێتیی سۆڤییەت بە گەورەترین مەترسی ناو دەبا، کەوا بۆ لابردنی ئەم مەترسییە پێشنیار دەکات، نەتەوە یەکگرتووەکان، جیهانی دووەم و جیهانی سێیەم دەبێ بە ڕێکخستنی بەرەیەکی یەکگرتوو لە دژی سۆسیال ئێمپریالیزمی سۆڤییەت هەنگاو بنێن.[٤]

ڕێبەرانی ئاڵبانی کەوا سەردەمێک یەکێک لە هاوپەیمانە نێزیکەکانی چین لە بەرامبەر سۆڤییەت دەژمێردران، ڕەخنەگەلی زۆریان لەو بۆچوونەی «مائۆ» گرت. بەڕای ئەوان یەکەم ڕەخنە ئەوەیە، کەوا مەترسی نەتەوە یەکگرتووەکان بە هیچ چەشنێک کەمتر لە یەکێتیی سۆڤییەت نییە. دووەم ئەوەیە کەوا وڵاتە ئێمپریالیستەکانی جیهانی دووم ناتوانن ئاوا ڕۆڵێکی پێشکەوتووانە بە خۆوە بگرن و، سێیەم، شێوازی «مائۆ» دژایەتیی نێوان ئێمپریالیزم و سوسیالیزمی لە ئاستی جیهاندا و لە نێو بورژوازی و پرۆلتاریا لە وڵاتە سەرمایەدارییەکان پشتگوێ خستووە.

تا نێوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ لە کۆبوونەوە دیپلۆماتیکەکاندا ئاماژە بە چوار جیهانیش دەکرا: "جیهانی سەرمایەداری"، "جیهانی سوسیالیستی"، "جیهانی سێیەم" بریتی لەو وڵاتانەی بەرەو گەشەسەندن هەنگاو دەنێن و "جیهانی چوارەم" بریتی لە وڵاتە هەژار، لاواز، ژێردەستە و بێ بەشەکان.[٥]

«گرانت مەک کاڵ» لەسەر ئەم باوەڕە بوو کەوا، ***کەمایەتییەکانی نێو جیهانەکانی تر*** دەبێ لەنێو جیهانی چوارەمدا جێ بگرن و لەسەر ئەم بنەمایە دابەشکارییە پاژەییەکانی دیکە پێشکەش بکرێت. «ورسلی» دەڵێ، هەندێک لە نووسەران بۆ مەبەستە شیکارییەکانی خۆیان دەستیان داوەتە پێناسەکردنی جیهانی نوێ.

کەوایە شێوازە جیاجیاکان دەتوانن لە دەستەبەندیی زانیارییەکان و پۆلێنبەندیی وڵاتانی جیهان بە سوود و بەکەڵک بن. وێڕای ئەوەش، «شێوازەکان» ئامێری زەینی و خوڵقێنەرن کە هەر لێکۆڵەرێک بە پێی مەبەستە شیکارییەکانی خۆی ئەوان دادەڕێژێ. لێرەدا دەبێ بڵێین کە ئەو شێوازانە لە کۆتاییدا بۆ شیکردنەوەی جیهانی تێکچنراوی ئێمە سنوورگەلێکیان هەیە و دوورکەوتنەوە لەوان زۆر زەحمەتە.

**سەرمایەداری و سوسیالیزم : لایەنە جیاکەرەوەکان:**

لە کۆمەڵگە بێ چینایەتییە سەرەتاییەکان، سەرجەم تاکەکان لە بڕیارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و هەروەها پێوەندییی نێوان کۆمەڵگەی خۆیان لەگەڵ جیهانی دەرەوە بەشداریان هەبوو. ڕەوشی ژیان لەم کۆمەڵگە هاوبەشانەدا هەژارانە بوو و مرۆڤەکان بۆ مانەوەی خۆیان بەرنگاری هێزە سروشتییەکان دەبوونەوە. یەکێک لە سەرەتاییترین دابەشکارییەکانی سەردەمی کۆن لەگەڵ سەرهەڵدانی شارەکان و پیشەگەرە تایبەتیەکان پێکهات. ئەو پیشەگەرانە بە سازکردنی کەلوپەل توانیان بە شێوەی ئازاد و یەکسان ئەو بەرهەمانە لەگەڵ بەرهەمە پێویستەکانی خۆیان لە بازاڕ ئاڵوگۆڕ بکەن. دابەشکاریەکی دیکە لەگەڵ بەکارهێنانی پارە و سەرهەڵدانی دیاردەی سوودخۆری یان بازرگانی پێکهات و لە بازرگانی نێونەتەوەییدا پسپۆڕی بەدەس هێنابوو. سەرمایەداریی سەوداگەر یا « مێرکانتیلیزم » بەپێچەوانەی سەرمایەداریی پێشکەوتووتری پیشەسازی، وەکو فۆڕمی سەرەتایی سەرمایەداری دەژمێردرا و، هێماکانی ئەو بریتی بوون لە سازبوونی

پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە لەوێدا خاوەن سەرمایەکان، زێدەبایی ڕەهای کرێکارانیان بە خۆیان تەرخان دەدا. زاڵبوونی سەرمایەداری بازرگانی بە درێژایی سەدەی چواردە تا شانزدە، بە تایبەت لە ئەورووپای ڕۆژئاوا خۆی دەرخست. تایبەتمەندیی سەرمایەداری نوێ بریتی بوو لە: جیاکردنەوەی بەرهەمهێنەرەکان لە کەرەسەکانی بەرهەمهێنان، دروستبوونی چینێک بە ناوی "بورژوازی" کە خاوەنداری و بەڕێوەبەرایەتیی کەرەسە بەرهەمهێنەرەکانی بە دەستەوە گرت و سەرهەڵدانی چینێک بە ناوی پڕۆلتاریا کە تەنیا خاوەنی کاری خۆی بوو و بۆ پاراستنی ژیانی خۆی ناچار بوو کارەکەی بە خاوەندارانی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان بفرۆشێ.

سەرمایەداری تا کۆتایی سەدەی نۆزدە ئاسایانە لە ڕووی "پێشبڕکێی ئازاد" دیاری دەکرا، بەڵام هەر لەو کاتەدا تەکنۆلۆجی پیشەسازی نوێی پێکهێنا و سەرمایەدارەکان دەستیان بە سازکردنی کارتێل، تراست و کۆمپانیا هاوبەشەکان کرد. سەرمایەی ماڵی (سەرمایەی بانکی، کاریگەری دەخاتە سەر پیشەسازی و دەیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە) بوو بە هۆی کەمبوونەوەی سەرمایەداریی پێشبڕکێی ئازاد و ئەوەش زیادبوونی پاوەنەکانی بە دوواوە بوو. «لێنین» سەرمایەی ماڵی وەکو پێشکەوتووترین و دووایین فۆڕمی سەرمایەداری دەزانێ و ئەم قۆناغە بە »ئێمپریالیزم»ناو دەبا. تەوەرەی تیۆرییەکەی ئەو بریتییە لە زوومکردنی خێرای بەرهەمهێنان لە پاوەنە گەورەکانی پیشەسازی و هەناردەکردنی سەرمایە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆ بەشە کەمتر گەشەسەندووەکانی جیهان. «ئێرنێست ماندێل» (١٩٧٥) هەروەها سەردەمی ئێمپریالیزم بە دوو قۆناغی "ئێمپرایالیزمی کلاسیک"، لە کۆتایی سەدەی نۆزدە تا کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی و "ئێمپریالیزمی نوێ" دابەش دەکات. لە حاڵێکدا تایبەتمەندی قۆناغی کلاسیک پاوەنە، تایبەتمەندی قۆناغی ئێمپریالیزمی نوێ سەرهەڵدانی کۆمپانیا فرە نەتەوەییەکانە.

سوسیالیزم لە جیاتی خاوەنداریێتی تایبەتیی ئامێرە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان، و دەستبەسەرداگرتنی تاکەکەسی زێدەی کۆمەڵایەتی، (ئەو ڕادە لە بەرهەمهێنانی کرێکاران کە زیاتر لە پێداویستییەکانی بژیوی ئەوانە) دەربڕی خاوەنداریێتیی و دەستبەسەرداگرتنی گشتیی ئەوانە. لە سەردەمی جێگۆرکێی سەرمایەداری بۆ سوسیالیزم، هێشتا بەشێک لە پاشماوەکانی سەمایەداری بە ئاشکرابوونیان هەیە. وزەی کار بەردەوام بۆ وەرگرتنی مووچە دەفرۆشرێ، بەشێک لە زێدە وەکو خەڵاتێکی تاکەکەسی بە تاکەکان تەرخان دەدرێ و ئابووری پارەیی دەسەڵاتدارە. ئەو ئابوورییە نوێیە هەروەها دەتوانێ لە لایەن هۆکارە بیرۆکراتییەکان بەڕێوە بچێت کە پابەندبوونێکی سەبارەت بە پرەنسیپی بەشداریی سیاسی و ئابووریی گشتی جەماوەر نییە، و هەروەها دەتوانێ زیاتر لە سەر بنەڕەتی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان و نەک بەرژەوەندییە گشتییەکان جێگیر بووبێت. خۆلادان لە شێوە بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بۆ سوسیالیستی تەنیا بە زاڵبوونی ئەم بۆچوونانە ئاشکرا دەبێ. کەوایە، خەبات بۆ سوسیالیزم هەڵگری لابردنی دەوڵەتی سەرمایەداری و هێنانەجێی دەوڵەتی کرێکاری و دامەزراندنی دیمۆکراسی پرۆڵتاریایی لە جیات دیمۆکراسی بورژوازیە. دابینکردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی سەرجەم جەماوەر ئاسایانە لە ئابووریی بەرنامەڕێژکراودا وەکو پێویستییەکی لێهاتووە. کەڵک وەرگرتنی خولقێنەرانە لە کار و کاتە پشووکان و هەڵوەشاندنەوەی ئابووریی کالایی و پارەیی، نایەکسانی، چین و توێژەکان و دەوڵەت و هەستی لەخۆبیگانەبوون، لە ئامانجەکانی کۆمەڵگەی سوسیالیستییە. گەیشتن بەو ئامانجانە قۆناغێکی پێشکەوتووتری لە دووایە کە هەمان کۆمۆنیزمە.

**دەوڵەت و چین لە کۆمەڵگە ناکۆکەکان:**

«مارکس» و «ئێنگلس» لە "مانیفێستی کۆمۆنیست"دا ناڕاستەوخۆ دەڵێن، دەوڵەت ئامێری دەستی چینی دەسەڵاتدارە، بە واتایەکی تر، دەوڵەت

به گشتی، "شتێک جیا له کۆمیتەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری بورژوازی نییه".[٦] «لینین» هەروەها له کتێبی "دەوڵەت و شۆڕش"دا (١٩٣٢) دەڵێ، پۆلیس و سوپا، ئامێرەکانی هێزی دەوڵەتن و پرۆڵتاریا دەبێ تا نەمانی دەوڵەت دژی ئەو ڕاپەڕێ یان شۆڕش بکات.

ئەمڕۆکە لەبابەت دەوڵەتی سەرمایەداری ڕوانگەگەلی سوسیالیستی جیاجیا هەیە. له ڕوانگەی ئامێرگریمانەدا (ابزار انگارانه) کەوا لەکارەکانی بیرمەندی سیاسی ئینگلیس، «ڕاڵف میلیبەند» (١٩٦٩) بینراوە، به ئاشکرا جەخت له سەر ئەو باوەڕە دەکرێت کەوا دەوڵەت، ئامێری چینی دەسەڵاتدارە و له ژێر کاریگەریی و کۆنترۆڵی ئەودایە. تیۆرییی بنەماخوازی مارکسیستەکانی وەکو «نیکۆس پولانزاس» (١٩٧٣) هەروەها جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکات کەوا دەوڵەت له ڕێگەی بنەماکان یا دەزگاگەلێکی وەکو سوپا، پۆلیس و هێزی یاسا دەست به کۆکردنەوە و یەکپارچەکردنی بەرژەوەندییە بورژوازییەکان دەکات.[٧]

له بەرامبەر ئەم ڕوانگە سوسیالیستیانەدا، تێگەیشتنی تر لەسەر دەوڵەت له وێژەی هەنووکەیی زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان هەیە که لەوێدا دەوڵەت وەکو ***بازاری سیاسی*** داواکاری و بەرژەوەندییەکانی تاک و گرووپە ڕکەبەرەکان چاو لێدەکرێ. ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان وەکو، بنکە سیاسییەکان هەوڵ دەدەن بەرژەوەندی و حەزەکانی لایەنەکان دابین بکەن و له دەستێوەردانی لایەنگرانە به قازانجی لایەنێک خۆبپارێزن. لەم تێگەیشتنە زاڵەدا دەوڵەت زۆرجار بێ لایەنە.

بەڕای « مارکس »، سەرانسەری مێژوو، چیرۆکی شەڕی سەرمایەداریە و کۆمەڵگە له کۆتاییدا به دوو چینی سەرەکی بورژوازی و کرێکار دابەش دەبێت. بورژوازی لەنێو چینە بازرگانییەکان سەری هەڵداوە و له شارە بچوک و بڵاوەکانی سەدە نێوەڕاستەکانی دەرەبەگایەتی چالاکیان دەکرد و پاش ئەوەی که بەرهەمهێنانی کارگەیی یا "مانۆفاکتۆر" جێی بەرهەمهێنانی پیشەیی (سنفی) گرتەوە، چینی پیشەگەریش جێی وەستاکارە پیشەییەکانی

ئەو سەردەمەی گرتەوە. [8] لەگەڵ داهێنانی ماشێن، فرەوانبوونی بازرگان و سەرهەڵدانی بوررژوازیی نویَ کە کۆنترۆڵی لەسەر ئابووری و دەوڵەت هەبوو، پیشەسازیی نویَ بە خێرایی جێی کارگە سەرتاییەکانی گرتەوە. بورژوازیی نویَ وەکو چینی دەسەڵاتدار، خاوەن ئامێری بەرهەمهێنان بوو و لە بواری سیاسیدا توانی حوکمڕانی بە دەستەوە بگرێت. بە ڕای «مارکس» دەوڵەت لە سیستەمی سەرمایەداریدا خەریکی پاراستن و پتەوکردنی پێوەندییە خاوەندارییەکانی کەمایەتیەکی دەوڵەمەند دەبێت و بەم چەشنە پشتیوانی لە زوڵمی چینێک بە سەر چینێکی تر دەکات. بە ڕای ئەو دەوڵەتی بورژوازی هیچکات لە سەرەوەی چینەکان جیَ ناگریَ، بەڵکو بەردەوام لە خزمەت چینی دەسەڵاتدارە، کەوایە ئەو دەوڵەتە و چینی دەسەڵاتدار دەبیَ لەنێو بچن. «مارکس» بە دوای دۆخێکەوە بوو کە تێیدا دەوڵەت "وشک و سیس بێت".

بە پێچەوانەوە »ماکس ڤێبر» لەسەر ئەو باوەڕەیە کەوا سەرمایەداری لە جیهانی نویَ گرینگییەکی هەرە زۆری هەیە و بەڵگە دەخاتە ڕوو کەوا دەوڵەت دەتوانیَ بە شێوەی گشتی لە هێزی فیزیکی بۆ دروستکردنی سازگاری و ڕێکوپێکی لە نێوان بەرژەوەندییە جیاجیاکان کەڵک وەرگریَ. ئەو سیاسەت وەکو "پێشبرکیَ لەسەر دابەشکردنی هێز یان هەوڵدان بۆ کاریگەری خستنە سەر دابەشکاریی هێز لە نێوان دەوڵەت یان گرووپە نێوخۆکانی دەوڵەت» دەزانیَ.[9] بە واتایەکی تر، زاڵبوونی دەوڵەت جۆرێک لە بەرژەوەندییە جیاجیاکان بۆ کۆمەڵ گەرەنتی دەکات. دەوڵەت لە سیستەمی سەرمایەداریدا لە ڕێگەی دابەشکاریی عەقڵانیی ڕۆڵە ڕێکخراوەییەکانی نێو بیرۆکراسی، کارامەبوون و ڕێکوپێکی سەردەخا. ئەم تێگەیشتنە لە دەوڵەت ئەو ئیمکانەی بە »ڤێبر» دەدا کەوا تەنیا لە ڕوانگەیەکی ئابوورییەوە چاو لە چین بکات. بە ڕای «ڤێبر» چین کاتێک دروست دەبێت کە :

١) بەشێک لە جەماوەر لە بەشێکی تایبەت لە دەرفەتە ئەرێنییەکانی (ایجابی) ژیانی خۆیان لەگەڵ یەکتر بەشدار بن.

٢) ئەم بەشە تەنیا دەربڕی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی دەستکەوتوو لە خاوەندارێتیی کەلوپەل و دەرفەتەکانی بەدەستهێنانی دەرماڵە بێت.
٣) بارودۆخی بازاری کەلوپەل یان کار دەستنیشان بکات.

ئەو هەر چینێک وەکو گرووپێکی جیای پلەوپێگەیی دەبینێ کەوا بە پێی خاڵە جیاکەرەوەکانی بازاڕ سەبارەت بە یەکتر هیرارشی ساز دەکرد. لەگەڵ گۆڕانی داواکاری لە بازار، ڕەنگە ڕێکوپێکیی گرووپە پێگەییەکان تێک بچێت و یەکیان بەرەو سەرێ و ئەویتریان بەرەو خوارێ بڕاوت. بە پێی ئەم ڕوانینە سەبارەت بە چین، «ڤێبر» دەیتوانی ئاوا بەڵگە بێنێتەوە کەوا دۆخی چینایەتیی جیاجیا بوونیان هەیە و زانیاری چینایەتی بە ناچار چینی کرێکار ناکات بە هێزێکی شۆڕشگێر.

بە کورتی، بۆچوونێک جەخت لەسەر پێکدادان و بەرەنگاربوونەوەی چینەکان دەکات و ئەویتریان جەخت لەسەر سازگاربوونی بەرژەوەندییە چینایەتییەکانی جیاجیا دەکات. یەکیان لەسەر خاوەندارێتی و کۆنترۆڵکردنی ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان وەکو هۆی زاڵبوون و چەوساندنەوەی چینێک لە لایەن چینێکی ترەوە پێداگرێ دەکات، لە حاڵێکدا بۆچوونەکەی تر گرووپە جیاجیاکانی پلەیی لە پێشبرکێ بۆ بە دەستهێنانی هێز دەبینێ. یەکیان دەوڵەت بە لایەنگری چینی دەسەڵاتدار دەبینێ و ئەوی تریان دەوڵەت وەکو هێزێکی نێوبژیوان و هێورکەرەوە دەبینێ، کە ڕێکوپێکی و سەقامگیربوون لە نێوان گشت چین و گرووپەکاندا دابین دەکات.

ڕوانگەیەک کەوا جار لەگەڵ جار زیاتر لە لایەن بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەم پەسەند دەکرێت، ئەوەیە کە چینی دەسەڵاتدار بریتییە لە بورژوازییەکی زاڵ کەوا خاوەندارێتیی ئامێرە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری و هێزی سیاسی لە دەستدایە. پێویست نییە ئەم چینە یەکدەست و یەکپارچە بێ، بەڵکو دەتوانێ بەرژەوەندییە جیاجیاکان لەخۆ بگرێ کە بەرەو سازکردنی هاوپەیمانی و یەکپارچەبوون هەنگاو بنێ. چینی دەسەڵاتدار، چینێکی ئابوورییە کە لە باری سیاسییەوە دەسەڵاتیان لە

دەستدایە. پاوەنی هێز بە دەستی ئەو چینە، ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە سەرمایەداری و خاوەندارێتیی ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان هەیە و دەتوانێ لە ڕێگەی کۆنتڕۆڵکردنی دەزگا و دامەزراوە ماڵییەکان بەسەر ئابووریدا زاڵ بێت. چینی دەسەڵاتدار دەبێ لە پێوەندیی لەگەڵ چینەکانی دیکە بە گوێرەی خوارەوە شرۆڤە بکەین.

**١- جۆری خاوەندارێتی:**

خاوەندارێتی لە کۆنتڕۆڵی بورژوازی پاوەنی یا خاوەندارە سەرەکییەکانی سەرمایە بانکی و پیشەییەکاندایە کە لەوانەیە پشتبەستوو بە سەرمایەدارە بیانی و ئیمپریالیزمەکان بێت و زۆرجار خاوەندارێتی کارخانەکان، کۆمپانیا بیمەکان، بانکەکان و کۆمپانیا بازرگانییە گەورەکان، هەروەها لە کۆنتڕۆڵی ئەواندایە. بورژوازی پاوەنی هاوکات دەتوانێ بریتی لە خاوەن زەوییە گەورەکان بێت. جگە لەوە، بورژاوزی "نا پاوەنی" یا خاوەندارانی کۆمپانیا بازرگانییەکان و یا پیشە تایبەتەکان بوونیان هەیە کە هەندێک جار لەگەڵ بۆرژوازی پاوەنی و یا بورژوازی نێوخۆ شەریکن؛ ئەوانە خاوەندارانی دەزگا بازرگانی و پیشە بچووکەکان یا کۆمپانیا بچووک و مام نێوەندییەکانن کە لە لایەنی سیاسییەوە حەزیان لە نەتەوەپەروەرییە و هەندێک جار لەگەڵ بەرژەوەندی و حەزەکانی ئیمپریالیزم ناکۆکییان هەیە.

**٢- جۆری سەرمایە :**

لەم ڕووەوە دەتوانین ئاماژە بە چەند شێوە بۆرژوازی بکەین. "بۆرژوازیی زەوی" بەو دەستە زەویدارە مۆدێرنانە دەگوترێ کە زەویی خۆیان بە ماشێن بەڕێوە دەبەن و بە دانی کرێی کرێکار داهات بە دەست دێنن. هەروەها بورژوازیی زەوی لەخۆگری ئەو دەستە زەویدارە نەریتییانە دەبێ کە زەوییە کێڵراوە زۆرەکانیان لە کۆنتڕۆڵدایە و وێڕای بەسەربردنی ژیان لە شارەکان، لە بەرژەوەندی و داهاتەکانی مەزراکانیان قازانج

وەردەگرن. هەروەها دەتوانین ئاماژە بە »بورژوازیی کانزا» بکەین کە لەگەڵ بەدەستەوەبوونی کانزا گەورەکان، سەرمایە فرەوانەکانیان لە کۆنترۆڵدایە. جگە لەوەش، دەتوانین ئاماژە بە »بورژوازیی پیشەسازی و بازرگانی»بکەین کە خاوەندارییە گەورەکانی لەدەستدایە و هەندێک جار لەگەڵ بورژوازیی پاوەنی یا بیانی شەریک دەبێ و لە دواجار دەتوانین «بورژوازیی بانکی» ناو بەرین کە سەرمایە ماڵییەکانی لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی لە کۆنترۆڵ دایە.

### ٣- چەندی و چۆنیی سەرمایەی چینە کۆمەڵایەتییەکان:

به پێی ڕادەی سەرمایە دەتوانین چینە جیاجیاکان بناسین و لە یەکتر جیایان کەینەوە. بەم پێیە دەتوانین بورژاوزی بە سێ چەشنی "بۆرژوازیی گەورە"، "بۆرژوازیی مامنێوەند" و "بۆرژوازیی بچووک" دابەش بکەین. جگە لە بورژوازی، چینەکانی تر دەتوانین بە پێی ڕادەی سەرمایە و هەروەها پێوەندیی خاوەندارێتی دیاری بکەین:

- ***وردە بۆرژوازی*** :

ئەم وشەیە زۆرجار بۆ سەرمایەدارە بچووکەکان بە کار دێت کە بە شێوەی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ ئامێرە بەرهەمهێنەرەکانی خۆیان لە دەستدایە، بەڵام بە پێچەوانەی سەرمایەدارە گەورەکان خاوەنی سەرمایە نیین. وردە بورژوازی ڕەنگە لە هەوڵی بە دەستهێنانی سەرمایە بێت و هەروەها لەوانەیە خۆی لە ژێر زوڵمی بۆراژوازی ببینێ. بۆیە وردە بۆرژوازی دەتوانێ لە دوو بەش پێک هاتبێ، یەکەم: وەکو"خاوەنداران" یا "کرێچیەکانی" کۆمپانیا و کارگە بچووکە پیشەسازییەکان یا وەکو "خاوەندارانی پیشە سەربەخۆکان" (پارێزەر، هەندێک لە پزیشکەکان و مێعمارەکان، ئەندازیارەکان، ئەکتەرەکان، نووسەران، مامۆستایان یا ڕۆشنبیرەکان) لە شارەکان ژیان دەکەن یا دووەم : وەکو "خاوەندارە زەوییەکان" و "جوتیارە کرێچییەکان" و هتد لەناوچە لادێیەکان ژیان بکەن.

***- چینی مامنێوەندیی نوێ یان وردە بورژوازیی نوێ:***

ئەوانە هەندێک لە خاوەندارە پیشەییەکان، بیرۆکراتەکان و بەڕێوەبەرەکانن کە دەتوانن لەسەر سەرمایەدارەکان کاریگەری دابنێن، بەڵام خاوەن ئامێری بەرهەمهێنان نیین (وەکو کرێکاران).

***- پرۆڵتاریا یان چینی کرێکار:***

ئەوانە ئەو کرێکارانەن کەوا خاوەن ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان نیین و وزەی کاری خۆیان لەبری هەندێک پارە دەفرۆشن. ئەوان دەتوانن کرێکارە "شارییەکان لە پیشەسازییە پاوەنی و ناپاوەنی یا کرێکارانی پیشەسازییە تایبەتی یا گشتییەکان، بانکەکان و هتد، یا لەوانەیە کرێکارە "لادێیەکان" و وەرزێڕەکان بن کەوا لە بەرامبەر کارەکانیاندا مووچە وەردەگرن.

***- جووتیاران :***

جووتیاران یا وەرزێڕەکان بریتین لە کەسانێک کە خاوەن زەوی خۆیان نیین و وەکو سەردەمی پێش سەرمایەداری کار دەکەن. بۆ وێنە، کرێچییەکان و کرێکارە بنەماڵەکان کەوا مووچە وەرناگرن لەنێو ئەم چینەدا جێ دەگرن.

***- لۆمپەن پرۆڵتاریا :***

کەسانی بێ کارە و بەڕەڵا و هتد. (کەسانێک کەوا لە چینی خۆیان دابڕاون)

**کەڵەکەکردنی سەرەتایی و دیسان بەرهەمهێنانەوەی فرەوانی سەرمایە:**

بەرهەمهێنانی پێویست بۆ چارەسەری داواکارییە سەرەکییەکانی مرۆڤ، پێویستی بە کار هەیە. مرۆڤەکان پاش چارەسەرکردنی پێویستییەکانیان لە بوارەکانی خواردن، خواردنەوە، سەرپەنا، ئارامی و ئاسایش دەتوانن خەریکی چالاکییە ئابوورییەکانی دیکە بن کە ڕەنگە لە پاش خۆی، دابەشکاری کار، سەرهەڵدانی بەرهەمی زێدە و ڕێکخستنە چینایەتیەکانی کۆمەڵی لەدوا بێت. لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان و هەروەها لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان ئەم ئەگەرە هەیە کەوا چینێک بە کەڵکوەرگرتن و

چەوساندنەوەی چینێکی تر لە کاری بەرهەمهێنان دەست هەڵگرێ و خەریکی تەممەڵی بێت. کەڵەکەکردنی ئەو بەرهەمهێنانە زێدەیە دەتوانێ بۆ وەرگرتنی خاڵ و سەروەریی ماددی کەڵکی لێ وەربگیردرێ. بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگە هاوبەشە سەرەتاییەکاندا بریتییە لە کارێک کە بەشێوەی تێگڕایی بەڕێوە دەچێت و هەروەها خاوەندارێتی ئامێرە بەرهەمهێنە-رەکان لەوێدا بەشێوەی گشتییە. کەڵەکەکردنی سەرەتایی پڕۆسەیەکە کەوا بە هۆی بەرهەمهێنەرەکان (کرێکاران) لە ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان جیا دەکرێتەوە. بە وتەی «مارکس» ئەم کەڵەکەکردنە "سەرەتایی دێتە بەرچاو، چونکە قۆناغی پێش مێژوویی سەرمایە و شێوەی بەرهەمهێنانی هاوسەنگ لەگەڵ ئەو پێکدێنێ. " (١٠) کەوایە کەڵەکەکردنی سەرەتایی خاڵی دەستپێکردنی سەرمایەداری دەژمێردرێ.

کەڵەکەکردن لە فۆڕمی پێشکەوتوودا (و نەک سەرەتایی) کاتێک ڕوو دەدات کە سەرمایەدار کەلوپەلی خۆی دەفرۆشێ و پارەی بەدەستهاتوو لە فرۆشیی ئەوان دەکاتە سەرمایە. «مارکس» ئەم پڕۆسەیە بە سێ قۆناغ دابەش دەکات: لە قۆناغی یەکەمدا، پارە بۆ ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان و وزەی کار تەرخان دەکرێت. بە واتایەکی تر ماددە خاوەکان دەکڕدرێن و کرێکاران بۆ بەرهەمهێنان دادەمەزرێن. لە قۆناغی دووەمدا، ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان و وزەی کار بە کەلوپەلێک دەگۆڕدرێن کەوا بەهای ئەوان بریتییە لەو سەرمایەی کەوا بۆ ماددە خاوەکان و کار سەرمایەگوزاری کراوە، وێرای " بەهای زێدە "، واتە بەها زێدەیەک کە لە ئەنجامی بەرهەمهێنان سازبووە. لە قۆناغی سێیەم، ئەو کەلوپەلانە دەفرۆشرێت و پارەی بەرهەمهاتوو لە فرۆشی ئەوان هەمدیسانەوە دەبێتەوە بە سەرمایە. ئەم پڕۆسەیە، «سووڕانی خولەکی سەرمایە« ناو نراوە. سەرمایەدار ئەو بەشە لە کاری کرێکاران کە مووچەی پێ نەداوە وەکو بەهای زێدە بە خۆی تەرخان دەدات. ئەوە لە حاڵێکدایە کە دەبێ ئەو بەها زێدەیە ــ وەکو سوود، قازانج یان کرێ

ـ لەگەڵ سەرمایەدارەکان و زەویدارەکانی دیکە کەوا ڕەنگە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا دەستیان هەبێ، دابەش بکرێت. [١١]

بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، بە ناچار هەمدیسانەوە خۆی بەرهەم دێنێتەوە. «مارکس» دەڵێ: "ڕەوشی بەرهەمهێنان بە هەمان مێتۆد، هەمدیسانەوە بەرهەمهێنان ساز دەکات. هیچ کۆمەڵێک ناتوانی لە بەرهەمهێنان بەردەوام بێت، یا بەواتایەکی تر، هیچ کۆمەڵگەیەک ناتوانێ بە دیسان بەرهەمهێنانەوە خەریک بێت مەگەر بە شێوەی ڕێکوپێک بەشێک لە بەرهەمەکانی خۆی بە ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان یا ئەندامەکانی بەرهەمە نوێیەکان بگۆڕێتەوە. " [١٢] بەم شێوەیە سەرمایەداری دەبێ ئامێر و کەرەسەکان، مادده خاوەکان و پێداویستیەکانی دیکە هەمدیسانەوە بخاتە نێو پرۆسەی بەرهەمهێنان. هەڵبەت بەرهەمهێنان هەروەها دەبێ لە پێوەندیی لەگەڵ بەکارهێنان (مەسرەف) لێک بدرێتەوە. بۆ وێنە، کرێکار لە ڕێگەی بەرهەمهێنان، ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان (بۆ وێنە، ماددەی خاو کە دەچێتە نێو بەرهەمەکەوە) بە کار دێنێ. سەرمایەداریش بە دانی مووچە بە وزەی کار لە ماوەی بەرهەمهێناندا، لە کاری کرێکار کەڵک وەردەگرێ. کرێکاریش هەروەها مووچەی خۆی بۆ پێداویستییەکانی، واتە خواردن و سەرپەنا و بژیوی خۆی تەرخان دەکات. «مارکس» بە پێچەوانەی بیرمەندانی پێش خۆی، چالاکییە ئابوورییەکانی وەک بەکارهێنان و بەرهەمهێنان جیا لە یەک چاو لێ ناکات، بەڵکو بە شێوەیەکی دیالکتیکی و لە پێوەندییەکی بەرامبەرانە لەگەڵ ئەوان هەڵسوکەوت دەکات. کەوایە بەرهەمهێنان هەر لەو حاڵەشدا هەمان بەکارهێنانە و بەکارهێنان هەروەها بەرهەمهێنانە. لە یەک کاتدا هەر کام لەوان لە خاڵێکی بەرامبەر بە یەکتر جێگەیان گرتووە. . . . بەرهەمهێنان دەبێتە بەکارهێنان کە بۆ ئەم بەکارهێنانە ماددەی خاو ئامادە دەکرێ، بەکارهێنانی بێ بەرهەمهێنان بەری لە هەر چەشنە بابەتێکە. بەڵام بەکارهێنانیش هەروەها بە دابینکردنی بابەت بۆ کەلوپەلە بەرهەمهاتووەکان دەبێتە هۆی بەرهەمهێنان. [١٣] نوسراوە نوێیەکان زیاتر جەخت لەسەر

بەکارهێنان دەکەن و ڕۆڵی بەرهەمهێنان بە هەڵە لەبەرچاو ناگرن. ئەم نووسراوانە لەسەر گرینگیی ئاڵوگۆڕ لە ئاستی نەتەوەیی یا نێونەتەوەی پێداگری دەکەن. هەروەها "بەکارهێنانی ناتەواو" وەکو هۆی گەشە خوازی ئیمپریالیزم دەزانن و یان ئەوەی کە بازار و بازرگانی وەکو بنەمایەک بۆ تێگەیشتنی لە دواکەوتوویی هەندێک لە نەتەوەکان پێناسە دەکەن.[١٤] بەو پێیە، گرینگیدان بە بەرهەمهێنان بەبێ ناسینی هاوتاکەی (بەکارهێنان) ڕەنگە دەربڕینی ئابووری توند و وشک ساز بکات. ئەم کێشە و کەموکۆڕیانە لە پاشان لە لێکۆڵینەوەی بۆچوونەکانی بەشێک لە نووسەران ڕوون دەکەینەوە.

**گەشە و گەشەنەسەندوویی:**

هەندێک لە بۆچوونەکانی گەشە و گەشەنەسەندوویی کەوا جەخت لەسەر دەسکەوتە ئەرێنییەکانی سەرمایەداری دەکەن بە تیۆرییگەلی "ئەرێنییانەی گەشە" ناسراون. دەستەیەکی تر لە تیۆرییەکان کەوا قامک دەخەنە سەر ئاکام و ئەنجامە نەرێنییەکانی سەرمایەداری، زۆرتر وەکو تیوریگەلی " گەشەنە سەندوویی " ناسراون. لانیکەم سێ چەشنە تیۆریی ئەرێنی لە بابەت گەشەسەندن هەیە: دەستەیەک لەم تیۆرییانە، دیمۆکراسی لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی گەشە لە وڵاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارییەکان تێکەڵ دەکەن. لە سەر ئەم مۆدێلە دەتوانین ئاماژە بە نووسراوەکانی سەرەتایی کەسانێکی وەکو «جەیمز بڕایس» و «کارڕێل. جەی. فرێدریش» بە ناوەکانی "دیمۆکراسییە نوێیەکان" (١٩٢١) و "دەوڵەتی یاسایی و دیمۆکراسی" (١٩٣٧) بکەین. ئەم نووسراوانە لەسەر بەهاکان و ئەزمونەکانی دیمۆکراسی ڕۆژئاوایی، بە تایبەت ڕەوایی یاسایی، بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکان، سیستەمە فرە حزبییەکان و سیاسەتی ڕکەبەری پێداگری دەکەن. « مارتین سیمۆر لیپسێت » (١٩٥٩) هەروەها بە پێشکەشکردنی پێداویستییەکانی دیمۆکراسی لە پێناو ڕەوایی سیاسی گەشەی ئابووری، بابەتە باسکراوەکانی لەگەڵ یەک ئاوێتە کرد. لە خوێندنەوەیەکدا لەسەر

دیمۆکراسی سیاسی، هەروەها ئامێر و کەرەسە پێویستەکان هەمدیسانەوە پێکەوە ئاوێتە کراون.[١٥] جگە لەوە، قەیران و قۆناغە یەک لەدوای یەکەکانی گەشەی سیاسی لە دەوڵەتە سەرمایەدارییەکان سەرنجی لێکۆڵەرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە؛ بەتایبەت ئەو بابەتە کە چۆن کۆمەڵگەی سیاسی لە ڕێگەی زۆربوونی جیاوازی بنەمایی، یەکسانی و توانایی ئەو گەشە دەکات و چۆن قەیرانەکانی شوناس، ڕەوایی، بەشداری، تەشەنە و دابەشکاری چارەسەر دەکات. بەگشتی وا گریمانە دەکرێ کە ئەو تایبەتمەندییانە لەگەڵ پێشکەوتنی گەشەی سەرمایەداری لە کۆمەڵگە خۆی دەردەخات.

دووەمین دەستە لە تیۆرییە ئەرێنییەکانی گەشە پێوەندییی بە ناسیۆنالیزمەوە هەیە. یانی بیرۆکەیەکی ئەورووپی کەوا لە نەریتە کولتوورییەکانی وەکو دەزگا نەتەوەییەکان کە بریتی دەبێ لە ئاڵا، سرودی نەتەوەیی، نواندنی ڕێ پێوان، یەکێتی ڕێکخراوەیی، دەسەڵاتداری دەوڵەت یان نەتەوە و باوەڕ بە وەفاداری و هەست یان ورەی هاوبەش کە لەگەڵ خۆئاگابوونەوەی نەتەوەیی لە ناخی جەماوەر بوونی هەیە، سەرچاوە دەگرێ. مێژوونووسان ڕیشەکانی ناسیۆنالیزم لە شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا (١٧٨٩) و یەکێتیی ئاڵمان و ئیتالیا لە نێوان سەدەی نۆزدەدا دەکۆڵنەوە. لە دەیەکانی ئەم دوایانەدا، ناسیۆنالیزم لە نێوان دەوڵەتە نوێسەرهەڵداوە نەتەوەییەکانی ئەفریقا، ئاسیا و ئەمریکای لاتین بینراوە. ئەگەرچی ناسیۆنالیزم شێوەی جیاجیای هەیە، بەڵام گریمانەیەکی سەرەکی لە سەرجەم ئەم وێژەیەدا هەیە و ئەویش ئەوەیە کەوا ناسیۆنالیزم پاڵنەر و هاندەری ئایدیالۆژیک بۆ گەشە دابین دەکات. ناسیۆنالیزم زۆر بە ئاسانی لەگەڵ گەشەی سەرمایەداری ئاوێتە دەبێ، بەڵام هەروەها دەتوانین ئەوە لە کۆمەڵگە سوسیالیستەکانیش بدۆزینەوە.

دەستەی سێیەم لە تیۆرییە ئەرێنییەکانی گەشە جەخت لەسەر ڕێگەیەکی هێڵی بەرەو نوێسازی (مۆدێرنیزم) دەکات. ئەم بۆچوونە دەتوانین لە تیۆرییە تەکامولییەکانی سەدەی نۆزدە و لەو باوەڕانەدا بدۆزینەوە کەوا پێی

وایە جیهانی ڕۆژئاوا دەتوانێ بە بڵاوکردنەوەی بەهاکان، سەرمایە و تەکنۆلۆجیای ڕۆژئاوایی، ناوچە کەمتر گەشەسەندووەکان بەرەو ڕێگەی شارستانییەت هان بدات. لە سەردەمی نێزیکتردا، مێژوونووسی ئابووری ئەمریکی « والت. دەبلیو. ڕۆستۆ» (١٩٦٠) خەریکی پێشکەشکردنی قۆناغەکانی گەشەی ئابووری لە ڕێگەی نوێسازی بوو و «ئا. ئێف. کا. ئۆرگانێسکی» (١٩٦٥) هەروەها خەریکی لێکۆڵینەوەی گەشەی دەوڵەت لە چوار قۆناغی سەرەکیدا بوو. «سامۆئیل پ. هانتینگتۆن» (١٩٦٨) بۆ بەرگری لە دارمانی سیاسی کەوا دەتوانێ بە هۆی ناسەقامگیری، گەندەڵی، زۆرداری و تووندوتیژی ساز بێت، جەختی لەسەر کۆنتڕۆڵ کردن و هێورکردنەوە و ڕێکوپێککردنی گۆڕانکارییەکانی خێرای کۆمەڵایەتی و ئابووری دەکرد.

تیۆرییەکانی گەشەسەندن لە بوارە جیاجیاکانەوە کەوتوونەتە بەر ڕەخنە. لە لایەکەوە ئەم تیۆرییانە ڕەگەز پەرەستانەن و لەسەر ڕێگەیەکی تەواو ئابووری دەمارگیرن. بە هۆی ئەوە کەوا سیاسەتی پلوڕالیستی پەسەند دەکەن، دەتوانین وەکو تیۆرییە ئایدیالۆژیکەکان ناویان بەرین. پێداگری ئەوان لەسەر پێشکەوتنی ڕێکوپێک لە قۆناغە مێژوییەکان، ئەوانی وەکو تیۆرییگەلێکی کوێرانە لێکردووە.

لەنێو تیۆرییە گەشەنەسەندووەکان هەروەها بۆچوونی جیاجیا هەیە. « ڕائول پربیش » و ئابووریزانەکانی دیکە پشت بە » لێژنەی ئابووری ڕێکخراوی نەتەوە یەکەگرتووەکان بۆ ئەمریکای لاتین » (ECLA) دەبەستن و سەردەمانێک باوەڕیان وابوو کەوا لە ڕێگەی "چوونە جێگەی هاوردە"، یانی بە دانانی سنوور بۆ هاوردە و سازکردنی بناغەیەکی پیشەسازی بۆ بەرهەمهێنان یا مۆنتاژکردنی کەلوپەل لە نێوخۆی وڵات دەتوانن بە گەشەی سەرمایەداری لە ئاستی نەتەوەیی بگەن و هەروەها لەو ڕێگەیەوە بۆڕژوازی نوێ وێڕای تایبەتمەندیە بازرگانی و پیشەسازییەکان ساز بکەن.

تیۆرییەکی دیکە لەمەڕ گەشەنەسەندوویی، مۆدێلی «کۆلۆنیالیزمی نێوخۆیی» کۆمەڵناسی سیاسی مەکزیک، «پابلۆ گونزالس کازانو» (١٩٧٠)یە.

لەو مۆدێلەدا پێداگری، لەسەر زاڵبوونی دایک شار (نێوەند) بەسەر ناوچە کەمەرەکانی نێوخۆی وڵاتێکە کەوا گەشەی نەتەوەیی ئەوان لە پەڕاوێزدا ماوەتەوە و لە ڕاستیدا چەوساوە، دواکەوتوو و گەشەنەسەندوو هێشراونەوە. «ئاندریێ گوندر فرانک» بە پەرەپێدانی ئەو بیرۆکەیە لە ئاستێکی جیهانیدا، لەسەر ئەم باوەڕەیە کەوا پێوەندیی نێوان نێوەندە پێشکەوتووە ئابوورییەکان (مێترۆپۆلەکان) و ناوچە کەمەرەکانی ئەو لەگەڵ وڵاتە دواکەوتووە کەمەرەکان ڕەنگدانەوەیەک لە گەشەی مێرکانتیلیستی و سەرمایەداری بوو کەوا لە سەدەی شانزدەیەمدا سەری هەڵداوە. [١٦] بە باوەڕی «فرانک» گەشەنەسەندوویی دۆخێکی سەرەتایی نییە، بەڵکو ئاکامی شوێنەواری خراپی سەرمایەدارییە. [١٧]

نووسەرانی دیکە وەکو «ئێمانۆئێل» (١٩٧٢) و «ئەمین» (١٩٧٦) بەلێکۆڵینەوە لەسەر کێشەکانی ئاڵوگۆڕی نایەکسان، سەرنجی خۆیان بە جێگۆڕکێی بەهاکان لە کەمەرەوە بۆ نێوەند داوە. [١٨] لە ڕوانگەی ئەوانەوە تایبەتمەندییە نایەکسانە نێونەتەوەییەکان لە ئەنجامی لادانی چالاکییە هەناردەیەکان، پاڵدانەوەی کەمەرە بە پیشەسازییە سووکەکان لەجیاتی پیشەسازییە قورسەکان و تێبینییەکانی دیکە ساز دەبێ (دابەشکاری نایەکسانی کاری نێونەتەوەیی). وڵاتە کەمەرەکان بە هۆی ئاوێتەبوون بە بازاری جیهانی سەرمایەداری، ناتوانن بەرەنگاری پاوەنخوازیە بیانییەکان ببنەوە و بەو پێیە، توانای گەشەی سەربەخۆیان نییە.

دەربڕینێکی دیکە لەسەر گەشەنەسەندوویی، تیۆریی«گەشەی ناڕیک و تێکەڵ»ە (بۆ وێنە نواک، ١٩٦٦). بەپێی ئەم بۆچوونە گەشەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان لە بەشێک لە کۆمەڵگەدا لەوانەیە خێراتر یان هێورتر لە بەشەکانی دیکە ڕوو بدات (گەشەی نایەکسان) و تایبەتمەندییەکانی قۆناغی نزمتر لەوانەیە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی قۆناغی بەرزتر لەیەک بئاڵێن (گەشەی تێکەڵ). ئەم تیۆرییانە هەروەها، زۆرجار لەگەڵ چەمکە جیاجیاکانی پاشکۆبوون تێکەڵ بوون و زۆر لەو نووسەرانەی کەوا لە هەوڵی

تەفسیرکردنی گەشەنەسەندندا بوون هەروەها، سەرنجیان بە تیۆرییە ئیمپریالیزمەکان داوە. [١٩]

هیچکام لە تیۆرییە گەشەنەسەندووەکان بەری لە ڕەخنە نەبوون. ئەو ڕوانگەیە کە دەڵێ بۆرژوازی پێشکەوتووی نەتەوەیی خەریکی چارەسەرکردنی کێشەکانی گەشەنەسەندووییە، بە هۆی لاوازبوونی ئەم بورژوازییە کەوتووەتە ژێر پرسیارەوە. جگە لەوە، بە پێی بۆچوونی ڕەخنەگرەکان، گەشەی سەربەخۆی سەرمایەداری لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ وڵاتە زاڵەکان ئەگەری نییە و پێوەندییە چینایەتییەکانی نێوخۆیی زۆرجار لە لایەن ئەو تیۆرییانەوە لەبەرچاو ناگیرێ. لە کۆتاییدا دەبێ بگوترێ کە هیچ تیۆرییەکی یەکپارچەی گەشەنەسەندوویی بوونی نییە و بۆچوونە جیاجیا و ناکۆکە هەبووەکان هیچکات لەگەڵ ئەزمونی مێژوویی وڵاتە دوواکەتووەکان گونجاو نەبووە.

ئەگەر تەفسیرەکانی گەشە و گەشەنەسەندوویی لەگەڵ ئەزموونی مێژوویی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای لاتین بەراورد بکەین، دەتوانین وەسفەکانی خوارەوە پێشکەش بکەین: تیۆرییە ئەرێنییەکانی گەشە پێداگری لەسەر سەرمایەداری سەدەکانی دەیەم و یازدەیەم دەکەن کەوا لە ناخی دەرەبەگایەتی (فیئۆدالیزم) دەستی بە گەشە و پەرەسەندن کردووە. لە پاش چەند سەدە، بازرگانەکان کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر شارەکان پتەو کرد و لە نێوەندە لادێیەکان کاریگەریان لە سەر بازارە نوێیەکان دانا. ئەم پرۆسەیە بە تایبەت لە ئینگلیس ئاشکراترە و لە نیمچە دوورگەی ئیبری لە کاتی داگیرکردنی دوو قارەی ئەمریکا (ئەمریکای باشوور و ئەمریکای باکوور) کەمتر دیار بوو. بۆیە پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی لە ئێسپانیا و پورتوگال بۆ جیهانی نوێ گوێزرانەوە و خانەدانە دەرەبەگایەتییەکان لە ئەمریکای لاتین سەریان هەڵدا و گەشەی پڕاوپڕی سەرمایەداری وەستا؛ مەگەر لە شارە گەورەکان کە لەوێ سەرمایەداری لە ئاکامی پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی پێشکەوتووتر پەرەی گرتبوو.

ئاكامی ئەم کارە پێکهاتنی دوو کۆمەڵگە بوو. یەکیان دەرەبەگایەتی و دواکەتوو کە لە دەورووبەری دێهاتەکان بوو و ئەویکەیان سەرمایەداری و مۆدێرن کە لە نێوەندە شارییەکان بوو. کەوایە بە باوەڕی تیۆرییدارێژە ئەرێنییەکانی گەشەسەندن، سەرمایەداری ڕێگەچارەی کێشەی دوواکەوتوویی و هەروەها ڕێگەیەک بەرەو گەشەسەندن لە ئەژمار دێت.

تیۆرییە گەشەنەسەندووەکان بە پێشکەشکردنی ڕوانگەیەکی جیاواز، وا بیر دەکەنەوە کە لە سەردەمی دەست بەسەرداگرتنی قاڕەی ئەمریکادا، ئێسپانیا وەکو ئینگلیس وڵاتێک بوو کەوا لەحاڵی تێپەڕبوون لە دەرەبەگایەتی بەرەو سەرمایەداری بوو، یانی وڵاتێک بە گەشەی ناڕێک کە هەم لە ئۆرگانە دەرەبەگایەتییەکان و هەم لە چالاکییەکانی چینی نوێی سەوداگەر قازانجی وەردەگرت. کەوایە، دۆزینەوە (کشف)، دەست بەسەرداگرتن و کۆلۆنیالیزم لە هەر دوو قاڕەی ئەمریکا بە مەبەستی دابینکردنی ئامانجە سەرمایەدارییەکان و بە تێکەڵ کردنی هەر دوو قاڕەی ئەمریکا لە سیستەمی نوێی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بە ئەنجام گەیشت.

ئەم چینە دەسەڵاتدارە کە لە ئەمریکای لاتین سەری هەڵدا دەرەبەگ (فیئودال) نەبوو، بەڵکو بورژواز بوو و ئەم چینە بە قازانجوەرگرتن لە ماددە خاوەکانی ناوچە لادێیەکان، گەشەنەسەندوویی لە پاش خۆی بە جێ هێشت. کەوایە دوو کۆمەڵگە ساز نەبوو، بەڵکو یەک کۆمەڵگە ساز بوو کە لەوێدا سامان و گەشەی شارەکان لە ئاکامی گەشەنەسەندوویی ناوچە لادێیەکان پێک هاتبوو، سەرمایەداری وەکو بەرپرسی گەشەنەسەندوویی دادەنرا و بەم پێ یە سوسیالیزم تەنیا دەرفەت و ئەگەرێک بوو کەوا بۆ گەشەسەندن بە جێ مابۆوە.

## پەڕاوێزەکان:

١- ڕێبەری بزاڤی ئازادیخوازی خەڵکی غەنا و سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە بوو کەوا لە دوای سەربەخۆیی غەنا بە کودتای سەربازی لە کار وەلانرا. «نکرومە» دانەری تێوریی "کۆلۆنیالیزمی نوێ وەکو دووایین قۆناغی ئیمپریالیزم "ە.

٢- احمد ساعی، ***مسایل اقتصادی-سیاسی جهان سوم***، انتشارات سمت، چاپ ششم، ١٣٧٦، صص ١٥-١٠.

٣- رونالد اچ چیلکوت، ***درآمدی بر مسایل اقتصادی کشورهای جهان سوم***، نظریه های توسعه و توسعه نیافتگی، ترجمه و تلخیص احمد ساعی، تهران، نشر علوم نوین، ١٣٧٠، ص٣١.

٤- ایو لاگوست، ***مسایل ممالک کم رشد***، ترجمه سیروس سهامی، تهران: چاپخش ١٣٦٩، ص٣١.

٥- ولفگانگ ج مومسن، ***نظریه های امپریالیزم***، ترجمه احمد ساعی، تهران نشر قومس، ١٣٧٧، صص٩٩-٩٧.

6- Marx und Engels,***Manifest der Kommunistischen Partei***, New, Bd 4, S. 362-380.

٧- ئەم بابەتە بەتایبە ت لەنێو سوپا دەبیندرێ.

٨- مانۆفاکتۆ، ئەو کارگە دەستیانە بوون کەوا پێش شۆڕشی پیشەسازی ڕۆڵێکی سەرەکیان لە بەرهەمهێنان هەبوو.

9- Lenin***,Staat und Revolution***,Berlin,Dietzverlag,1970 .

10- Ralph Miliband,***Der staat in der Kapitalistischen***, geselschaft,Frankfurt,1974 .

11- مارکس / انگلس، " بورژوازی در روابط کار و سرمایه و تحقق استثمار کارگر به قهر دولتی متوسل می شود "، جلد ٢٣، ص ٧٦٥.

12- Max Weber, ***Die Protestantiche Ethik und der geist Kapitalismus*** , Tubingen ,1974 .

١٣- مومسن ولفگانگ، ***هەمان سەرچاوە***، لا ٩٤.

١٤- احمد ساعی، ***هەمان سەرچاوە***، نەسكی یەكەم، لا ١٥-١٢.

15- Soymour M. lipset, ***Soziologie der demokratie Neuwied***,1962 .

١٦- مێركانتیلیزم لە فەڕەنسا بە (Colbertism) ناوی دەركردوە.

١٧- درباره مبادلـه نـابرابر ن. ك:پـالوا، شـولر، سـمیر امـین، امانویـل: در زنگهاوس، فرانكفورت، ١٩٧٢.

18- S. Amin. ***Dieungleiche Entwicklung***, Hamburg,1975 .

١٩- چیلكوت، هەمان سەرچاوە، لا ٨٥.

# لێدوانە کلاسیکەکانی گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی

لەنێو ئەو توێژەرانەی کە لەسەر بەهرەمەندی چەمکەکانی گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی بۆ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی سەرمایەداری هەوڵیان داوە، تەنیا تاقمێکی کەم، کەڵکی ئەم وشانەیان لە لای «مارکس»، «لێنین»و «ترۆتسکی» ڕوون کردۆتەوە؛ ئەگەرچی لەو باسەدا دەتوانین لە بیرمەندانی دیکەش ناو بەرین، بەڵام ئەو سێ کەسە بە هۆگەلێک گرینگیەکی زیاتریان هەیە. وردبینی ئەوان لە بابەت کێشەکانی پێوەندییدار بە کەڵەکەکردن و دژەکەڵەکەکردنی سەرمایەداری یارمەتی بە ناسینی گەشە و گەشەنەسەندوویی دەکات. ئەمڕۆکە زۆر لە دانیشتنە ڕوناکبیرییەکان کە کێشەگەلی گەشە و گەشەنەسەندوویی دەخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی ئەو سێ کەسە دان و زۆربەی ئەو لێکۆڵەرانە کەوا خۆیان بە ڕەخنەگری مارکسیزم دەزانن پشتبەستو بە تیۆرییەکانی ئەوانن. لەگەڵ ئەوەش، هەندێک جار نموونە هێنانەوەی ناڕەوا لەوان دەبێتە هۆی خراپ تێگەیشتن و سەر لێ شێوان.

***کارڵ مارکس*** : «مارکس» لە ساڵی ١٨٦٠ ئەم بابەتەی پەسەند کرد کەوا پەرەسەندنی جیهانیی سەرمایەداریی پیشەسازیی ئینگلیس، وێران کردنی کۆمەڵگە ناسەرمایەداریەکانی لەدووایە و دەبێتە هۆی پێشکەوتنی سەرمایەداری لە دەرەوەی ئەورووپا.[١] لەساڵی ١٨٤٨ «مارکس» و «ئینگلس» لە "مانیفێستی کۆمۆنیزم" ڕوونیان کردەوە کەوا گەشەی سەرمایەداری لە بەستێنی گەشەی وزە بەرهەمهێنەرەکان خۆی دەردەخا: بۆرژوازی، لە ماوەی سەد ساڵ دەسەڵاتداری خۆی، زیاتر لە سەرجەمی

هەموو نەوەکانی ڕابردوو دەستی بە سازکردنی هێزە بەرهەمهێنەرە چەقبەستووە گەورەترەکان کردووە. بە باوەڕی ئەوان پەرەسەندنی سەرمایەداری لەگەڵ ڕاکێشان و تواندنەوەی کۆمەڵگەکانی دیکە کەوا لە ژێر کۆنترۆڵی ئەواندان، جێبەجێ دەبێ. بۆرژوازی دەبێ لە هەموو جێگەیەک شوێنی خۆی دیاری بکات، نیشتەجێ بێ و پێوەندییەکانی خۆی ساز بکات.

***بورژوازی لەگەڵ باش بوونی خێرای هەموو ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان و لەگەڵ فرەوانبوونی کارئاسانی بۆ دەست پێ ڕاگەیشتن بە ئامێرە زانیارییەکان، هەموو نەتەوەکان تەنانەت سەرەتایی ترین نەتەوەکانی بۆ لای شارستانییەت ڕکێشاوە. نرخی هەرزانی کەلوپەلەکانی ئەو، تۆپخانەیەکی قورسە کە هەموو دیوارەکانی وڵاتی چین دەڕوخێنێ و نەتەوە سەرەتایی وکللەڕەقەکانی بێزار لە بیانییەکان ناچار دەکات خۆ بە دەستەوە بدەن.*** [٢]

«مارکس» لە نامیلکەکانی خۆی کە لە ساڵی (١٨٥٣) لە گۆڤاری «نیۆیۆرک دیلی تریبۆن» بڵاو بۆوە لە بابەت ئەوە کەوا چۆن پەرەگرتنی سەرمایەداریی پیشەسازی پێوەندیی بریتانیای لەگەڵ هێند ساز داوە، دەنووسێ : «ئەوە ئینگلیزییەکانی داگیرکەر بوون کە کارگە دەستییەکانی هێند و چەرخە ڕستنەکانیان (هۆنینەوە) لەنێو برد. ئینگلیس کاری خۆی بە لابردنی کەتانی هێند لە بازاڕی ئەورووپا دەست پێکرد». [٣]

لەو کاتەوە ئەو شارانەی کەلوپەل لەواندا بەرهەم دەهێنران، نوشوستیان هێنا. لە حاڵێکدا پێشتر، هێرشی سەرمایەداری ئینگلیس مەزرا گەورەکانی لە هێند ساز کردبوو و کەلوپەلی ئینگلیزی لەو وڵاتەدا بڵاو کردبۆوە، ئێستاش نۆرەی سەرمایەی پیشەسازی بوو کە کاریگەری خۆی دابنێت.

***هەرچی دەرهاتە (بازدە )پیشەسازییەکان زۆرتر بە بازاڕی هێند پشتبەستو دەبوون پێویستی سازبوونی وزە نوێیە بەرهەمهێنەرەکان لە هێند، دوای لەنێوچوونی پیشەسازی خۆماڵی ئەو وڵاتە، زیاتر هەستی پێدەکرا. . . خاوەن کارگەکان، وێڕای ئاگابوون لە سەرکەوتنی خۆیان لە ئینگلستان، ئێستا بە هیوای لەنێوبردنی هێزە ڕکەبەرەکانی خۆیان لە هێند و لەنێوبردنی***

***سەرجەم کارخانە کۆنەکانی دەوڵەتی هیند و لەنێوبردنی یەکجاری کۆمپانیای هێندی ڕۆژهەڵاتی بوون.*** (٤)

مارکس "ئەرکێکی دووانەی لە هێند دەدەیت: یەکیان تێکدان و ئەوی تریان ڕیفۆڕم و سەرلەنوێ سازدکردنەوە بوو. تێکدانی کۆمەڵگەی کۆنی ئاسیایی و دامەزراندنی بنەما ماددییەکانی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا لە ئاسیا". (٥) بە پێی بۆچوونی ئەو، ئینگلستان نەمانی بۆ هێند بە دیاری هێنا. ئەم نەمانە لە ڕێگەی خاپووركردنی کۆمەڵە خۆماڵیەکان، ووشککردنی ڕیشەی پیشەسازی خۆماڵی و تێکشکاندنی هەموو شتە گەورە و پڕ بەهاکان لە کۆمەڵگەی خۆولاتی جێبەجێ کرا. بەڵگە مێژووییەکانی دەسەڵاتداریێتی ئەوان لە هێندوستان ڕاپۆرتێکی زۆری لە بابەت لەنێوبردن تێدا نییە. وێڕای ئەو هەموو وێرانکارییە، کاری ڕیفۆڕم و سەرلەنوێ سازکردنەوە بە زەحمەت دەبیندرا، لەگەڵ ئەوەشدا چاکسازیی دەستی پێکردبوو. (٦)

بەپێی وتەی «ئار. پی. دات» مەبەستی «مارکس» ئەوە بوو کەوا سەرمایەداری بە دانانی دۆخێکی ماددی تایبەت، کۆڵەکەیەکی بۆ پێشکەوتنی سەرمایەداری پێکهێناوە. ڕیفۆڕم و چاکسازیی بە سەرکەوتنی پرۆڵتاریای ئینگلستان بەسەر چینی دەسەڵاتدار و یا بە شۆڕشی سەرکەوتووانەی جەماوەری هێند پێوەندیی هەبوو. (٧) «کێنزۆ مۆهری» بە وتەی زۆر لە نووسەران لەوانە »پۆل باران» و «سەمیر ئەمین» ئاماژە بەو ڕوانگەیەی «مارکس» دەکات کەوا سەرمایەداری بە نیشتەجێ بوون لە ناوچە دوور لە سەنتەرەکان، لەڕێگەی چەوساندنەوەی مرۆڤەکان و هەناردە کردنی زێدە بۆ وڵاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارەکان، خەریکی وێرانکردنی کۆمەڵگە ناسەرمایەدارەکانە. ئەم نووسەرانە بە جێی گەشەسەندن، گەشەنەسەندووییان خستە بەر لێکۆڵینەوە کە بە هۆی تەشەنەی سەرمایەداری بۆ سەر ناوچە دواکەوتووەکان جێ مابوو. کەوایە هەر وەکو نووسراوەکانی «مارکس» لەسەر هێند نیشان دەدات، ئەو نووسەرانەش سەرمایەداری لەو ناوچەیە وەکو نوشست هێنان و بەناخداچوون دەژمێرن.

وێڕای ئەوەش، لەوانەیە »پۆل باران» و هەندێک لە نووسەرانی دیکە، دووایین نووسراوەکانی مارکسیان لەبەر چاو نەگرتبێ کە لەوێدا وادەچێ مارکس بەرە و پەسەندکردنی ڕوانگەیەک چووبێت کە لەوێدا پێی وایە بازرگانی ئازاد لە بریتانیا بە گۆڕینی کۆمەڵگەی کۆن بە سیستەمی بازاڕی جیهانی، "گۆڕانکارییەک لەو کۆمەڵگەیە ساز بکات کە خولێکی گەشەسەندن بۆ ئابووری ئەو وڵاتە پێک بهێنێ و بنەمای وزە بەرهەمهێنەرەکانی ئەو پاشکۆ بە ئینگلستان بکات". (٨)

نووسراوەکانی دواتری مارکس لەمەڕ کێشەی ئیرلەند (چاو بگێڕن بۆ مارکس و ئینگلس، ١٩٧٢) هاوشێوەی نووسراوەکانی سەردەم لەمەڕ گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی لە سیستەمی سەرمایەدارییە :

***دابەشکاری کاری نوێی نێونەتەوەیی، دابەشکارییەک کە لەگەڵ پێداویستییەکانی نێوەندە سەرەکییەکانی پیشەسازی مۆدێڕندا دەگونجێ دەستی بە پەرەسەندن کردوە و بەشێک لە جیهانی وەکو ڕووبەری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بۆ پێشکەشکردن بە بەشێکی دیکە کە وەکو رووبەری پیشەسازی دەمێنێتەوە، گۆڕیوە. (٩)***

«مارکس» لەبابەت ئیرلەند باوەڕی وابوو کە ئیرلەندییەکان لە بەرامبەر ئینگلستان پێویستیان بە ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی، شۆڕشی زەوی و زار و تاریفە پشتیوانیکەرەکان هەیە. «ئانتۆنی بروئێر» لە پوختەکردنی نووسراوەکانی مارکس لەسەر هێند جیاوازییەکی گرینگی دۆزیوەتەوە کە دەتوانێ لە لێکدانەوەی جیاوازییە هزرییەکانی سەردەم لە بابەت گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی یارمەتیمان بدات. ئەگەرچی سەرمایەداری سەوداگەر بنەما کۆمەڵایەتییەکانی پێش سەرمایەداری، لە وڵاتە دواکەوتووەکان لەنێو دەبا، بەڵام گۆڕانێک لە ڕوخسار و سیمای ئەوان نادات.

لە بەرامبەردا، سەرمایەداری پیشەسازی هەم بۆ لەنێوبردن و هەم بۆ روخسار و سیما گۆڕینی بنەما کۆمەڵایەتییە کۆنەکان بە بنەما نوێیەکان

هەنگاو دەنێ و لەو پرۆسەیەدا، دابەشکاری کاری نوێ ساز دەکات. مارکس لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە سەرمایەداری سەوداگەر دەسەڵاتی خۆی لە هەر شوێنێک کەوا دۆخی دواکەتوویی بوونی ببێ دادەمەزرێنێ. بازرگانی لە سەرانسەری قۆناغە پێش سەرمایەدارییەکانی بنەما کۆمەڵایەتییەکان زاڵ بووە، ئەوە لە حاڵێکدایە کە لە کۆمەڵگەی مۆدێرن بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتەیە. بەم جۆرە دەسەڵاتدارێتی ئینگلستان لە هێند هاوکات، دواکەوتوویی وبێچارەبوون لە لایەک و ڕەوشی گەشەی سەرمایەداری لە لایەکی تر، لە دوای خۆی بە جێ هێشت. بە باوەڕی «بروئێر» لێدوانی «مارکس» لەسەر هێند و ئیرلەند، یەکپارچە و گونجاو بوو، بەڵام ئەو دوو وڵاتە لە دوو ئاستی جیاواز لە گەشەدا بوون. ئەو گەیشت بەم ئەنجامە کەوا سەرمایەداری، مەرج نییە دەست بە تواندنەوەی ناوچە کەمەرەکان بکات، بەڵام تا بتوانێ ئەم ناوچانە دەچەوسێنێتەوە.

***تاپێش شۆڕشی پیشەسازی، پێوەندییە دەرەکییەکانی سەرمایەداری لەڕێگەی سەرمایەی سەوداگەر جێبەجێ دەکرا و زۆر سەرقاڵ بە گۆڕینی ڕواڵەتی ئەو کۆمەڵگەیانە کەوا ڕاکێشی بازاڕی جیهانی دەبوون، نەدەبوو. کاتێک کە سەرمایەی پیشەسازی جێگەی ئەوی گرتەوە، زاڵبوونی سەرمایەداری توانی لەگەڵ بەپیشەییکردنی کۆمەڵگە کەمەرەکان، ڕۆلی پێشکەوتووانە هەرچەند بێ بەزەییانە بگێڕێ.*** (١٠)

مارکس بە لێدوان لەسەر چەوساندنەوەی هێند و ئیرلەند و سەرنج خستنە سەر ڕەوشی کۆلۆنیالیزم، لە نێوان وڵاتە هەژار و دەوڵەمەندەکان جیاوزای دانا. ئەو هەروەها پێوەندیی نێوان سەرمایەداری زاڵ و چەوساندنەوەی ناوچە پێش سەرمایەدارییەکانی خستە ڕوو. لێرەدا هەندێک لە بۆچوونەکانی ئەو هاوشێوەی بۆچوونە هەنووکەییەکانە کە دەڵێن سەرمایەداری یارمەتی بە گەشەی گەشەنەسەندوویی زۆر لە بەشەکانی جیهان دەکات.

***لێنین:*** لە کتێبی «ئیمپریالیزم: بەرزترین قۆناغی سەرمایەداری» گوتوویەتی:

***نە تەنیا دوو دەستەی گرینگ لە وڵاتەکان، واتە وڵاتە خاوەن کۆلۆنییەکان و وڵاتە کۆلۆنییەکان بوونیان هەیە، بەڵکو وڵاتە پاشکۆ جیاجیاکانی دیکە دەتوانین دیاری کەین کەوا لە لایەنی سیاسییەوە سەربەخۆن، بەڵام لە ڕاستیدا لە تۆڕی پاشکۆبوونی ماڵی و دیپلۆماتیکدا قەتیس ماونەوە.*** [11]

« فێرناندۆ هێنریکۆ کاردۆزۆ » تیۆرییداڕێژی بەرازیلی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، وێڕای دانپیانان بە ڕۆڵی «لێنین» بەڵگە دێنێتەوە کەوا ڕووداوەکانی ئەم دوایانە بوونە هۆی گۆڕان لە شێوازی پێوەندیی نێوان وڵاتە ئێمپریالیستی و پاشکۆکان. لە باوەڕی ئەودا "پاشکۆبوون"، "سەرمایەداری پاوەنی" و "گەشەسەندن" لێدوانگەلی لێکدژ نیین. لە ڕاستیدا ئەوەی ڕوو دەدات چەشنێک "گەشەی سەرمایەداری پاشکۆیە" کە لە هەندێک لە بەشەکانی جیهانی سێیەم دەچێتە پێشەوە و وەکو فۆڕمی نوێی گەشەی پاوەنەکان وایە. [12] هەروەها بە باوەڕی «کارلۆس جانسۆن» لێنین چەمکی وڵاتی پاشکۆی لە تیۆرییداڕێژانی ئابووری سیاسی نامارکسیزم وەرگرتبوو، بەڵام بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر ماتریالیزم و پێشکەشکردنی لێدوانە هزرییەکان هەنگاوی نا.

«جانسۆن» لەسەر ئەم باوەڕە بوو کەوا هێرشی لێنین بۆ سەر «نارۆدنیکە« ڕوسییەکان یان سۆسیالیزمە مرۆڤییەکان بە هۆی ئایدیالیزم و ئەو لێکۆڵینەوە ئابوورییانەی وردە بۆرژوازی بوو کە هاوشێوەی نووسراوە سەردەمییەکان سەرنجیان بە کەموکۆڕیەکانی بازاری نێوخۆ، کێشەی وەڕاستگەڕانی بەهای زێدە لە نێوەند و مەیل بەرەو بازاڕە بیانییەکان بە مەبەستی تەرخانکردنی بەهای زێدە دەدا. [13] لە بەرامبەر ئەم ڕوانگەیە، « ستیڤێن کلارکسۆن » بەگەشبینییەوە لە بابەت کەڵکوەرگرتن لە چەمکە مارکسیست لێنینیستییەکان، بۆ شیکردنەوەی گەشەنەسەدوویی دەڕوانێ. [14] و «دەیڤید لین» هەروەها ئاماژە بەم بۆچوونەی لێنین دەکا کە شۆڕشی

بورژوازی تەنیا قۆناغێکی بچووک و لە حاڵی تێپەڕاندنی سەرهەڵدانی نەتەوەکان بۆ ڕوخاندنی سەرمایەدرابیە و دەڵێ: ئەم ڕوانگەیە پاساوهێنانەوە بۆ بەدوودادا چوونی ڕێگەکانی گەشەی ناسەرمایەداری لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکانە و نیگابەخشی (ئیلهام) نووسەرانێکی وەکو «پۆل باران» و «ئاندرێ گوندرفرانک» بووە، کەوا بە دووای بەدیهێنانی شۆڕشی سیاسی لە ژێر ڕێبەرایەتی چینی کرێکار دان.[١٥]

زۆر لە تیۆرییەکانی گەشەی سەرمایەداری کەوا لەسەر وڵاتە دواکەوتووەکان نووسراون، دەتوانین لە خوێندنەوە کلاسیکەکانی ئیمپریالیزم بیاندۆزینەوە. «ج. هابسۆن» بیرمەندێکی لیبراڵی ئینگلیزی لە کتێبی «ئیمپریالیزم» (١٩٠٢)، مەسرەفکردنی (مصرف) ناتەواوی نێوخۆیی وەکو هۆی سەرەکیی گەشەی ئیمپریالیزمی بریتانیا بۆ بەشەکانی دیکەی جیهان پێناسە کردووە. «رۆدۆڵف هێلفێردینگ» هەروەها لە کتێبی «سەرمایەداری ماڵی» جەختی لەسەر ئەم بابەتە کردووە. «ڕۆزا لۆکزامبورگ» لە کتێبی «کەڵەکەکردنی سەرمایە» (١٩١٣) یەکێک لە باشترین شیکردنەوە سەرەتاییەکانی لەسەر کاریگەری ئیمپریالیزم لە وڵاتە دواکەتووەکان پێشکەش کردووە. «ن. ئای. بوخارین» لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی «ئیمپریالیزم و ئابووری جیهانی» (١٩١٥) سەرنجی بە ڕەوتی تێکەڵ بوونی ئابووریە نەتەوەییەکان لە ئابووری جیهانی داوە، ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئەو پشکنینی لەمەڕ کاریگەربوونی ئیمپریالیزم لە وڵاتە دواکەوتووەکان نەکردوە.[١٦]

«لینین» لە ساڵی (١٩١٦) گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان لە سیستەمی سەرمایەداری، بەتایبەت ڕۆڵی سەرمایەداری نێونەتەوەیی و حەزی سەرمایەداری بۆ پاوەن یان قۆناغی ئیمپریالیزمی خستەبەر لێکۆڵینەوە. کتێبەکەی ئەو «گەشەی سەرمایەداری لە ڕووسییە» (١٨٩٩) وەکو گرینگترین خوێندنەوە لەسەر سەرمایەداری لە وڵاتێکی دواکەوتوو و پێشەنگی خوێندنەوە کلاسیکە پاشکۆبووەکان ناسراوە.[١٧]

«گابریەل پالما» دەڵێ کتێبی یەکەمی لینین لەسەر ڕووسیە لەبەر پێویستی و ئەگەری گەشەی سەرمایەداری لەم وڵاتە سەرچاوەی گرتبوو.

لە لایەکی دیکەوە، بەڕای «نارودنیکەکان» [18] گەشەی سەرمایەداری بۆ پێکهاتنی سوسیالیزم، زەرورریی و بنەڕەتی نەبووە؛ بە ڕای ئەوان بە شێوەیەکی گشتی دەکرا لە قۆناغی سەرمایەداری قەلەمباز لێدرێ. «لینین» لە بەرامبەردا، لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە ڕوسییە ئەگەرچی بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە سەرمایەدارەکانی دیکە دواکەوتووە، بەڵام لە ڕاستیدا وڵاتێکی سەرمایەدارییە. ئەو وێڕای لێدوان لەسەر قۆناغەکانی گەشەی سەرمایەداریی پیشەسازیی ڕووسییە، دەنووسێ:

***سێ قۆناغی سەرەکی لەو گەشەیەدا بوونی هەیە، بەرهەمهێنانی وردە کەلەوپەلی (بچووک و زیاتر پیشەسازییە وەرزێڕییەکان)، بەرهەمهێنانی کارگەیی و سەرمایەداری (پیشەسازییە گەورە ماشێنییەکان). . . . پێوەندیی و بەردەوام بوون لە نێوان فۆڕمە گرینگە پیشەسازییەکان، نێزیکترین چەشنی ئەم پێوەندییەیە، ڕاستیەکان بەڕوونی نیشان دەدات کەوا مەیلی سەرەکی بەرهەمهێنانی وردە کەلوپەلی و کارگەیی، بەرەو لای فرەوانبوونی بەرهەمهێنانی کارگەیی و سەرمایەدارییە.*** [١٩]

«پالما» دەڵێ؛ یەکێک لە کاریگەرییە گرینگەکانی «لینین» لەسەر خوێندنەوەی گەشەی سەرمایەداریی وڵاتە دواکەوتووەکان، شیکردنەوەی ئەو لەسەر خاوبوونی گەشەی ڕووسیە لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ وڵاتە سەرمایەدارییەکانی دیکە بوو. ئەو لەم بوارەدا هەڵەکە بۆ لاوازی بورژوازی، ڕکەبەرایەتی ئەورووپای ڕۆژئاوا و مانەوەی بنەما نەریتییەکان لە ڕووسییە دەگەڕێنێتەوە. «پالما» دەڵێ نووسەرانی سەردەم دەتوانن ئەم لەمپەرانەی سەر گەشەی سەرمایەداری ڕووسییە وەکو «گەشەی گەشەنەسەندوویی ڕووسییە» ناو بەرن[20]. «لینین» جیانەکراوەبوونی پیشەسازییە «دەستییەکان» لە پیشەسازییە »کارگەیەکان» نیشان دەدا و بەم چەشنە توانای پێوەندییەکانی نێوان شێوە جیاوازەکانی بەرهەمهێنان لە ڕووسییە

ئاشکرا بکات. ئەو پێی وابوو کە سەرمایەداری لە لایەنی سیاسییەوە پێویست و لە لایەنی ئابوورییەوە مسۆگەرە و گەشەی سەرمایەداری لە وڵاتە دواکەوتووەکان، تەنیا وەکو رەوتێکی جیابوونەوەی بنەما پێش سەرمایەدارییەکان نەبووە، بەڵکو هەروەها «پرۆسەیەکی ئاڵۆزتر لە کردەی بەرامبەر لە نێوان بنەما نێوخۆیی و بیانییەکانە». لە کۆتاییدا گەشەی سەرمایەداری و شۆڕشی بۆرژوا – دیمۆکراتیکی هاوکاتی ئەو، بە ئاستی گەشەی ئەورووپای رۆژئاوا دەگات.[21] بە وتەی پاڵما شۆڕشی ١٩٠٥ و لەنێوچونی «نێونەتەوەیی دووەم» بوو بە هۆی ئەوەی کە لێنین و برادەرەکانی، لەوانە «ترۆتسکی» رازی بەوە بن هەڵوێستی خۆیان لەمەڕ پێویستی گەشەسەندنی پڕاوپڕی سەرمایەداری نەرم کەنەوە. ئەوان لە شۆڕشی ١٩٠٥ پێیان وابوو، پرۆلتاریا دەتوانێ رەوتی شۆڕشی بۆرژوا – دیمۆکراتیک بە ئەنجام بگەیەنێ. ئەوان هەروەها دەیانزانی، روسییە لەوانەیە بازنەیەکی لاواز لە شەڕ دژی سەرمایەداری بوروژێنێ و بە یارمەتی کۆمەڵگە پێشکەتووە سوسیالیستییەکان، دەتوانێ خێراتر لە رێگەی سوسیالیزمدا هەنگاو بنێ. «پاڵما» لەسەر ئەو باوەڕە بوو ئەگەرچی ئەم شیکردنەوەیەی لێنین نابێ بە شێوەی میکانیکی لەسەر سەردەمە مێژووییەکانی دیکە و هەروەها ناوچەکانی دیکەی جیهان بە کار بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رێگەیەک نیشان دەدات:

***ئەمە خوێندنەوەیەک لەسەر فۆرمە راستەقینەکانی پێوەندیی نێوان بەشە سەرمایەدارییەکانی وڵاتە دوواکەتووەکان و وڵاتە پێشکەوتووەکان و هەروەها ئەو فۆرمە دیاریکراوانەیە کە شێوەی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری ملکەچی بەشێکی تر و پاشماوەی سیستەم دەکات. لە بنەڕەتدا ئەوە خوێندنەوەیەکە لەسەر وزەی بزوێنەری وڵاتە دواکەوتووەکان وەکو تێکەڵەیەک لە هۆکارە چارەنوس سازە گشتییەکانی سیستەمی سەرمایەداری (هۆکارە بیانییەکان) و هۆکارە چارەنووس سازە تایبەتییەکانی هەرکام لەم وڵاتانە (هۆکارە نێوخۆیەکان).*** [٢٢]

«پاڵما» بەم ئەنجامە دەگات کە لێنین و تیۆرییدارێژانی دیکە تێگەیشتبوون کەوا ئیمپریالیزم دەتوانی ڕێگری لە گەشەی سەرمایەداری وڵاتە دواکەوتووەکان بکات، بەڵام هەستیان دەکرد کە هەر کات لەمپەرە کۆلۆنیالیزمەکان نەمێنێ ئەگەری پێشکەوتن هەیە. بۆیە نووسەرە کلاسیکە ئیمپریالیزمەکان گریمانەیان دەکرد کە ئەگەر ئەو لەمپەرانە لاچێت، سەرمایەداری دەتوانێ وەکو وزەی پێشکەوتوو لە وڵاتە دواکەوتووەکان دەوری سەرەکی بگێڕێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕووسییە هیچکات کۆلۆنی (داگیرکراوی) هێزێکی ئەورووپی نەبووە. ئەمریکای لاتین ئەگەرچی سەربەخۆیی وەرگرتبوو، بەڵام لە ژێر کۆیلایەتیی ئیمپریالیزمی ئەمریکای باکووردا بوو. بە ڕای «پالما» شەڕ دژ بە ئیمپریالیزم، شەر بۆ پیشەسازی و گەشەی سەربەخۆی سەرمایەدارییە.

***ترۆتسکی:*** لە ساڵی ١٩٣٧ تا کاتی تیرۆری لە ساڵی ١٩٤٠ بۆ مەکزیک دوور خرایەوە. باوەڕەکانی ئەو کاریگەریی قووڵی لەسەر شۆڕشی ١٩٥٢ لە «بۆلیوی»، شۆڕشی وەرزێڕی لە »پێرو» و، بزووتنەوە چریکییە شارییەکان لە »گواتیملا» لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ و بزووتنەوەی چریکی شاری لە ئاراژانتین دانابوو. (٢٣)

بنەڕەتی بیری «ترۆتسکیزم» دەتوانین لە کتێبی «شۆڕشی بەردەوام» (١٩٦٢، ١٩٣٠) و «مێژووی شۆڕشی ڕووسییە« (١٩٥٢، ١٩٣٢) بدۆزینەوە، کە هەر دووکیان پاش دژایەتی ئەو لەگەڵ سیاسەتی «ستالین» کە بانگەشەی سوسیالیزم بۆ یەک وڵاتی دەکرد لە ساڵی ١٩٢٣ و لە پاش دەرکردنی ئەو لە حزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت لە ساڵی ١٩٢٧ نووسیویەتی.

خوێندنەوەی ترۆتسکی لە بابەت گەشە، دەتوانین سەرەتا لە تیۆریی «شۆڕشی بەردەوام»دا بدۆزینەوە کە بە باوەڕی خۆی لە مارکسەوە وەریگرتووە:

***«شۆڕشی بەردەوام» بەو واتایەی، کە مارکس بە کاری دێنێ، شۆڕشێکە کەوا هیچ ئاشتبوونەوەیەک لەگەڵ هیچکام لە فۆرمە زاڵە چینایەتییەکان ناکات، هیچ وەستانێک لە قۆناغی دیمۆکراتیکدا نییە و لە چالاکی سوسیالیستی و تەنانەت شەڕ لە بەرامبەر دژکردەوەکانی دەرەکی کەڵک وەردەگرێ. بەواتایەک، شۆڕشێکە کە هەرکام لە قۆناغە یەک لەدووای یەکەکانی ئەو ڕیشەی لە قۆناغی پێشتردایە و تەنیا بە لەنێوبردنی یەکجاری کۆمەڵگەی چینایەتی سەرکەوتن بە دەست دێنێ.*** [٢٤]

ترۆتسکی دژایەتی ئەو هەوڵانەی دەکرد کەوا بە مەبەستی دامەزراندن و پاراستنی قۆناغی چاکسازیی دیمۆکراتیک، ئەنجام دەدران و باوەڕی وابوو کەوا ئەرکە دیمۆکراتیکەکانی وڵاتە دواکەوتووە بورژوازییەکان لە سەردەمی ئێمە، ئەوان بەرەو دیکتاتۆری پڕۆڵتاریا ڕێنوێنی دەکات و دیکتاتۆری پڕۆڵتاریا هەروەها ئەرکە سوسیالیستییەکان لە بەرنامەی خۆی دادەنێت. هەربۆیە، قۆناغی دیمۆکراتیک تەنیا قۆناغێکی تێپەڕبوونە و چاکسازیی سوسیالیستی کۆمەڵگە، دوواهاتی ڕاستەوخۆی «دۆخی بەردەوامی گەشەی شۆڕشگێڕانە«یە. [٢٥]

ترۆتسکی شۆڕشی سوسیالیستی وەکو بەشێک لە ڕەوتی پێشڕەو دادەنێ کە لەوێدا هەر قۆناغێک لە گۆڕانکارییەکان لە قۆناغی پێش خۆی سەرچاوە دەگرێ و گشت پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت. بە ڕای ئەو شۆڕشی سوسیالیستی لە ئاستی نەتەوەییدا دەست پێدەکات و بۆ وڵاتانی دیکە، بە تایبەت وڵاتە پێشکەوتووەکان، تەشەنە دەکات: «شۆڕشی نەتەوەیی بە خۆیەوە نابەسرێتەوە، بەڵکو تەنیا بازنەیەک لە زنجیرەی نێونەتەوەییە.» [٢٦] دووەم بابەت لە چەمکەکانی گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی لە ڕوانگەی ترۆتسکییەوە، شتێکە کەوا خۆی ناوی «یاسای گەشەی نایەکسان و تێکەڵ»ی لێناوە. لە یەکەم لاپەڕەکانی کتێبی مێژووی شۆڕشی ڕووسییە، بەڵگە دێنێتەوە کە وڵاتە دواکەوتووەکان بە ناچاری ڕێگەی وڵاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارییەکان ناگرنەبەر. ڕێگەی

ئەوان پێشتر دیاری نەکراوە. لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەوان لە ڕێگەی خۆیانەوە لە هەندێک قۆناغدا بەرەو سوسیالیزم هەنگاو بنێن: «گەشەی ئەوان بە گشتی خاوەن تایبەتمەندی بێ بەرنامەبوون، تێکچنراوبوون و تێکەڵبوونە.»[٢٧]

***نایەکسانی، وەکو گشتیترین یاسای ئەو پرۆسە مێژووییە، خۆی لە فۆرمێکی خراپ و تێکچنراو لە چارەنووسی وڵاتە دواکەوتووەکان دەردەخات. لەژێر گووشاری دۆخی بیانی، کولتووری دواکەوتووی ئەوان ناچارە چەند قەڵەمبازێک لێدات. کەوایە، لە یاسای گشتیی نارێکیدا، یاسایەکی دیکە دەردەچێت و بە هۆی نەبوونی ناوێکی باشتر، دەتوانین وەکو یاسای «گەشەی تێکەڵاو» ناوی بەرین کە مەبەست، لە لای یەکدانانی قۆناغە جیاجیاکانی یەک جووڵە، تێکەڵکردنی هەنگاوە جیاجیاکان و دەستێوەردانی فۆرمە کۆن و نوێییەکانە.***[٢٨]

ئەم باوەڕانە لەگەڵ تیۆریی «شۆڕشی قۆناغ بە قۆناغی ستالین» دژایەتی بوو. تیۆریی «ستالین» لەسەر ئەم باوەڕە بوو کەوا «شۆڕشی دیمۆکراتیک لە وڵاتە دواکەوتووەکان، بەشێوەی سەربەخۆ و جیا لە شۆڕشی پرۆڵتاریا ڕوو دەدات». ئەوان هەروەها لە بەرامبەر پێداگری ستالین لەمەڕ ئەگەری سوسیالیزم لە یەک وڵات واتە ڕووسییە راوەستابوونەوە. لەبابەت ئەم روانگەیە ترۆتسکی، ئاماژە بە بەڵگەکانی لێنین لەسەر «بەدواکەوتنی» ڕووسییە لە بازاڕی نێونەتەوەیی دەکات: «هەر کەسێک کە لە لایەن ئێمەوە خۆی رازی بە پاشکۆبوون بە بازاڕی جیهانییەوە دەکات (لێنین ڕاستەوخۆ باس لە ملکەچبوونی ئێمە لە بەرامبەر بازاڕی جیهانی دەکات). . . . بەم چەشنە لاوازیی هزری وردە بورژوازی خۆی لە بەرامبەر بازاڕی جیهانی دەردەخات».[٢٩] بە باوەڕی ترۆتسکی سەرکەوتنی سوسیالیزم بە شۆڕشی جیهانییەوە گرێ دراوە. کەوایە شۆڕشە پرۆڵتارییەکان لە وڵاتە پێشکەوتووەکان تەشەنە دەکات و وڵاتە دواکەوتووەکان هەروەها لەوانەیە یەکەم وڵاتانیک بن کە شۆڕشی پرۆڵتاریا، هەڵدەگیرسێنن، بەڵام دوایین وڵاتن کە بە سوسیالیزم دەگەن. وڵاتە

دواکەوتووەکان دەبێ وزە بەرهەمهێنەرەکانی خۆیان، لە ڕەوتی دامەزراندنی شۆڕشی پڕۆڵتاری و هەوڵ بۆ سەقامگیری سوسیالیزم، پەروەردە بکەن.

بە گشتی و بە کورتی ئەوەی لەم نەسکە بۆمان دەردەکەوێ ئەوەیە کەوا مارکس بە تێبینییەکانی خۆی لەسەر سەرمایەداری و گوتنی ئەوە کەوا سەرمایەداری لە وڵاتە دواکەوتووەکان دەتوانێ لە لایەک وزەیەکی پێشکەوتوو بێت و لە لایەکی دیکە دواکەوتوو بێت، خەریکی پێشبینی کردنی بۆچوونی سەردەم لەمەڕ گەشەسەندن و گەشەنەسەندوویی بووە. بە ڕای ئەو لایەنی پێشکەوتووی سەرمایەداری دۆخی ماددی باشی بۆ سازدانی سەرمایەداری پێشکەوتوو لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە، بەڵام لایەنی دواکەوتووانەی سەرمایەداری بەم چەشنەیە کەوا سەرمایەداری سەوداگەر بێ ئەوەی مەجبوور بێ شکڵ و فۆڕمە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان بگۆڕێت و دابەشکاریی کاری نوێساز بکات کە نیشاندەری سەرمایەداری پیشەسازیی ئەمڕۆیە، تەنیا خەریکی سستکردن و لاوازکردنی فۆڕماسیۆنی پێش سەرمایەداری بووە. مارکس جەخت لە سەر پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەکات تا گرینگیی شیکردنەوە چینایەتییەکان نیشان بدات. لێنین هەروەها سەرقاڵی پەروەردەکردنی تیۆرییەک بوو کە لە بنەڕەتدا لە مارکسەوە وەریگرتبوو، بەپێی ئەم تیۆرییە دابەشکاری نێونەتەوەیی کار دەتوانی، دوو بەشی پیشەسازیی زاڵ و بەشی کشتوکاڵی و پاشکۆ لە جیهان ساز بکات. ئەو لە خوێندنەوەی خۆی لەمەڕ گەشەی سەرمایەداری لە ڕووسییە ئەم بابەتەی خستەجێ کە سەرمایەداری تەنانەت لە یەک وڵاتی دواکەوتووش لە حاڵی جووڵە دایە و گرینگتر لەوە ئەمە بوو کە بەرهەمهێنانی لە ڕووسییە بە شێوە جیاجیاکان نیشان دا.

لێنین پێش شۆڕشی ڕووسییە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە گەشەی سەرمایەداری لە ڕێگەی پێشکەوتن بەرەو سوسیالیزم بەدی دێت. لەگەڵ ئەوەشدا، پەرەسەندنی سوسیال دیمۆکراسی لە ئەورووپا و خێرایی و سەرکەوتنی پرۆسەی شۆڕشی ڕووسییە دەریخست، کەوا دەتوانرێ لە

ڕێگەی گەیشتن بە سوسیالیزمەوە بە ئاهەنگێکی خێراتر هەنگاو هەڵێنێ. دامەزراندنی دیمۆکراسی بورژوازی شتێک جگە لە قۆناغێکی تێپەڕاندنی کورت لە شۆڕش نییە و، دەرفەت بۆ پڕۆڵتاریا دەڕەخسێنێ کەوا، دەسەڵات بە دەستەوە بگرێت. هەروەها زۆر لە باوەڕەکانی «مارکس» و «لینین» لەگەڵ بۆچوونەکانی«ترۆتسکی» کۆک بوون، بە چەشنێک کەوا پشتیوانیان لە شۆڕشی بەردەوام لە گشت جیهان و دەسەڵاتداریتی پڕۆڵتاریا لە وڵاتە دواکەوتووەکان دەکرد. لەو پڕۆسە شۆڕشگێڕییەدا دەتوانین لە هەندیک قۆناغ باز دەین. بەڵام تەنیا قەڵەمبازدانی پڕۆڵتاریا لە وڵاتە پێشکەوتووەکانە کە ڕێگە بۆ سوسیالیزم لە ناوچە دواکەوتووەکان دەکاتەوە. ترۆتسکی ئەم بۆچوونەی لینین پەسەند دەکات و دەڵێ شێوە جیاجیاکانی بەرهەمهێنان دەتوانێ لە وڵاتە دواکەوتووەکانی وەکو ڕووسییە بوونی هەبێت و ئەوەشی پەسەند کردبوو کە پاشکۆبوون بە بازاڕی جیهانی دەبێتە هۆی لێڵکردنی هەڵوێستەکانی سوسیالیزمی ڕەسەن لەم وڵاتانەدا.

## پەراوێزەکان:

١- لەو بابەتەوە لە پەرتووکەکانی مارکس و ئینگلسدا، بەرگی ٢٥ لا ٣٤٤ – هاتووە »بازرگانی کاریگەری وێرانکەری لەسەر رێکخراوی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕەکانی بەرهەمهێنانی کۆلۆنییەکان لە گشت شوێنەکان دادەنێ». . . . بەڵام کام شێوازی بەرهەمهێنانی نوێ جێی شێوازی بەرهەمهێنانی پێشوو دەگرێتەوە، ئەوە پێوەندییی بە بازرگانییەوە نییە. بەڵکو پێوەندییی بە تایبەتمەندیی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی کۆنەوە هەیە«.

٢- کارل مارکس، گروندریسە »مبانی انتقاد بر اقتصاد سیاسی« ص٣٩.

3- Marx Karl: ***Des Kapital*** Bd. 3. NEW Bd 25 S. 92;Marx. Ebd:S. 299.

٤- رجوع شود بە کارل مارکس «***کاپیتال***»، جلد سوم، مجموعە آثار بە زبان آلمانی، جلد ٢٥، و٢٠٢ و. . .

٥- کارل مارکس، ***« نقد برنامە گوتا»و مجموعە آثار مارکس***، جلد ١٩. ص ٢٨.

٦- مارکس، ***مجموعە آثار مارکس / انگلس***، جلد ٢٨، ص ٨٠٣.

7- Paul Baran , Politische Okonomie des wirtschafalichen Neu wibd/ Berlin: luchterhand 1966 S. 201.

٨- بە نقل از: رونالد اچ: چیلکوت، ***نظریە های توسعە و توسعە نیافتگی***، تهران، انتشارات علوم نوین.

9- Lenin. ***Dea imperialismus als Hochstes des capitalismus*** ,Berlin/ Diclzverlag 1970.

10- Lenin :***Ebd***. S. 95

١١- برای اطلاع بیشتر رک: کاردوزو « ***وابستگی و تکامل سرمایە داری در آمریکای لاتین***»، در زنگهاوس، صفحات ١٩٠-١٨٠

١٢- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٦١

١٣- ***هەمان سەرچاوە***، س ٢٧٢

١٤- هیلفردینگ، ***« سە رمایە داری مالی ١٩١٠ »***، فرانکفورت ١٩٦٨، ص ٣٨٠.

١٥- هیلفردینگ، ***هەمان سەرچاوە***، لا ٣٨٥.

١٦- نیکولاس بوخارین (١٩٣٨-١٨٨٨) ڕۆڵی لە نووسینی پەرتووکی «ئەلف و بێی کۆمۆنیزم»دا بوو. لە ساڵی ١٩٢٨ بۆ دژایەتی کردن لە بەرامبەر «ستالین» ڕێبەرایەتی ئۆپۆزیسیونی گرتە ئەستۆ و لە ساڵی ١٩٢٩ لە حزبی کۆمۆنیزم دەرکرا و دواتر لە ساڵی ١٩٣٨ لە سێدارە درا.

17- Lenin, ***Sozial demokratische Revolutionare Regierung*** , Werhe Bd/24/S. 218.

١٨- ئەو ناوە لە »نارود» بە واتای «جەماوەر یان خەڵک» وەرگیراوە و بەو شۆڕشیيانەی روسیا دەگوترا کەوا ئایدیالەکانی سوسیالیستییان هەبوو، بەڵام لە ڕکەبەرییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان بەدژ «تێزاریزم» پشتیان بە چینی جوتیار دەبەست.

19- Lenin. ***Ebd***:220

20- L. Trotezki, Die ***Permanette revolution***,Berlin , Wilnersdorf. 1930.

21- Trotezki , L. ***Ebd***:201

22- Stalin, ***DER Marxismus und die frage der sprachwissenschalt***, Berlin,D. D. R. 1655,S. 29.

٢٣- «لیۆن ترۆتسکی» لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی «ئیسکراو پراودا» بوو. لە ساڵی ١٩٢٠ ئابووری شەڕی داڕشت. لە پاش لینین لەسەر ڕێبەرایەتی حزبی کۆمۆنیست دژایەتی لەگەڵ ستالین کرد و شکستی خوارد. لە ١٩٢٩ لە حزبی کۆمۆنیست دەرکرا و لە سۆڤییەت دوور کراوە و بوو بە پەنابەری مەکزیک. لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٩٤٠ لە لایەن یەکێک لە بەکرێ گیراوانی ستالین بە تەور کوژرا.

24- Trotezki, ***EBD***,s. 234.

25- Lenin,***Staat und Revolution***,S. 269.

26- Lenin ,***Ebd***, S. 270.

٢٧- کارل مارکس، ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٨٠.

٢٨- کارل مارکس، ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٨٥.

٢٩- کارل مارکس، ***هەمان سەرچاوە***، لا ٣٢١.

# تیۆرییە کۆن و نوێیەکانی ڕێبازی نوێسازی

پـێش ئـەوەی کـە سـەرقاڵی مێـژوو و هـەروەها ڕیشـەکانی تیـۆریی نوێسـازی بـین، پێویسـتە وشـەی «مۆدێرنیزاسـیۆن» یـا نوێسـازی پێناسـە بکـەین و ڕوانگـە جیاجیاکـان لێـک بدەینـەوە. لـەوە دەچێـت پێناسـەکردنی نوێسازی چ لە لایەنی وشـەیی و چ لـە لایـەنی ڕوانگە جیاجیاکانەوە، باش و بەکەڵک بێت.

وشـەی لاتینـی «Modernization» (مۆدێڕنیزاسـیۆن) لـە وێـژەی کوردیـدا مانـای نوێسـازی، مۆدێرنبـوون، ئـەمڕۆییبوون، نوێکردنـەوە، تازەکـاری، تازەباوگەری و. . . دەگەیەنێ. ئەم چەمکە لە وشەی لاتینی «Modo» (مۆدۆ) بە مانای هەر ئێستا وەرگیراوە و پاش شەڕی جیهانیی دووەم لە دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ وەکـو شـێواز و ڕێبـازێکی زاڵ لـە وێـژەی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکان پێشکەش کراوە. (١)

«ئێزنشتاد» بۆ پێناسەکردنی نوێسازی دەڵێ:

***لە لایەنی مێژووییەوە، نوێسازی پرۆسەی گۆڕان بەرەو چەشنێک لە سیستەمە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکانە کەوا لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوور لە سەدەی هەژدەیەم تاوەکو سەدەی نۆزدەیەم فۆڕمی پێدراوە و هەروەها گەشەشی سەندووە و لە سەدەی بیستەمدا لە وڵاتانی وەکو ئەمریکای لاتین، ئاسیا و ئەفریقا پەرەی سەندووە. (٢)***

«ویلبێـرت مـۆر»، نوێسـازی وەکـو گۆڕانکـاری «گشـتی» کۆمەڵگـەی نەریتی یان پێش مۆدێڕن و پێوەندیی ئەو لەگەڵ جیهانی مۆدێڕن چاو لێ دەکات. (٣) «سیریل بلەک » نوێسازی وەکو پرۆسەیەکی مێژوویی دەبینێ کـەوا لەوێـدا ڕێکخراوەکـان بـە خێرایـی کـارکردە جیاجیـا و بگۆڕەکـان وەردەگـرن کـە ئـەوەش بـە هـۆی زۆربـوونی بـێ وێنـەی زانسـتی مـرۆڤ و

کۆنترۆڵ لەسەر هێزە سروشتییەکانە و ئەمەش لەگەڵ شۆڕشی زانستی، هاوکاتە«. [٤]

«ڕۆبێرت وارد»، نوێسازی وەکو جووڵەیەک بەرەو کۆمەڵگەی نوێ پێناسە دەکات و بە باوەڕی ئەو تایبەتمەندی کۆمەڵگەی نوێ بەم جۆرەیە: «توانایی یەکجار زۆر بۆ کۆنترۆڵکردن یان کاریگەری دانان لەسەر دۆخی سروشتی و کۆمەڵایەتی چوارچێوە و بە پێی سیستەمی بەهادان کە بە باشبوون و ئەنجامەکانی ئەم توانایە گەشبینە». [٥]

«دانییەل لێرنێر» لە زانیارینامەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە ژێر ناوی «مۆدێرنیزاسیۆن» دەنووسێ: «مۆدێرنیزاسیۆن» وشەیەکی بەکارهاتوو بۆ پرۆسەیەکی کۆنە؛ یانی پرۆسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەک کەوا ئەو وڵاتانەی هێشتا گەشەیان نەکردووە، تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان بە دەست بێنن». [٦]

«گابریەل ئالمۆند» و «جەیمز کۆلمەن» نوێسازی وەکو پرۆسەیەک دەزانن کەوا بە هۆی ئەو، سیستەمە سیاسییە نەریتییە نارۆژئاواییەکان خاوەن تایبەتمەندییە هاوشێوەکانی کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان دەبن. تایبەتمەندیگەلێک کەوا ئەوان بۆ مۆدێڕنیزاسیۆن (نوێسازی) دیاری دەکەن، بریتییە لە پلەی بەرزی شارنشینی، بەرزبوونی ئاستی خوێندەواری و داهاتی هەرکەسی، جمووجۆڵی پان و بەرینی جوگرافیایی و کۆمەڵایەتی، پیشەییبوونی ئابووری تاڕادەیەکی زۆر، تۆڕە بەر فرەوانەکانی ڕاگەیاندنە گشتییەکان و بە گشتی بەشداری پانوبەرینی ئەندامانی کۆمەڵگە لە چالاکییە سیاسی و ناسیاسییەکان. [٧]

پیتر وڕسلی دەڵێ:

***نوێسازی ئاماژەیە بۆ سەرجەم ئەو گۆڕانکارییانە کەوا لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی هاوکات لەگەڵ بابەتی «بە پیشەسازیبوون» لە زۆر لە وڵاتە خاوەن شارستانییەتە ڕۆژئاواییەکان ڕووی داوە؛ لەوانە: شارنشینی، گۆڕانکاری لە بنەمای کار و پیشە، جێگۆڕینەوەی کۆمەڵایەتی،***

***گەشەسەندن، فێرکاری و پەروەردە و، هەروەها گۆڕانکارییە سیاسییەکان بە شێوەی لابردنی ڕێکخراوە ڕەها و زۆردارییەکان و هاتنە سەر کاری دەوڵەتە بەرپرس و هەڵبژاردەکان و هەروەها گۆڕینی سیستەمی ڕەهای بەشی هەرکەسی و نیشتەجێکردنی دەوڵەتێکی خۆشگوزەرانی مۆدێرن.*** [٨]

«فرانسیس ئابراهام» لە کۆی پێناسەکانی نوێسازیدا، ئەوی وەکو پرۆسەیەکی ئاڵۆز و چەند لایەن بۆ گەشەی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و گۆڕانکاری لە بۆچوون و شۆڕشی راگەیاندندا پێناسەکردووە؛ بەڵام خۆی دەڵێ: ئەم پێناسەیە گشت لقەکانی نوێسازی لە خۆ ناگرێ. ئەو لە جێیەکی تردا دەڵێ: نوێسازی، پێناسەیەکی بەردەوام و هەمەلایەنە و تەواوە کەوا لەسەر لایەنە جیاجیاکانی ژیان، کاریگەری دادەنێت [٩].

بە گشتی ئابووریزانەکان کەڵکوەرگرتنی مرۆڤ لە تەکنۆلۆجیا، بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سروشتییەکان و توانایی فرەوانکردن و پەرەسەندنی دەرهاتووی هەرکەسی بە نوێسازی دەزانن. کۆمەڵناسەکان و مرۆڤ ناسەکان، سەرقاڵی خوێندنەوەی گۆڕانکاری لە بنەماکان و سازدانی بنەمای نوێ بۆ ئەرکە نوێیەکان و هەروەها پەسەندکردنی جیاوزای و سازکردنی پیشە نوێیەکانن. هەروەها لایەنە نەرێنییەکانی نوێسازی وەکو نەخۆشییە دەروونییەکان، کێشە باسکراوەکانی خەسارناسیی کۆمەڵایەتی و. . . دەخەنە بەر لێکۆڵینەوە؛ لە ڕوانگەی لێکۆڵەرانی زانستە سیاسییەکانەوە، مەبەست لە نوێسازی، چۆنێتی فرەبوونی گۆڕان و وڵامدانەوە بە داخوازییەکان بۆ گۆڕان و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ مشتومڕە کۆمەڵایەتییەکانە.

بە سەرنجدان لەسەر پێناسەکانی ئاماژە پێکراو، ئێمە لێرەدا ئەم پێناسەیە بۆ نوێسازی پێشنیار دەکەین:

نوێسازی پرۆسەیەکی بەردەوام، درێژە پێدراو و هەمەلایەنە لە گەشەی ئابووری، جموجۆڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فرەوانبوونی کولتوورییە کەوا بە مۆدێلی خوارەوە دەردەکەوێ:




**بنچینەی مێژوویی ڕێبازی نوێسازی:**

بە ڕای «ئالوین ی. سۆ» لە کتێبی، «گۆڕانی کۆمەڵایەتی و گەشە«، ڕێبازی مۆدێرنیزاسیۆن لە لایەنی هزرییەوە سەرچاوەی لە »تیۆرییە تەکاملیەکان» (ئاڵ و گۆڕی تاک هێڵی) و «تیۆریی کارکردگەرایی» وەرگرتووە. لە تیۆریی تەکاملی گۆڕان هەموو کاتێک بەرەو مەبەستێکی پێشکەوتووتر هەنگاو دەنێ و ئەم گۆڕانە بە هێوری، کۆمەڵگەی سادە بەرەو کۆمەڵگەی تێکچنراو دەگۆڕێ. تیۆریی کارکردگەرایی «تالکۆت پارسۆنز» لەسەر ئەم باوەڕەیە کەوا کۆمەڵگە وەکو ئەندامی زیندووە و خاوەنی پاژگەلێکە کە هەر کام لەوانە کارکردی تایبەت بە خۆیان هەیە. تیۆرییە نوێسازییەکان زۆرتر لەم دوو سەرچاوە سەریان هەڵداوە.

بە واتایەکی تر ڕێبازی نوێسازی، هەر لە سەرەتای سازبوونی لە دەیەی ١٩٥٠ لە هەوڵی سازکردنی تیۆرییەکی ڕێکوپێک بووە. ئەم ڕێبازە بۆ ڕوونکردنەوەی نوێسازی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە هەر دوو تیۆریی «تەکاملی » و «کارکردگەرایی» کەڵکی وەرگرتووە.

**پێشینە تیۆرییەکانی ڕێبازی نوێسازی:**

"تیۆریی تەکامولی" توانیبووی قۆناغی تێپەڕاندن لە کۆمەڵگەی نەریتی بۆ کۆمەڵگەی نوێ و مۆدێرن لـە ئـەورووپای ڕۆژئـاوا و لـە سـەدەی نۆزدە، بـە باشی شی بکاتەوە، هەر بۆیە زۆربەی تیۆرییداڕێژان و لێکۆڵەرانی نوێسازی کەوتنە بیری ئەوە کەوا ئەم تیۆرییە دەتوانێ نوێسازی وڵاتانی جیهانی سێیەم بە باشی شی بکاتەوە [١٠]. جگە لەوەش، بە هۆی ئەوەی کە زۆربەی ئەندامە لێهاتووەکانی ڕێبازی نوێسازی وەکو «تالکۆت پارسۆنز»، «گابریەل ئالمۆند»، «دەیوید ئۆپتر»، «ماریان لۆی»، «نیل سملسر»و«سامۆئێل ئایزنشتات» لە چوارچێوەی تیۆریی کارکردگەراییدا خەریکی تیۆریی داڕشتن بوون، خوێندنەوەکانی ئەوان لەسەر بابەتی نوێسازی بە ناچاری بە شێوەیەک، قازانجیان لە تایبەتمەندییەکانی کارکردگەراکان وەرگرت. کەوایە سەرەتا پێویستە چاوێک بە میراتی تەکامولی و کارکردگەرایی بخشێنینەوە ـ کە ڕێبازی نوێسازی لێ کەوتۆتەوە. [١١]

تیۆریی تەکامولی، بەرهەمی بیری سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە و سەردەمی پاش شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەڕەنسایە. ئەم شۆڕشانە نەک هەر بوونە هۆی داڕمانی سیستەمی کۆمەڵایەتی نەریتی و کۆن، بەڵکو بنەمایەکیان بۆ سازکردنی سیستەمێکی نوێ ڕێکخست. شۆڕشی پیشەسازی لە ڕۆژئاوا بە هێنانە کایەی کاریگەری زانست و تەکنۆلۆجی یارمەتی بە زۆربوونی قازانجوەرگرتن، سەرهەڵدانی سیستەمی نوێی بەرهەمهێنانی کارگەیی و زاڵبوونی بازاڕی جیهانی گەیاند. شۆڕشی فەڕەنسا هەروەها سیستەمێکی سیاسی بە تەواویی نوێی لەسەر بنەڕەتی یەکسانی، ئازادی، لیبرالیزم و دیمۆکراسی پاڕلمانی پێک هێنا. [١٢]

تیۆرییداڕێژان و کۆمەڵناسە تەکامولییەکان کە لە خشتەی خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین بە دیتنی ئەم گۆڕانکارییە لە سیستەمە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکان، کەڵکیان لە دەربڕینە جیاجیاکان بۆ دیاری کردنی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە کۆن – نەریتی و مۆدێرنەکان وەرگرتووە.

**دەربڕینەکانی تیۆرییداڕێژان و کۆمەڵناسەکان لەسەر تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە نەریتی ومۆدێرنەکان**

| ناوی بیرمەند | کۆمەڵگەی نەریتی | کۆمەڵگەی مۆدێرن |
|---|---|---|
| هێربێرت سپەنسەر | میلیتاری (سەربازی) | پیشەسازی |
| ئێمیل دورکیم | میکانیکی | ئۆرگانیکی |
| فێردیناند تۆنیس | گمائینشافت (کۆمەڵ) (١) | گزلشافت (کۆمەڵگە) (٢) |
| ڕابێرت ڕێدفیلد | لادێیی | شاری |
| هووارد بەکرد | پیرۆز | دونیایی |
| لۆیی برۆل | پێش لۆژیکی | لۆژیکی |
| سوروکین و زلیرمەن | لادێیی | شاری |
| چارلز هۆرتن کولی | سەرەتایی | لاوەکی |

ئەم تیۆرییداڕێژ و کۆمەڵناسە کلاسیکانە، بابەتی نوێسازی و گەشەیان لە چوارچێوەی تیۆرییە گشتییەکانی گۆڕان و ئاڵوگۆڕی کۆمەلایەتی پێناسە کردووە و لە هەوڵی وڵامدانەوە بەو پرسیارە بوون کەوا کۆمەڵگە چۆن تووشی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕە پان و بەرینەکان دەبێت. «ئەوان جەختیان لەسەر سستی و جیایی نێوان کۆمەڵگەی کۆن و نوێ دەکرد و کۆمەڵگەی سەرمایەداریی ئەمڕۆیان لە لایەنی چۆنێتی وەکو چەشنێکی نوێ لە کۆمەڵگە دەزانی». (١٣)

ئەم جیاکارییە ئەوانی بەرەو پۆلێنبەندی دوو لایەنە یان چەند لایەنە لە بابەت کۆمەڵگە مرۆڤییەکان دەبرد. گومانێک لەوە دا نییە ئەم چەشنە پۆلێنبەندییانە لەسەر بنەڕەتی هۆکارە زاڵەکان، لە هەر کۆمەڵگە یان سەردەمی مێژوویی بوونی بووە، (١٤) بە هۆی ئەوەی کە لە ڕوانگەی

کۆمەڵناسییەوە دیاردە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەر کام ئاواز و تایبەتمەندی تایبەتی خۆیان هەیە و بە یەک شێوە گۆڕانیان بە سەردا نایەت. کەوایە دۆزینەوەی پەیکەرێکی پاک و بەرچاوی کۆمەڵگەی پیشەسازی، بێ ناپاکییەکانی کۆمەڵگەی نەریتی و هەروەها دۆزینەوەی پەیکەرێکی پاک و بەرچاوی کۆمەڵگەی نەریتی بێ ناپاکیەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازی لە جیهانی ئەمڕۆدا، ئەگەر نەڵێین مسۆگەڕ نییە، لانیکەم دەتوانین بڵێین دژوارە.(١٥)

بۆ باشتر ناسینی ئەندیشەی کلاسیکەکان لەمەڕ چۆنێتی تێپەڕاندنی مێژوویی کۆمەڵگەکان و یان بە واتایەکی دیکە پێشکەوتن و گەشەی کۆمەڵگەکان، بە کورتی ئاماژە بە بنەما هزرییەکانی هەر کام لەوان دەکەین.

### ١- ئاگۆست کۆنت

«ئاگۆست کۆنت» دانەری چەمکی کۆمەڵناسییە، کە لە هەوڵی پێشکەشکردنی "یاسای پێشکەوتنی مرۆڤ" لەسەر بنەڕەتی دۆخی ناسینی زاڵ لە هەر سەردەمێک دایە. ئەو دەیهەوێ بزانێ کەوا چۆن مرۆڤ پاش تێپەڕاندنی خولە مێژوویی و گۆڕانکارییەکان گەیشتۆتە سەردەمەی ئێستا. «کۆنت» پێشکەوتنی مرۆڤ بە سێ قۆناغی خودایی (ئایینی یان جادوویی)، متافیزیکی (مابعدالطبیعی) و زانستی (پۆزیتیڤ) دابەش دەکات. بە ڕای «کۆنت»، هەر کام لەم قۆناغە پێشکەوتنانە، لەگەڵ گەشەکردنی زەینی مرۆڤ فۆڕم دەگرن. سازبوونی هەر سیستەم و قۆناغێکی نوێ، تەنیا پاش لەنێوبردنی سیستەم و قۆناغی کۆن و پێکهێنانی کەرەسەکانی دەوڵەمەندکردنی زەینی شیمانەی هەیە.

ئەگەرچی جەختی «کۆنت» زیاتر لەسەر قۆناغەکانی گۆڕانی زەینی مرۆڤ و ئازادی پلەبەپلەی ئەو بوو، بەڵام لەسەر ئەم خاڵەش پێداگری دەکرد کەوا ئەم گۆڕانکارییانە لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوە جیاجیاکان و یەکە کۆمەڵایەتییەکان و دۆخی ماددی ژیانی مرۆڤ هەروەها

ڕوو دەدات. ئەو پێی وابوو کە بە پێی ڕوودانی ئاڵوگۆڕ لە گۆڕانی زەینیدا، گۆڕانکاری لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و دۆخی ماددی ژیانی مرۆڤ ساز دەبێت.[١٦]

بە ڕای کۆنت هەر سیستەم و قۆناغی مێژوویی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی، سەرکەوتنی سیاسی و چالاکی تایبەت بە خۆی هەیە کە دەتوانین لە خشتەی خوارەوە بیانبینین.[١٧]

| گەشەی هزری (تەکامول) | چەشنی یەکەی (ڕێکخراو) کۆمەڵایەتی | چەشنی دەسەڵات و یاسای سیاسی | چالاکی کۆمەڵایەتی |
|---|---|---|---|
| قۆناغی خودایی (ئایینی) | بنەماڵە | پیاوانی ئایینی و نیزامی | دەسەڵات (زاڵبوون) |
| قۆناغی متافیزیکی | دەوڵەت | پیاوانی کڵێسا و ماف ناسەکان | پاراستن |
| قۆناغی زانستی (پۆزیتیڤ) | چەشنی مرۆڤ | زاناکان، پسپۆڕەکان و بەڕێوەبەرانی پیشەسازییەکان | پیشەسازی |

ئەگەرچی کۆنت زۆرجار لەسەر ئەم خاڵە پێداگری دەکرد کەوا لە کاری لێدوان لەسەر پێشکەوتنی مرۆڤ، پێگەیشتنی هزری، بنەڕەتێکی سەرەکی دەژمێردرێ، بەڵام هۆکارەکانی تریش لەو کارە دەستیان هەیە: بۆ وێنە، کۆنت بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان ــ بەتایبەت لە قۆناغە سەرەتاییەکان ــ بە یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دادەنێت.

هەروەها ئەو دابەشکاری کار بە یەکێک لە بزوێنەرە بەهێزەکانی پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی دەزانێ. لە قۆناغی یەکەمدا، مرۆڤ لە ڕێگەی لێدوانە ئەوپەڕ سروشتییەکانەوە لە زانستی ڕەها دەگەڕێ؛ بە واتایەکی تر لەم

قۆناغەدا زەینی مرۆڤ زیاتر بە دوای ناسینی پێناسەی جەوهەری بوونەکان و هۆ سەرەتایی و کۆتاییەکانی هۆکردەکانە. لە قۆناغی متافیزیکی و ئەوپەڕ سروشتیدا مرۆڤ بە دوای ناسینی وزە دەرهەستەکانە و باوەڕی وایە کە ئەم هێزانە دیاردەکانیان خولقاندووە و لە قۆناغی سێیەم واتە قۆناغی سەلماندن (اثباتی) گەڕان بۆ پشت ڕاستکردنەوەی هەموو بابەتێکی گونجاو لەگەڵ یاسا زانستییەکان پێشکەش کراوە.

**٢- کارڵ مارکس:**

تێوریی «کارڵ مارکس» بە بەراورد لەگەڵ تێوریی کۆمەڵناسە کلاسیکەکانی دیکە سەرنجی زیاتری بە تێپەڕبوونی مێژوویی داوە. ئەگەر لە تیۆریی «ئاگۆست کۆنت»دا بابەت و تەوەرەی سەرەکی لێدوانەکان لەسەر گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و زانستی مرۆڤ بوو، لە تیۆریی مارکسدا بابەتی سەرەکی چۆنێتی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان یان بە واتایەکی ڕوونتر شێوەی بەرهەمهێنانە. (١٨)

مارکس قۆناغگەلێک لە مێژووی پێشکەوتن و تەکامولی مرۆڤ دەخاتە بەر چاو کە لەسەر تەوەرەی شێوەی بەرهەمهێنان دامەزراوە. ئەم قۆناغانە بریتین لە: سەردەمی هاوبەشی یان کۆمۆنی سەرەتایی، سەردەمی کۆیلایەتی، سەردەمی دەرەبەگایەتی، سەردەمی سەرمایەداری، سەردەمی سوسیالیزم وقۆناغی بەرز و کۆتایی کۆمۆنیزم. بۆ لێکدانەوەی هەر سەردەمێک دەبێ سەرنجێک بە پێشینەی پیشەکان وەکو (ئاژەڵداری، وەرزێڕی و پیشەسازی)، ئامێری کار و پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان بدەین. بە ڕای ئەو وزە نوێیەکانی بەرهەمهێنان و پێوەندییەکانی بەرهەمهینان لە خۆوە سەر هەڵنادەن. بۆچوونەکان لەخۆڕا لە ئاسمانەوە نایەنە خوارێ، بەڵکو لەنێو پێوەندییە بەرهەمهێنانەکانی هەبوو و دژایەتی لەگەڵ پێوەندییە قووڵ و نەریتییەکانی خاوەندارێتی ساز دەبن. هەر گرووپ و چینێک ئامێری بەرهەمهێنانی بە دەستەوە بێت دەسەڵاتدارێتیی سیاسیش دەخاتە چنگی

خۆیەوە. هەروەها هۆکاری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، دژایەتی و خەباتی دوو چینی سەرەکییە واتە خاوەندارانی ئامێری بەرهەمهێنان (وەکو ئاغاکان، خاوەن زەوییەکان و سەرمایەدارەکان) و خاوەندارانی وزەی کار (وەکو وەرزێڕان و کرێکاران). بەم پێیە گشت کۆمەڵگەکان تا گەیشتن بە قۆناغی بەرز و کۆتایی کۆمۆنیزم خاوەن بنەمای نەگۆڕی سیاسی ـ کۆمەڵایەتین، بەڵام پێوەندییەکانی نێوخۆی ئەم بنەمایانە بە پێی هەر سەردەمێکی مێژوویی، جیاوازی دەبێت.

بەگشتی کارڵ مارکس تیۆریی کۆمەڵایەتیی خۆی لەسەر پێشینەی مێژوویی و لەسەر شاهیدە دەست پێڕاگەیشتووەکانی تاقیکراو ـ مێژوویی دادەمەزرێنێ و خوازیاری ئەوەیە کەوا تیۆرییەکەی ئەو لەسەر ئەم پێوەرە هەڵسەنگێندرێ یان لێکبدرێتەوە.

**٣- هێربێرت سپەنسەر:**

لە نێوان کۆمەڵناسە کلاسیکەکان، بیرۆکەی ئەنداموارەبوون و تەکامولی کۆمەڵگە مرۆڤییەکان زۆرتر دەگەڕێتەوە بۆ «هێربێرت سپەنسەر» کۆمەڵناسی ئینگلیزی.[١٩] «سپەنسەر» لە پلانە پێگەیشتنەکەی خۆیدا دەڵێ؛ کۆمەڵگەکان لە حاڵەتێکی هاوشێوە و ساکار بە حاڵەتێکی ناهاوشێوە و تێکچنراو دەگۆڕێن. ڕوانگەی ئەو لە بابەت کۆمەڵگەدا ئەندامواره بوو و باسی لەسەر چەشنەکانی کۆمەڵگە وەکو کۆمەڵگەی سادە، کۆمەڵگەی تێکەڵ، کۆمەڵگەی تێکەڵەی دوو ئەوەندە و کۆمەڵگەی تێکەڵەی تێکچنراو دەکرد.[٢٠] بە واتایەکی تر سپەنسەر لە نێوان کۆمەڵگە سادەکان کەوا سەرۆکیان نەبوو، ئەو کۆمەڵگەیانەی کەوا سەرۆکی کاتییان هەبوو و ئەو کۆمەڵگەیانەی کەوا خاوەن سەرۆکی نەگۆڕ بوون، جیاوازی دادەنا.[٢١]

سپەنسەر جگە لە پۆلێنبەندی کۆمەڵگەکان بە پێی قۆناغی تەکامولی و ڕادەی تێکچنراوی ئەوان، ئەم کۆمەڵگەیانەی بە پێی چەشنی ڕێکخستن و ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتی بە دوو چەشنە کۆمەڵگەی میلیتاری

(سەربازی)وکۆمەڵگەی پیشەسازی دابەش کرد. کۆمەڵگەی یەکەم یان سەربازی بە نێوەندگەرایی توند و توێژبەندی کۆمەڵایەتی سست وەکو «کاستەکان» و نەبوونی سەربەخۆیی و ئازادیە تاکەکەسیەکان دیاری دەکرد. لە حاڵێکدا لە کۆمەڵگەی چەشنی دووەم (کۆمەڵگەی پیشەسازی) کەمبوونەوەی دەستێوەردانی دەوڵەت و بەرزبوونەوەی سەربەخۆیی و ئازادییە تاکەکەسییەکان دەبینرێ. تێپەڕبوون لە کۆمەڵگەی سەربازی بۆ کۆمەڵگەی پیشەسازی بابەتێکە کەوا کۆمەڵگە سەربازییەکان ناتوانن لێی هەڵێن و خۆی لێ لادەن و لە پرۆسەی گەشەسەندن و پێشکەوتندا پلەبەپلە جێبەجێ دەکرێ.(٢٢)

هەڵبەت مەبەستی «سپەنسەر» لە چەمکی کۆمەڵگەی پیشەسازی ڕێک ئەم شتە نییە کەوا ئەمڕۆکە لەسەر ئەم وشەیە دەرکی دەکەین، بەڵکو سپەنسەر کۆمەڵگە سادە و خاوەن تەکنۆلۆجی سەرەتاییەکانیش لە ڕیزی کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا دادەنێ، بە هۆی ئەوەی کە لەم کۆمەڵگەیانەدا جەخت لەسەر بەرهەمهێنانی ئاشتی خوازانە و شەڕنەخوازانەیە. (٢٣) جگە لەوەش، سپەنسەر نە بە ئاشکرا بەڵام ناڕاستەوخۆ ڕوونی دەکاتەوە کەوا لە ڕوانگەی تەکامولییەوە، کۆمەڵگە پیشەسازییەکان کە لەسەر بنەڕەتی هاریکاری و بەشداری ژیرانەی تاکە ئازادەکان دامەزراوە لە کۆمەڵگە سەربازییەکان کە لەسەر بنەڕەتی گوشار و زۆرداری دامەزراوە، بە سەرتر وپێشکەوتووتر دەزانی.

**٤- ئێمیل دۆرکیم:**

دۆرکیم، کۆمەڵناسی فەڕەنسی لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی خۆی بە ناوی «دابەشکاری کاری کۆمەڵایەتی»کە بابەتی تێزی دۆکتوراکەی بوو لە هەوڵی شرۆڤەکردنی چۆنێتی تێپەڕبوونی کۆمەڵگەکان لە قۆناغی نەریتی بۆ قۆناغی پیشەسازیدا بوو. بابەتی سەرەکی لە لای دۆرکیم بۆ تێپەڕبوون لە کۆمەڵگەی نەریتی بەرەو کۆمەڵگەی پیشەسازی لەنێوچوونی پێوەندییە

کۆنەکانی دامەزراوە لەسەر هاریکاری میکانیکییە. ئەم پێوەندییانە تاکەکانی کۆمەڵگەی پێش پیشەسازی بە یەکتر پەیوەند دەدات. لە کۆمەڵگەی نەریتیدا پێوەندییەکانی نێوان تاکەکان لەسەر بنەڕەتی هاوسێبوونی جێگەیی (مکانی) و ئاشنابوونی تاکەکەسییە کەوا لەگەڵ سەرهەڵدانی گۆڕانکارییەکان و سازبوونی کۆمەڵگەی نوێ و بە تایبەت شارنشینی لە یەک هەڵدەوەشێ.(٢٤)

ئەم ئاڵوگۆڕانە بۆتە هۆی گۆڕانکاری کۆمەڵگەی نەریتی و تاک چیتر ناتوانێ یارمەتی و ڕێنوێنی ڕۆحی و ڕەوشتی لە کڵێسا بخوازێ. ڕێکخراوە کۆنەکان کەوا ڕێنوێنی ڕەوشتیان دەکرد تووشی گەندەڵی بوون و شتێکی دیکە جێنشینی ئەوان نەبووە. دیاردەی تاکڕەوی کۆمەڵگەی پیشەسازی ناتوانێ ناڕێکییەکانی ڕوو لە زۆربوونی کۆمەڵگە چارەسەر بکات. دۆرکیم بۆ دەربازبوونی کۆمەڵگە لە کێشەی ناڕێکی، جەخت لەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوە نوێیەکان دەکات کەوا دەتوانن بەسازکردنی هاریکاری ئۆرگانیک، جێی هێز و کاریگەری ڕەوشتیانەی کۆن بگرنەوە. (٢٥)

دۆرکیم دەڵێ: « ئەوە یاسای مێژووە کەوا ئەو هاریکارییە میکانیکییە کە لە سەرەتادا تەنیا فۆرمی کۆمەڵگەی مرۆڤی بووە، پلەبەپلە شاشە جێ بهێڵێ و جێی خۆی بە هاریکاری ئۆرگانیک بدات تا زاڵبوونی خۆی بەسەر کۆمەڵگە مرۆڤییەکان بسەپێنێ.» (٢٦) بە ڕای دۆرکیم هۆکاری گۆڕان و گەشە و تێپەڕبوونی کۆمەڵگەکان لە هاریکاری میکانیکی بۆ هاریکاری ئۆرگانیکی «دابەشکاری کاری کۆمەڵایەتی»یە. لە کۆمەڵگەی دامەزراو لەسەر پێوەندیی میکانیکی تاک لە ڕێگەی خزمایەتی، پابەندبوونی توند بە نەریتەکان و گوێ ڕایەڵی تەواو لەسەر ڕەوشت و خووەکان و هەروەها گوێ ڕایەڵەی کوێرانە بۆ سەرۆک عشیرە وەکو هێما و نیشانەی بوونی ئەو کۆمەڵە، لەگەڵ کۆمەڵگەی خۆی پێوەندیی ساز دەکات و هیچ نێوبژیوانێک وەکو حزب یان ئاژانس لە نێوان ئەو و کۆمەڵ بوونی نییە.

هەروەها لەو کۆمەڵگەیەدا ڕواڵەتێکی نەنووسراو لە هیرارشی کۆمەڵایەتی و دابەشکارییەکانی نێوخۆیی هەیە کە دووپاتکەرەوەی هیچ

چەشنە دابەشکاری کار یان بڵاوکردنەوەی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان نییە. هەر یەکەی بچوکتر، خۆی کۆیەکی جیای تێکەڵ لە گشت ڕۆڵە بەرچاوەکان و گشت چەشنە چالاکییە ئابوورییەکانە. بەم شێوەیە ڕۆڵە سیاسییەکانیش هێمایانە و ساکارن وەکو؛ سەرۆک عەشیرە یان لە ئاستێکی بەرینتردا پادشایەک بە دامودەزگاگەلی کەمتر. بەڵام لە کۆمەڵگە ئەمڕۆییەکاندا ڕۆڵەکان دیاریکراون و پێوەندیی تاکەکان لە ڕێگەی ڕێکخراوە نێوبژیوانەکان وەکو ئاژانس، سەندیکا و حزب جێبەجێ دەکرێ. سیستەمی سیاسی هەر بەم شێوەیە تێکچنراوترە و بنەماکان لە یەک جیا دەبنەوە. بە ڕای دۆرکیم، دەوڵەتە نوێیەکان لە بنەڕەتدا ئاکامی ڕاستەوخۆی دابەشکاری کاری کۆمەڵایەتین کەوا لە ڕووبەری سیاسەتدا بە شێوەی سازبوونی دامودەزگا و ڕێکخراوە تایبەتییەکان خۆیان نیشان دەدەن.

بە گشتی ئەو جیاوازییانەی کەوا دۆرکیم لە نێوان کۆمەڵگە نەریتییەکانی پێکهاتوو لەسەر هاریکاریی میکانیکی و کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی دامەزراو لەسەر بنەمای هاریکاریی ئۆرگانیک دایدەنێ لە خشتەی خوارەوە دەتوانین سەرنجی پێ بدەین.(٢٧)

| کۆمەڵگەی نەریتی دامەزراو لەسەر هاریکاری میکانیکی | کۆمەڵگەی پیشەسازی دامەزراو لەسەر هاریکاری ئۆرگانیکی |
| --- | --- |
| - دابەشکاری کاری سادە | - دابەشکاری کاری تێکچنراو |
| - کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی نارەسمی توند | - نەبوونی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی نارەسمی |
| - پابەندبوونی توند بە داب و نەریتەکان | - پابەند نەبوون بە داب و نەریتەکان |
| - نەبوونی ڕێکخراوە نێوبژیوانەکان وەکو حزب و سەندیکاکان | - بوونی ڕێکخراوە نێوبژیوانەکان وەکو حزب و سەندیکاکان |

| | |
|---|---|
| - هاریکاری لەسەر بنەڕەتی هاوڕەگەزی میکانیکی | - هاریکاری لەسەر بنەڕەتی هاوڕەگەزی ئۆرگانیکی |
| - لەیەک چوون و هەستی شوناسی هاوبەشی | - جیاوازی کارکردی |

**٥- ماکس ڤێبر:**

ڤێبر، کۆمەڵناسی ئاڵمانی بە پشکنینی بنەما و بنەڕەتەکانی سەرهەڵدان و پەیدابوونی سەرمایەداری و هۆکارە کاریگەر و پێکهێنەرەکانی سیستەمی سەرمایەداری لە ڕۆژئاوا، چۆنێتی گەشەسەندن و "بەپیشەسازی بوونی" کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکانی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە و لەم پشکنینەدا هەروەها لێدوانی لەسەر بابەتگەلێکی وەکو عەقڵانییەت و دەسەڵات ئەنجام داوە و لەسەر بنەمای ئەم بابەتانە قۆناغگەلێکی وەکو «کۆمەڵگەرایی» و «بەکۆمەڵگەبوون»ی لە یەکتر جیا کردۆتەوە.

گشتیترین چەمکی بۆچوونی ماکس ڤێبر پرۆسەی «عەقڵانیبوونی» جیهانە. بە ڕای ئەو جیهان بەردەوام بەرەو «پرۆسەی عەقڵانیبوون» هەنگاو دەنێ. چەمکی عەقڵانییەت لە ڕوانگەی ڤێبر بە مانای پەرەسەندنی عەقڵانییەتی ڕێکخراوەیی یان ئامێری، لە ڕووبەری ژیانی بیانی یان کۆمەڵایەتییە و دیاردەگەلێکی وەکو فرەوانبوونی تێکچنراوی سیستەمی کۆمەڵایەتی، پەرەسەندنی بەڕێکخراوەییبوون، پەسەندکردنی ڕێکوپێکی و توانایی پێشبینی و کۆنترۆڵی ژیان، زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر چوار دەورە لە ڕێگەی پەرەسەندنی حەزە ئامێرییەکانی مرۆڤ سەبارەت بە سروشت، لەنێوچوونی هێزی وزە سەیر و ڕازاوەی و ناعەقڵانییەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی لە خۆ دەگرێ. ڤێبر لە ڕووبەری کۆمەڵگەدا باس لە چوار «چەشنی نموونەیی»کردە و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دەکا و بریتین لە: "کردەوەی عەقڵانی ئامانجدار"، "کردەوەی عەقڵانی لەسەر بنەڕەتی بەها"، "کردەوەی نەریتی" و "کردەوەی سۆزداری". (٢٨)

"کردەوەی عەقلانی ئامانجدار" کەوا نموونەکەی لە ژیانی ئابووریدا دەبینین و لەسەر بنەڕەتی حیسابکردنی پێوەندیی نێوان ئامراز و ئامانجە. لەم چەشنە کردەوەیەدا ئامانج و ئامراز هەر دووکیان نەرم و نەهێنن و دەتوانین بە سەرنجدان لەسەر دۆخی بگۆڕی ئەوان پیاچوونەوەیان تێدا بکەین. لە "کردەوەی عەقلانی لەسەر بنەمای بەها"کەوا زیاتر لە ڕووبەری ئایین و ڕەوشتدا خۆی نیشان دەدات، لەوانەیە پیاچوونەوە لە ئامێرەکان بکرێت، بەڵام پیاچوونەوە لە ئامانجەکان کەوا لەسەر بنەمای پرەنسیپ و بەهاکانە، گونجاو نییە. "کردەوەی نەریتی" کردەوەیەکی میکانیکییە و حیساب کردنی ئامراز و ئامانج لەوێدا بەدی ناکرێ. ئەم کردەوەیە لەسەر بنەمای لاساییکردنەوەی تەواو و گوێڕایەڵبوونی نائاگایانە لە داب و نەریتە دامەزراوەکان بەڕێوە دەچێت. لە کۆتاییدا "کردەوەی سۆزداری" و هەستیارانە هەروەها کردەوەیەکی ناعەقلانییە و بێ حیسابکردنی ئامانج و ئامراز جێبەجێ دەکرێت. ژیانی سۆزداری مرۆڤ بوارێکی ناڕێکوپێکە و پێشبینی لەسەر ناکرێ.[٢٩] ڤێبر لەسەر بنەڕەتی ئەم چەشنە پێوەندیی و کردەوانەی کەوا لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا هەیە، «پێوەندیی کۆمەڵی» لە «پێوەندیی کۆمەڵگەیی» جیا کردۆتەوە و باوەڕی وابوو کەوا »پێوەندیی کۆمەڵی» چەشنێک لە پێوەندیی کۆمەڵایەتییە کەوا لەسەر بنەڕەتی سۆزداری و زەینییەتی (نەریت و سۆز) تاکەکانی سەر بە یەک کۆمەڵ دامەزراوە و لە لایەکی ترەوە مەبەست لە »پێوەندیی کۆمەڵگەیی» پێوەندییەکە کەوا لەسەر بنەڕەتی ڕێککەوتن لە نێوان بەرژەوەندییەکاندا ساز بووە و بزوێنەری ئەم ڕێککەوتنەش بە هۆی عەقلانییەتی چەماوەی بە بەها یان بە ئامانجەوە ساز دەبێت. ڤێبر لەسەر ئەم باوەڕە بوو کەوا بە پێی ئاڵوگۆڕ لە کردەوە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان، واتە گۆڕان لە ڕەفتار و کردەوە نەریتی و سۆزدارییەکانەوە بۆ ڕەفتار و کردەوە عەقلانییەکان، بتوانێ گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگە مرۆڤییەکان بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.[٣٠]

## ٦- فێردیناند تۆنیس:

فێردیناند تۆنیس، کۆمەڵناسی ئاڵمانی، سەرقاڵی لێکۆڵینەوە لە مەڕ پرۆسەی گەشەسەندن و پێگەیشتنی ڕۆژئاوا لەسەر بنەڕەتی بنەما کۆمەڵایەتییەکان بوو. تۆنیس کۆمەڵگە جیاجیاکان بە پێی چەشنی پێوەندییە نێوخۆییەکان، چۆنێتی و ڕادەی یەک دەنگی، چۆنێتی و ڕادەی تێکچنراوی و چەند پێوەری دیکە بە دوو دەستەی سەرەکی دابەش دەکات؛ دەستەی یەکەم "گماینشافت" کە گونجاوترین هاوتای ئینگلیزی بۆ ئەو Communityیە و لە زمانی کوردی ڕەنگە هاوتای جەماعەت، گرووپی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵ بۆ ئەم وشەیە پەسەند بکرێت. ئەوی تریان بە "گزلشافت" ناو دەبا کە هاوتای ئینگلیزی ئەو Societyیە و هاوتای کوردی نێزیک بەو وشەیە »کۆمەڵگە«یە. گماینشافت دەربڕی ئەو کۆمەڵگەیانەیە کەوا لە ڕابردووی پێش مۆدێرنیتەدا بە شێوەی خێزانێکی گەورە یان عەشیرە و قەوم خۆی نیشان داوە و هەندێک لە دەرکەوتەکانی ئەو لە سەردەمی مۆدێرندا هەروەها دەبیندرێ. لە هەمان کات گماینشافت و گزلشافت دەتوانین وەکو دوو بەری پارەیەک (سککە) و دوو چەشنە پێوەندیی کۆمەڵایەتی هاوکات چاو لێ بکەین. پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە گماینشافت لەسەر بنەڕەتی سۆز، نەریت، خزمایەتی و دۆستی داڕێژراوە.(٣١) بە واتایەکی تر بنەڕەتی سروشتی گماینشافت «لە دابە ئاساییەکان، نەریتەکان و خەیاڵەکانی چینی ئاساییدا هەیە. . . بە پێچەوانە لە هەر جێگەیەک کەوا کولتووری شارنشینی گەشە دەکات و دەگاتە بەرهەم گزلشافت وەکو ئامێری پێویست خۆی دەنوێنێ».(٣٢)

لە گزلشافت چەشنی پێوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر و هۆکاری پێوەندیگرتنی ئەوان بە تەواوی جیاوازە. لێرەدا یارمەتی، هاریکاری، پشتیوانی، خۆشەویستی و سۆز جێی خۆیان بە ئەرک، ناچاری (الزام) و پێویستی دەدەن. حەز جێی خۆی بە نابەدڵ و خزمەتگەیاندن جێی خۆی بە بەرژەوەندی و قازانجوەرگرتن و پشتیوانی جێی خۆی بە ڕکەبەری دەدات و پێوەندی و هاریکاری کەوا لە گماینشافت حاڵەتێکی سروشتی، ڕەسەن و

میکانیکی هەبوو لە گزلشافت حاڵەتێکی دەسکرد، کارەساتی و ئۆرگانیکی بە خۆوە دەگرێ. لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە تۆنیس دەیهەویست هەمان بابەتە کەوا وەکو کۆمەڵگە ئەمڕۆیی و مۆدێرنەکان ناوبانگی دەرکردووە. لە کۆمەڵگە ئەمڕۆیەکان پێوەندیی تاک لە گەڵ کۆمەڵگە لە ڕێگەی ئەنجامی کرداری ڕێکخراوەیی، ڕێکخراوەکان، دامودەزگا و گرووپە لاوەکییەکان وەکو حزبەکان، سەندیکاکان، چینە ئابوورییەکان و هتد، جێبەجێ دەبێت.

کەوایە بۆچوونەکەی تۆنیس چاودێری بەسەر پێکهاتن و پێگەیشتنی قۆناغگەلێک لە مێژووی گەشەی مرۆڤ دەکات کەوا لە هەر سەردەم و قۆناغێکدا، پێوەندیی کۆمەڵایەتیی زاڵ و لە ئەنجامدا کۆمەڵگەی تایبەت بە خۆی ساز دەکات. لە ئەندیشەی تۆنیسدا ڕکەبەری (رقابت) بابەتێکە کەوا بە شێوەیەکی چالاکانە لە گزلشانت کە ڕۆحی تاکڕەوی بە سەریدا زاڵە، بوونی هەیە. لە گزلشافت پێوەندیی جەماوەر لەگەڵ یەکتردا بە شێوەی ڕکەبەری و بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندی تاکەکەسییە. هیچ هەستێکی هاوبەش بوونی نییە کە نەوەکان پێکەوە گرێ بدات. گرێبەست وەکو ئامێرێک بۆ پێناسەکردنی پێوەندیی نێوان تاکەکان دادەنرێت. لە جیهانی گزلشافتدا مرۆڤ ئەوانی تر وەکو ئەندامێک لە ئەندامەکانی کۆمەڵی خۆی وەرناگرێ، بەڵکو ئەوان وەکو ئامێرێک بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆی دەبینێتەوە.[٣٣] تۆنیس لە سەرەتای کتێبەکەی «کۆمەڵ و کۆمەڵگە» دەنووسێ: «گماینشافت (کۆمەڵ) حەزی بە هاریکاری سەرجەم مرۆڤەکان هەیە، ڕێک وەکو ئەو شتەی کەوا کڵێسای کاتۆلیک بانگەشەی بۆ دەکرد بەڵام گزلشافت (کۆمەڵگە) شاشەیەکە کەوا لەوێدا تاکە سەربەخۆکان لای یەکتر هەڵچنراون».

بە گشتی جیاوازیەکانی نێوان گماینشافت (کۆمەڵ) و گزلشافت (کۆمەڵگە) دەتوانین لە خشتەی خوارەوە نیشان بدەین:

| گزلشافت (کۆمەڵگە) | گماینشافت (کۆمەڵ) |
|---|---|
| کۆمەڵگەی پیشەسازی و مۆدێڕن | کۆمەڵگەی نەریتی |
| ڕکەبەری | یارمەتی، هاوکاری و پشتیوانی |
| زاڵبوونی چاودێری و کۆنترۆڵکردنی ڕەسمی | زاڵبوونی چاودێری و کۆنترۆلکردنی ناڕەسمی |
| یەک دەنگی و هاریکاریی ئۆرگانیکی | یەک دەنگی، هاریکاریی میکانیکی |
| شار، دەوڵەت | خێزان، قەوم و عەشیرە، دێهات |
| ڕۆحی تاکخوازی | ڕۆحی گشتی |
| کولتووری شارنشینی | کولتووری عشیرەیی، قەومی و لادێیی |
| هاریکاریی دەسکرد و کارەساتی | هاریکاریی ڕەسەن و سروشتی |
| بەرژەوەندی و قازانجخوازی | خزمەتگوزاری |
| خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیی دەستکەوتەیی | خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیی خزمایەتی |

**تایبەتمەندییەکانی تیۆریی کلاسیکی تەکامولگەرایی:**

بە لێکۆڵینەوە لەسەر چۆنێتی تێپەربوونی مێژوویی کۆمەڵگەکان لە ڕوانگەی کۆمەڵناسە کلاسیک و مۆدێرنەکانی وەکو ئاگۆست کۆنت، کارڵ مارکس، هێربێرت سپەنسەر، ئێمیل دۆرکیم، ماکس ڤیبر، فێردیناند تۆنیس، لۆی برۆدێل، چارلز هورتن کۆلی، هووارە بەکرد، سامنرمین و ڕابێرت ڕێدفیلد، و بە لەبەرچاو گرتنی پۆلێنبەندیە دوو لایەنەکانی ئەوان و هەروەها سەرجەم بۆچوونەکانیان دەتوانین بە چەند خاڵ ئاماژە بکەین:

یەکەم، گریمانەی بنەڕەتی ئەم ڕێبازە ئەمەیە کەوا ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی، پرۆسەیەکی یەک لایەنەیە، بە واتایەکی تر کۆمەڵگەی مرۆڤی بە شێوەیەکی نەگەڕاوە بەرەو یەک لا و لە قۆناغی سەرەتایی بۆ قۆناغی پێشکەوتووتر بەرەو پێش دەڕوات. (٣٤)

دووەم، تیۆریی باسکراو یەک دادوەری بەهادارانە بەم پڕۆسە تەکامولییە دادەسەپێنێ؛ بە واتایەکی تر هەنگاوهەڵێنان بەرەو قۆناغی کۆتایی، ئەرێنی و بەهادار گریمانە دەکرێ، بە هۆی ئەوەی کە دەربڕی پێشکەوتن، مرۆڤایەتی و شارستانییەتە. (٣٥)

سێیەم، کۆمەڵناسە تەکامول گەراکان وایان گریمانە دەکرد کەوا ئاهەنگی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، هێدی، لە سەرخۆ و پلەبەپلە و کەڵەکەییە؛ ئاڵو گۆڕەکانی کۆمەڵایەتی بە شێوەی تەکامولی سازدەبن نە بە شێوەی شۆڕشگێڕانە. چەند سەدە دەخایەنی تاوەکو کۆمەڵگەیەکی سادە و سەرەتایی بەرەو کۆمەڵگەیەکی تێکچنراو و مۆدێرن دەگۆڕدرێ.

چوارەم، وا هەست دەکرێ کە پۆلێنبەندییە دوو لایەنەکان ناتوانن گشت کۆمەڵگە مرۆڤییەکان چ لە ڕابردوو و چ لە ئێستادا لە خۆبگرن، بە هۆی ئەوەی کە بەم چەشنە کەوا ئێستا تێگەیشتنمان لە کۆمەڵگەکان هەیە پەسەندکردنی ئاوا بۆچوونێک لە لایەنی هزری و ئەزمونییەوە نامسۆگەرە. کەوایە پۆلێنبەندیی ئەوان چەشنە پۆلێنبەندییەکی گشتی و هەمەلایەنە و لەسەر بنەڕەتی ئەندامگەلی زاڵ لەهەر قۆناغ و سەردەمێکە و بە گشتی چەشنێک لە گشت بینی، بەسەر هزری ئەواندا زاڵ بووە. (٣٦)

پێنجەم، سەرجەم کۆمەڵناسە باسکراوەکان لە ژێر کاریگەری ئەم گۆڕانکارییانە بوون کەوا لە ڕۆژئاوادا سەریهەڵدابوو. ئەوان بە پشکنینی کەرەسەکانی پێکهێنەری ئەم گۆڕانکارییانە وەکو سازبوونی سیستەمی سەرمایەداری و کۆمەڵگەی مۆدێرن و پیشەیی، سەرقاڵی لێکدانەوە و لێدوان لەسەر دۆخی سیستەم و بنەما کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەکانی تر و بە تایبەت کۆمەڵگە نارۆژئاواییەکان بوون. (٣٧)

شەشەم، میراتی هزری و عەقڵانیی ئەم کۆمەڵناسە کلاسیکانە بە ئاشکرا کاریگەریی لەسەر هزری بیرمەندان و تیۆرییدارێژانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، لە چوارچێوەی فۆرمی تیۆریی نوێسازی، داناوە.

بەشێکی دیکە لە بنەما هزرییەکانی ڕێبازی نوێسازی، تیۆریی کارکردگەرایی «تالکۆت پارسۆنز» و درێژەدەرانی ئەم تیۆرییەیە کەوا چەمکەکانی ئەو وەکو سیستەم، کارکردە تایبەتەکان، هاوسەنگی خۆبونیاد و بگۆڕە نموونەییەکان ڕێگەی خۆی لەنێو بەرهەمی زۆربەی تیۆرییداڕێژانی نوێسازی کردۆتەوە.

پارسۆنز لە دەیەی ١٩٣٠ مامۆستای کۆمەڵناسی لە زانکۆی هارواردی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە. کاریگەری بنەڕەتی لەسەر زۆربەی کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان داناوە و تیۆریی کارکردگەرایی ئەو لە ژێر کاریگەری بەرهەمی سەرەکی ئەو بەتایبەت «بنەمای کردەی کۆمەڵایەتی» بڵاو بۆتەوە. پارسۆنز جگە لە کاریگەری وەرگرتن لە نەریتی دۆرکیم، هەروەها لە ژێر کاریگەری نەریتی ماکس ڤێبر دابوو. ئەویش وەکو «ڤێبر» لەسەر ئەو باوەڕە بوو کەوا کۆمەڵگەی مرۆڤی لە حاڵی عەقڵانیبووندایە و ئەم هۆکارە پێوەری جیاکردنەوەی کۆمەڵگە نەریتی و مۆدێرنەکان دەژمێردرێ. لە پرۆسەی عەقڵانیبوونی پلەبەپلە و بەردەوامدا، کۆمەڵگە پێشکەوتنی بەسەردا دێت و کرداری مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕوو لە بەرزبوونەوە بەرەو نەریتە عەقڵانییەکان دەچەمێتەوە. بە ڕای پارسۆنز باشترین شێوە بۆ تێگەیشتن لە گشت ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کەوا وەکو «سیستەم» لێی تێبگەین. [٣٨] بە ڕای «پارسۆنز» :

١- سیستەمی کۆمەڵایەتی وەکو یەک هەمەکی (کل)، خاوەن بەشی پێوەندییدار بە یەکتر لەوانە ڕێکخراوەکان و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانە.

٢- سیستەمی کۆمەڵایەتیی خاوەن ژیان و لە حاڵی بەردەوامی و مانەوە دایە.

٣- سیستەمی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەک داڕێژراوە کە ئەگەری پێوەندیی لەگەڵ سیستەمەکانی دیکەی هەبێت.

٤- سیستەمی کۆمەڵایەتی ڕووبەڕووی گرفتی بنەڕەتی لە دەرەوە و ناوەوە بووەتەوە. گرفتە بنەڕەتییەکان وەکو «پێداویستییەکان» یان

«داخوازییەکان» هۆی مانەوە و بەردەوامی ژیانی سیستەمەکانە. لەو حاڵەدا وردە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان و بەشە پێکهێنەرەکانی ئەوان، تەنیا لە ڕێگەی شێوەی بەشداری لە تێکڕای سیستەم و بە هۆی سەرنجدان بە پێداویستییەکان و داخوازییەکانی ئەوان ئاشکرا دەبن.

٥- سیستەمی کۆمەڵایەتی خاوەن تایبەتمەندی ڕێکوپێک و هاوسەنگە و لقەکانی ئەو پشت بەیەک دەبەستن. لەم ڕووەوە سیستەم دەبێ لە پشتیوانی سیستەمەکانی دیکە بەهرەمەند بێت و هەر لەو حاڵەشدا لە ڕێگەی بەشداری ئەندام و بەشەکانی خۆی بوون و مانەوەی هەبێت. حەز بە ڕێکوپێکی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی، بە هۆی بوونی میکانیزمی سەرەوە حاڵەتێکی خودکاری (ئۆتۆماتیک) هەیە و حاڵەتی سروشتی بە سیستەم دەدات.

٦- سەقامگیربوون و گۆڕان لە سیستەم، لەگەڵ یەکدایە، بە هۆی ئەوەی کە بەشە جیاجیاکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی کاریگەری دەخەنە سەر یەکتر و دەبنە هۆی پێکهێنانی سیستەم.

٧- سیستەمەکان بە هۆی ڕەوشی چوارچێوەیی (محیطی) سنواردار دەبنەوە. چونکە هەر سیستەمێک لە دۆخێکی چوارچێوەی و دەرەوەییدا جێگیر بووە و هۆکارگەلێک وەکو چوارچێوەی جوگرافیایی، سیستەمە کۆمەڵایەتییە بیانییەکان، سیستەمە بەهاکان و کولتووری سنوردارکەر، کاریگەری لەسەر کاری سیستەم دادەنێت.

٨- دوو تایبەتمەندی سیستەمەکان واتە پەسەندکردنی جیایی و پاشکۆبوونی بەرانبەر، دەست پێڕاگەیشتن بە هاوسەنگی نێوخۆیی سیستەم مسۆگەر دەکەن. بە هۆی ئەوەی کە سیستەمەکان وێڕای ئەوەی کە شوناسی سەربەخۆیان هەیە و کاروبارێکی تایبەت شوناسی ئەوان دەستنیشان دەکات لە ژێر کاریگەری پێوەندیی لەگەڵ بنەماکانی تری کۆمەڵگە و دۆخی دەرەوەیی لە کۆمەڵگە، حەز بە تێکەڵاوی و پشت بەستنی بەرانبەر

دەکەن. لەم ڕووەوە ئەم دوو بابەتە، ڕێخۆشکەرن بۆ هاوکاری لە نێوخۆی سیستەمدا.

٩- سیستەمەکان بەرەو سەربەخۆیی و خودموختاری هەنگاو دەنێن. هەر بۆیە لە لایەنی پشتبەستن و پێوەندیی نێوان پاژەکانی کۆنترۆلی جیاوازییە چواردەورەییەکان و کۆنترۆڵ کردنی حەزەکان، گۆڕان لە سیستەم لە نێوخۆوە مسۆگەر دەبێ.

١٠- سیستەمەکان دەتوانن (و دەبێ) بەشێکی بەرچاو لە پێداویستییەکانی چالاکوانەکان وڵام بدەنەوە و کۆنترۆڵێکی کەمتر لەسەر ڕەفتار و کردەوەی چالاکوانەکان بکەن. بەم چەشنە چالاکوانەکان لە نێوخۆی سیستەم ئازادی چالاکییان هەیە و هەر لەو حاڵەشدا ئەگەری کۆمەڵایەتیبوون بۆ کەسانێک کەوا دێنە ناو سیستەمەوە دەرەخسێنی. چالاکوانەکان لە ڕەوتێکی گشتی و هەمە لایەنەدا یارمەتی بە ساز بوونی بنەمای کۆمەڵگە دەکەن و ڕەوتی بە ڕێکخراوەیی بوون دابین دەکەن.(٣٩)

بە بۆچوونی «تالکۆت پارسۆنز» کۆمەڵگە هەروەها وەکو سیستەمە میکانیکی و ئۆرگانیکەکان زنجیرەیەک لە پاژەکانە کە لە نێوان ئەواندا پێوەندیی دوو لایەنە و بەرانبەر هەیە. وەها زنجیرە و سیستەمێک تەنیا پشت بە هێز و زۆر نابەستێ بەڵکو پشت بە میکانیزمە هاریکارییە تێکچنراوەکان و بەتایبەت بنەما ڕەوشتییەکان دەبەستێ. کۆمەڵگە سنورگەلێک دیاری دەکات تاوەکو هاریکاری و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بپارێزێ. ڕێکوپێکی *کۆمەڵایەتی، مرۆڤ بەرەو شارستانییەت و ئازادی ڕێنوێنی دەکات*، بۆیە گەشەی عەقڵانییەت لە مێژوودا بۆتە هۆی پێشکەوتن و زۆربوونی زانیاری، ئازادی و بەختەوەری مرۆڤ. بەم حاڵەشەوە دەسەڵات بەردەوام تا ئەو کاتەی بە خراپە کەڵکی لێ وەرنەگیردرێ بۆ بەردەوامی سیستەمی کۆمەڵایەتی پێویستە. هەڵبەت نابێ وەها گریمانە بکەین کەوا لە کۆمەڵگە ململانێ و مشت و مڕ ساز نابێ، چونکە هەڵکەوتە و دەگمەنی سەرچاوە و بەهاکان دەبێتە هۆی ڕکەبەرایەتی و لەم ڕکەبەرایەتییە شەڕ دروست دەبێ. لەبەر ئەوە

دابەشکاری سەرچاوە و بەهاکان یەکێک لە گرینگترین کێشەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتییە و بۆیە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی وەکو پێویستییەکی لێدێت.

بە باوەری تالکۆت پارسۆنز هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بۆ پاراستن و بەردەوامی خۆی چوار کارتاییبەتی (کار ویژە) سەرەکی هەیە کە دەبێ بەرێوەیان ببات. پارسۆنز ئەم کار تاییبەتانە وەکو مۆدێلی «AGIL» ناو دەبا و ئەم چوار کارتاییبەتە بریتین لە:

١) کارتاییبەتی سازگاری یان پاراستنی هاودەنگی و هاریکاری کۆمەڵایەتی،

٢) کارتاییبەتی گەیشتن بە ئامانج،

٣) کارتاییبەتی هاودەنگی یا پێکهێنانی هاریکاری و چارەسەرکردنی گرژی و ئاڵۆزی

٤) کارتاییبەتی سەقامگیری یا خۆگونجاندن لەگەڵ دۆخی بگۆڕ و نوێدا.

کارتاییبەتێک کەوا لەگەڵ چواردەورە سازگاری هەیە لە ڕاستیدا باس لە حەزی هەر سیستەمێک بۆ ئاشتی دانەوەی پێداویستییەکان لەگەڵ دۆخی بیانی دەکات. ئەم کارتاییبەتە بە ڕێکخراوگەلێکی وەکو ئایین، کولتوور و خێزان جێبەجێ دەبێ، وبە گشتی، سیستەمی بەهادانی کۆمەڵگە پێکدێنێ. کارتاییبەتی دووەم، دەربڕی ئەوەیە کەوا هەر سیستەمێک دەبێ ئامانجە سەرەتاییەکانی خۆی پێناسە بکات و کاری ئەم دەبێ لە پێناو گەیشتن بەم ئامانجانە بێت. ئەم کارتاییبەتانە ئاساییانە لە ڕێگەی سیستەمی سیاسییەوە جێبەجێ دەبێ. کارتاییبەتی سێیەم یانی کارتاییبەتی هاودەنگی و سازکردنی هاریکاری و چارەسەرکردنی گرژی بەو مانایەیە کەوا هەر سیستەمێک وێڕای ئەوەی کەوا ئەندامەکانی خۆی ڕێک وپێک دەکات دەبێ هەروەها پێوەندیی نێوخۆیی لە نێوان ئەوان یەکپارچە بکات. سیستەمی نۆرماتیک (هنجاری) و یاسایی لە هەر کۆمەڵگەیەک بەڕێوەبەری ئەم کارتاییبەتەن. لە بابەت دووایین کارتاییبەت یانی کارتاییبەتی سەقامگیری یان خۆگونجاندن لە

گـەڵ دۆخـی بگـۆڕ و نـوێ دەبـێ بگـوترێ ئـەم کارتایبەتـە لـە لایـەن ڕێکخراوەکانی سیستەمی ئابووری بەڕێوە دەچێت.

پارسۆنز باس لە چوار جۆر وردە سیستەمی پێوەندییدار بە یەکترەوە دەکات. ئەم وردە سیستەمانە بریتین لە: سیستەمی زیندەوەری، سیستەمی کەسایەتی، سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیستەمی کولتووری. (٤٠)

بە ڕای پارسۆنز، کۆمەڵگە بە ڕێزگرتن لە هاودەنگییە پێویستەکان خۆی سەرقاڵی هاوسەنگی خودموختار دەکات. لەنێو دەزگاکان، کردەوە بەرانبەرە نـەگۆڕەکان بوونیـان هەیـە کـە هاوسـەنگی خودموختـار دەپارێزن. کاتێـک دەزگایـەک تووشـی گۆڕانکـاری کۆمەڵایـەتی دەبـێ ئـەم ڕووداوە خـۆی زنجیرەیەک لە گۆڕانکاریە دژکردەوەکان لە دەزگاکانی تر ساز دەکا تاوەکو دیسـان هاوسـەنگی سـاز بێتـەوە. لـەمڕووەوە سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی «پارسۆنز» بوونەوەرێکی وەستاو و نەگۆڕ نییە، بەڵکو ئەم دەزگایانە کەوا وەکو پێکهێنەری سیستەم دەژمێردرێن، خۆیان بەردەوام لە حاڵی گۆڕان دان. (٤١)

و لـە کۆتاییدا تـاڵکۆت پارسـۆنز بـۆ کۆمەڵگـە نـەریتی و نوێیـەکان و بـە گشـتی بـۆ لێـدوان لەسـەر نوێسـازی، چـەمکی «بگـۆڕە نموونەییـەکانی» پێشکەش کرد. (٤٢) مەبەست لە بگۆڕە نموونەییەکان ئەوەیە کەوا لە ڕەوتی نوێسـازیدا چەشـنێک لـە کـردەوە یـان دۆخـەکان، بـە چەشـنێکی دیکـە دەگۆڕدرێن، بە واتایەکی تر، بگۆرە نموونەییەکان، پێوەندییە کۆمەڵایەتییە گرینگەکان لە بەستێنی سیستەمی کولتووری – واتە بەرزترین و گرینگترین سیسـتەم لـە چوارچێـوەی هـزری پارسـۆنز – لـە خـۆ دەگـرن و خـاوەن تایبەتمەندی بەردەوام بوون و دووپات بوونەوەن. پارسۆنز لە پرۆسەی نوێسازیدا باس لە پێنج دەستە بگۆڕی نموونەیی خوارەوە دەکات. (٤٣)

| نموونەکانی دۆخی نەریتی | نموونەکانی دۆخی مۆدێرن |
| --- | --- |
| – پێوەندییە سۆزدارییەکان | – پێوەندییە ناسۆزدارییەکان |
| – پێوەندییە تایبەت گەراکان | – پێوەندییە گشتی گەراکان |
| – بەرژەوەندییە گشتییەکان | – بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان |
| – پێوەندییە خزمایەتییەکان | – پێوەندییــــە دەســــکەوتەیی و شایان بووەکان |
| – تێکەڵاوی کارکردەکان | – جیابوونی کارکردەکان |

ئەم بگۆڕانە نیشاندەری ئەوەن کە لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا ڕەفتاری مرۆڤەکان لەسەر هەست و سۆز دامەزراوە لە حاڵێکدا لە دۆخی مۆدێرندا، لایەنە هەستبزوێن و سۆزدارییەکان لەنێو دەچن و لایەنی عەقڵانی جێگەیان دەگرێتەوە. مرۆڤەکان لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا بە عەشیرە، خزمەکان و هتد گرێ دراون، ئەمە لە حاڵێکدایە کە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، تاک پشت بە خۆی دەبەستێ. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان یاسا و دەستوورە گشتی و هەمەلایەنەکان کەوا گشت تاکەکان بە یەکسان لە خۆ دەگرێ، بوونی نییە بەڵکو هەر کەس و یان هەر جێگەو پێگەیەک حوکمی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەمە لە حاڵێکدایە کەوا لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان یاسا و دەستوورە گشتی و هەمەلایەنەکان دەسەڵاتدارە. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان بەها و پێگە و پایەکان لەسەر بنەڕەتی بنەچەی تاکەکان (سەر بە فلان خێزان یان فلان چین) بەوان تەرخان دەدرێ، بەڵام لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان جێگەوپێگە و ڕۆڵ و کارەکانی تاکەکان بە پێی لێهاتوویی و توانای ئەوان دیاری دەکرێ. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان بەرپرسایەتی و ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان لە یەکتر جیا نەبووتەوە و بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ یەکتر تێکەڵاویان هەیە، ئەمە لە حاڵێکدایە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان ڕۆل و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان چ لە تاکەکان و چ لە دامودەزگاکان لێک جیا بۆتەوە؛ بە واتایەکی تر کار و ڕۆڵەکان شێوەیەکی تایبەتییانەی بە خۆوە گرتووە و هەرکەس یان هەر

ڕێکخراوەیەک بە شێوەی ئاسایی لە ڕۆڵێکی تایبەت خەریکی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خۆیەتی، نەک ئەوەی کە چەند ڕۆڵی هەبێ.

دوا بە دووای پارسۆنز کەسانێکی دیکە لە کۆمەڵناس و تیۆرییدارێژەکانی نوێسازی وەکو «هوزلیتز»، «نیل سمەلسر» و «ئایزنشتاد»، بگۆڕە نموونەییەکانی دیکە بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵگە نەریتی و مۆدێڕنەکان پێشکەش دەکەن. بۆ وێنە »نیل سمەلسەر» نوێسازی وەکو جوولەی کۆمەڵگەکان لە تەکنیکە سادەکانەوە بۆ بەکارهێنانی زانیاری زانستی و لە وەرزێڕی بژیویانەوە بۆ وەرزێڕی بازرگانی و لە بەکارهێنانی هێزی بازوی مرۆڤەوە بۆ بەکارهێنانی ماشێن (ئامێر) و لە ژیانی لادێییەوە بۆ ژیانی شاری و هتد پێناسە کردووە. (٤٤)

ڕەخنەگەلێک لەسەر پێناسەی نوێسازی بەپێی بنەڕەتی بگۆڕە نموونەییەکان کراوە و بریتین لە: یەکەم، نموونەگەلێک کە لە لایەن ئەم تیۆرییدارێژانە بۆ وەسفی کۆمەڵگە نەریتی و مۆدێڕنەکان هەڵبژێردراوە دڵخوازانە و ڕەهان؛ بەم مانایە کەوا هەندێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان بە شێوەی دڵخوازانە هەڵبژێردراوە و هەر لەو حاڵەشدا مانایەکی ئەرێنی بەوان دراوە و پاشان تایبەتمەندییەکانی جیا لەوان، وەکو تایبەتمەندییە نەریتییەکان (و زۆرجار بە مانای نەرێنی) باسیان لێکراوە. دووەم، شاهیدە ئەزمونییەکان نیشانی داوە کەوا تایبەتمەندییە باسکراوەکانی ئەم نموونانە بەو چەشنە کەوا بانگەشەی بۆ دەکرێ شاهیدی ئەزموونییان نییە. بۆ وێنە لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان (وەکو نموونەی کۆمەڵگە مۆدێڕنەکان) گشتی بوون یان دەسکەوتەیی بوون بە تەواوی زاڵ نییە، بە پێچەوانەوە زۆر جار لەو کۆمەڵگەیانەدا دەتوانین تایبەت گەرایی یان خزمایەتی ببینین. هەروەها تایبەتمەندییەکانی باسکراو بۆ کۆمەڵگە نەریتییەکان بەڵگەی تاقیکراویان لەسەر نییە و ناتەواویی زۆری هەیە. (٤٥)

«ئاندرێ گوندر فرانک» یەکێک لەو تیۆرییدارێژانەیە کەوا ڕەخنە لە بگۆڕە نموونەییەکانی «پارسۆنز» دەگرێ. بە ڕای «فڕانک» تەنانەت ئەگەر

کەسێک بگۆڕە نموونەییەکانی پارسۆنز وەکو ئامێرێکی لێکۆڵینەوەی باش پەسەند بکات، زەحمەتە بتوانێ ئەوان بە مەبەستی لە بەرامبەر یەک دانانی کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان و گەشەنەسەندووەکان بە کار بێنێ. ئەو بەڵگە دێنێتەوە کەوا لایەنگرانی پارسۆنز تەنانەت بە پێی چوارچێوەی زەینی خۆیان، لەگەڵ شاهیدە نەریتییەکان ڕووبەڕوو دەبنەوە. لە ڕاستیدا لە هێچکام لە کۆمەڵگە گەشەسەندووەکاندا بگۆڕە نموونەییەکان بە شێوەی زاڵ بەڕێوە ناچێت و هەروەها هیچکام لە کۆمەڵگە گەشەنەسەندووەکان لەسەر بنەڕەتی «بگۆڕە نموونەییە نەریتییەکان» دانەمەزراون. تەنانەت ئەگەر کەسێک بانگەشەی لایەنگرانی پارسۆنز پەسەند بکات کەوا ئەم بگۆڕە نموونەییانە دۆخێکی دوو جەمسەری وەسف دەکەن، متمانە بەم دوو جەمسەرە خۆی لە خۆیدا کێشەگەلێک ساز دەکات. (٤٦)

### تێوریی نوێسازی و پێوەندییەکانی باکوور – باشوور:

پێشنیاری تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی نوێسازی بۆ گەشەی جیهان سێیەم ئەویە کە ڕێگەی مەنشوری تاقیکراوی گەشەی باکوور بگرنە بەر. لەو ڕوانگەیەوە، پێشکەوتنی باکوور بەرهەمی چەوسانەوەی باشوور نییە، بەڵکو بەرهەمی دۆزینەوەی ڕازە بەهادارەکانی پێشکەوتنی ئابوورییە. بەها کولتوورییەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی، سیاسی وئابوورییەکان کلیلی گەشەی باکوورن و لەگەڵ چەمکی نوێسازی تێکەل بوون. نوێسازی ئەورووپی لەخۆگری سڕینەوەی پلەبەپلەی شێوازە نەریتییەکانی ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانە. سەرەڕای ئەوەی کە بەشێکی بچووک لەم پرۆسانە لە ڕووی بەرنامەیە، پرۆسە هاوکاتەکانی هەندێک لە ڕووبەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بە یەکتر نێزیک دەبنەوە تاوەکو کۆڵەکەکانی پێشکەوتنی ئابوری پتەو و پیشەیی، بخوڵقێنن. لقە سەرەکییەکانی نوێسازی چیە؟ ئەو تایبەتمەندیانە کەوا تیۆرییداڕێژانی ئەم ڕێبازە دەیخەنە بەر دەست، زۆر جیاوازە. بەڵام لە نێوان بابەتە پێشکەشکراوەکان، تایبەتمەندیگەلێک هەیە

کەوا زیاتر جەختی لەسەر دەکرێت: سێکولاریزم (کەمبوونەوەی گرینگی ئایین لە ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری)، شارنشینی، فرەوانبوونی زانست و تەکنۆلۆجی، زۆر بوونی چالاکی کۆمەڵایەتی، سیستەمی پاداشە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەڕەتی لێهاتوویی و شایستەبوون نەک بارودۆخەکانی شەخسی (تاکەکەسی)، پەسەندکردنی داهێنانە کۆمەڵایەتییەکان و فرەچەشنی ڕوانگەکان، سنوردارکردنی کۆنتڕۆڵ گەلێک کەوا دەسەڵاتدارانی سیاسی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا دروستی دەکەن، بە تایبەت سەرهەڵدانی کەشی تایبەتی، دامەزراندنی دەسەڵاتدارێتی یاسا و گەشەی بەشێکی زۆری وزەی کار لە کۆمەڵگە. گشت ئەم تایبەتمەندییانە دەبێتە هۆی گەشەی ئابوورییەکانی بازاڕ، ئابووری گەلێک کەوا لەوێدا بڕیاردان بە شێوەی نێوەندنەگر بە هۆی بەشێکی بەرین لە بەرهەمهێنەران، بەکارهێنەران و کرێکاران بەڕێوە دەچێت و زۆرجار لە دەرەوەی کۆنتڕۆڵی ڕاستەوخۆی هێزی ئایینی و سیاسیدایە.

کۆمەڵگە نەریتییەکان لە ژێر دەسەڵاتی هێزی ئایینی دان و ژیانی لادێییان هەیە بە جۆرێک کەوا بەری (فاقد) لە هەر چەشنە توانایی پێویست بۆ دۆزینەوە تەکنۆلۆجی و زانستییەکانن. بنەمای کۆمەڵایەتی پتەویان هەیە بە جۆرێک کەوا ئەگەری جموجوڵ لەوێدا کەمە، دابەشکردنی پاداشە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەڕەتی بارودۆخە شەخسییەکانە نە شایەستەبوون و لێهاتوویی. هاندان بۆ داهێنان و ڕوو هێنان بەرەو بۆچوونە نوێیەکان بوونی نییە. هەروەها کۆنترۆڵکردنی زۆری کۆمەڵگە بە دەستی دەسەڵاتدارانی سیاسی و ئازادی یەکجار زۆری ئەوان لە تایبەتمەندییە نەریتییەکانە. ئابوورییەکانی کۆمەڵگە نەریتییەکان زۆر جار لەسەر بنەڕەتی کشتوکاڵی مەعیشەتی دامەزراوە. بەشێکی زۆر لە بنەماڵەکان تەنیا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆیان کاری بەرهەمهێنان بەڕێوە دەبەن. ڕێوڕەسمی خاوەندارێتی دەرەبەگایەتی و نیوە دەرەبەگایەتی بەسەریاندا زاڵە

و لەوێدا ژمارەیەکی تا ڕادەیەک کەم خاوەن زەوی و مووچەی زۆرن و وەرزێری زۆر لەوێدا کار دەکەن.

گرینگترین هۆکاری تێپەڕبوون لە کۆمەڵگەی نەریتی بەرەو کۆمەڵگەی مۆدێرن لە ڕوانگەی گەشەی ئابوورییەوە، سەرهەڵدانی سیستەمی خەڵات بۆ داهێنانە. کۆمەڵگە نەک هەر دەبێ لە پێشکەوتن و گۆڕان پێشوازی بکات، بەڵکو دەبێ لە بەرامبەر نایەکسانییەکان کەوا بەرهەمی قازانجوەرگرتن لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانە خوڕاگەر بێت. ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشی تایبەتی خۆی بۆ داهێنان ساز بکات، و ئەمە بایەخی بەرزی کۆمەڵایەتییە. بۆ گەیشتن بەم شتە دەوڵەت دەبێ ئامێرە پێویستەکانی ڕێکخستن و پشتیوانی لە داراییە تایبەتییەکان دابین بکات. مەبەست لە دارایی تەنیا خاوەنداری ماددەکان نییە، بەڵکو داراییگەلێکە کەوا داهێنەران دەبێ لەسەر بنەڕەتی داهێنانە زەینییەکانی خۆیان سازی بکەن. ئەگەرچی دەوڵەت دەبێ پشتیوانی لە مافە داراییەکان بکات، بەڵام بەو حاڵەشەوە بڕیارە ئابوورییەکان دەبێ لانیکەم تا ڕادەیەک لە دەستێوەردانە سیاسییەکان سەربەخۆ بێت. ئەم کارە زۆر پێویستە بە هۆی ئەوەی کە ئەگەر بڕیاردان بە شێوەی نێوەندنەگر لە ڕێگەی دەستووری بازاڕی ڕکەبەرایەتی بەڕێوە بچێت، جۆرە داهێنانێک پێکدێ کەوا بۆچوونە نوێیەکان هان دەدات و وەستان و ناکارامە بوون سزا دەدات. بە پێی ئەم باسەی کەوا کرا گەشەی دەزگا سەرمایەدارییەکان لە چەقی باسی نوێسازی دایە، هەر چەند پێشکەوتنی سەرمایەداری لە باکوور بێ تێپەڕبوون لە دۆخی نائابووری کۆمەڵگە مسۆگەر نەدەبوو.

تێورییداڕێژانی نوێسازی لەسەر ئەو باوەڕە کۆکن کەوا بۆ پێکهێنانی گەشەی ئابووری بە شێوەی بەردەوام وخۆهەڵقوڵیو لە باشوور، وڵاتانی جیهانی سێیەم دەبێ قۆناغی تێپەڕبوون لە کۆمەڵگەی نەریتی بەرەو کۆمەڵگەی مۆدێرن کە وڵاتانی باکوور پێشتر تاقیان کردۆتەوە، تێپەر کەن. کەوایە ڕێگەی گەشەی باشوور ڕەچاوکردنی شێوازی باکوورە. بەربەستە سەرەکییەکانی نوێسازی سەرچاوە لە دامودەزگا و بەها کۆمەڵایەتییە

نەریتییەکانی وڵاتانی باشوور دەگرێ کە دژ بە گەشەی ئابووری و پیشەسازییە.

لایەنگرانی ئەم ڕێبازە دژ بەم ڕوانگەیەن کەوا دەڵێ وڵاتانی جیهانی سێیەم بە ئارامی بەرەو نوێسازی، پێشکەوتن بە دەست دێنن. ڕەنگە زۆرینە باوەڕ بکەن کەوا نوێسازی جیهان سێیەم پرۆسەیەکی نەگۆڕاو بێت. لەم ڕوانگەیەوە هۆکارگەلی پێشکەوتن فرەوانن؛ ئەم هۆکارانە بریتین لە پێشەنگە (نوخبە) سیاسییە ڕۆشنبیرەکان (زۆرتر خوێندەواران لە باکوور) کەوا لە زۆر وڵاتی جیهانی سێیەم دەدۆزرێنەوە. کۆمپانیا فرەنەتەوەکان، وەکو جێگۆڕکێ کەرانی پسپۆڕی و بەها نوێیەکان کار دەکەن، جگە لەوە وەکو نموونە نوێیەکانی ڕێکخراوی ئابووری گرینگیان هەیە.

ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بازرگانی نێودەوڵەتی دەتوانێ چالاکی وڵاتانی باشوور زۆر بکات تاوەکو بە مەبەستی سازکردنی ململانێ یەکی کارامە بەرەو پێشوازی گۆڕانکاریی و ڕیفۆرمەکان بڕۆن. کاریگەری کولتووری ئەمریکا و وڵاتانی ئەورووپی لەسەر وڵاتانی جیهان سێیەم لە ڕێگەی کتێب، فیلم، زانیاری، بەرهەمە مەسرەفیەکان (مصرفي) و ڕاگەیاندنە گشتییەکان یارمەتی بە وڵاتانی باشوور دەدات کەوا لەگەڵ بەها و باوەڕە مۆدێرنەکانی وڵاتانی باکوور ئاشنا بن.

تیۆرییدارێژانی نوێسازی لەسەر ئەم باوەڕەن کەوا پاشکۆبوونی بەرانبەری ئابووری باکوور - باشوور بەهای زۆری هەیە، بە هۆی ئەوەی کە جگە لەوەیکە بەرژەوەندی بەرانبەر بوونی هەیە، بەڵکو ئەم پێوەندییانە یارمەتی بە وڵاتانی باشوور دەدات تا بتوانن بنەما و بەها کۆمەڵایەتییە نەریتییەکان کەوا دەبنە هۆی پاشکەوتوویی ئەوان لەنێو بەرن. گوشارە نێوخۆیی و بیانییەکان خوازیاری بچووک بوونەوەی بەشی نەریتی کۆمەڵگە و گەشەی خێرای بەشی مۆدێرنن. بە پێی ڕوانگەی تیۆرییدارێژانی نوێسازی نموونەکانی ئەم پرۆسەیە دەتوانین لە شارنشینی، زۆربوونی مووچەی وزەی کار و فرەبوونی دەرفەتە خوێندەوارییەکان بدۆزینەوە.

کەمینەیەک لە تیۆرییدارێژانی نوێسازی جیاوازیی نێوان نوێگەرایی و نەریت- گەرایی پەسەند دەکەن، بەڵام ئەم گریمانەیە دەخەنە ژێر پرسیارەوە کەوا دەڵێ وڵاتانی باشوور لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بە ناچاری بە نوێسازی دەگەن و لە کۆتاییدا لە نێوان بنەما ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی باکوور و باشوور یەکگرتنەوە ساز دەبێ. ئەم نووسەرانە نەریت گەرایی وەکو دیاردەیەک دەبینن کەوا بە قووڵی لە زۆر دەزگا و کولتوورەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم تەشەنەی کردووە. گۆڕان ڕەنگە بە ئارامی بێت، بەڵام بە ناچار لە ڕێگەی نموونە ئایدیالە نوێگەراکەی وەرگرتوو لە ئەورووپا نابێت.

هەندێکی تر بێگومان بوونی نوێسازی و یەکگرتنەوەی باکوور و باشوور دەخەنە ژێر پرسیارەوە و لەسەر ئەم باوەڕەن کەوا گەشەی ئابووری، ڕەنگە لە هەندێ کۆمەڵگەدا شیمانەی هەبێت کە هەندێک لە تایبەتمەندییە نوێ گەراکانیان پەسەند کردبێت بەڵام تایبەتمەندییەکانی تریان پەسەند نەکردبێت. تیۆریی نوێسازی لە هەندێک بابەتەوە ڕەخنەی لەسەر کراوە. بۆ وێنە، چەمکی نەریت گەرایی بە تەواوی لێڵە. لە کردەوەدا، نیشانەی نەریتیبوون بۆ هەر جووڵە و دەزگای کۆمەڵایەتی کە مۆدێرن نییە کەڵکی لێ وەردەگیرێ یان بە واتایەکی تر، ئەگەر تایبەتمەندی ئێستای کۆمەڵگەکانی ئەمریکای باکوور و ئەورووپایان نەبێت وەکو کۆمەڵگەی نەریتی پێناسە دەکرێن. پۆلێنبەندیی سەرجەم کولتووره جیاواز و جیاجیاکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان لە ژێر ناوی جیهانی سێیەم کەوا هۆکارە نوێگەراکانی ئەم کۆمەڵگەیانە لە ژێر سێبەری نەریتگەرایی ناخەنە بەرچاو ڕەنگە لە جیاتی ڕوونکردنەوەی بابەتەکە ئەو لێڵتریش بکات.

هەندێک کەس ئەم گومانە دەخەنە سەر تیۆریی نوێسازی کەوا ئەم تیۆرییە لە ڕوانگەیەکی ڕەگەزپەرستانە سەرچاوە دەگرێ. تێگەیشتنی ئەم ڕاستییە کەوا زۆربەی تیۆرییدارێژانی نوێسازی ڕوانگەیەکی ئەرێنییان سەبارەت بە نوێگەرایی هەیە و نەریت گەرایی بە خراپ دەزانن، گران نییە. ئەم بابەتە بە ڕوونی نیشان دەدا کە ئەوان حەزیان لە ئەورووپاگەراییە.

تایبەتمەندییەکانی وڵاتانی باکوور هەرچی بێت، گومانی سەرەوە لە مەڕ ئەوان ڕاست نییە و وڵاتانی باشوور کە بە شێوەی گشتی پێشوازی لە نوێگەرایی دەکەن، دەتوانن هیوادار بن خۆیان لە هەندێک لایەنی کەم بەهای (کەم سەرنجڕاکێش) کۆمەڵگە باکوورییەکان بپارێزن تەنانەت لە دۆخێکدا کەوا بە دووای ستانداردەکانی ژیانی ئەوانن. جگە لەوە، تیۆرییداڕێژانی نوێسازی لەوانەیە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دوور بن و لە ئاوڵناوە پڕ بەهاکانی ئەم کۆمەڵگەیانە چاوپۆشی بکەن.

هەندێک لە سەر ئەم باوەڕە کۆکن کە تیۆریی نوێسازی بە هەڵە گریمانە دەکات کەوا لەمپەرەکانی گەشەی جیهان سێیەم تەنیا بە هۆی بەرگریکردنی بەشی نەریتی ئەم کۆمەڵگەیانەیە. ئەم گریمانەیە ئەگەری بوونی پارادۆکس و لاڕێییەکانی بەشی مۆدێرن کەوا بە ئارامی گەشە دەکات لەبەرچاو ناگرێت. جگە لەوە، جێگۆڕکێ لە نەریت گەرایی بەرەو نوێ گەرایی ئارام و لەسەرخۆ نییە. نوێسازی لە ئەورووپا لەگەڵ بەرزبوونەوە و دابەزین و جووڵەگەلێک بەرەو پێش هەنگاوی نا و ئەم پرۆسانە زۆر جار لەگەڵ گۆڕانکارییە گەورەکان وەکو شەڕ، شۆڕش، بێکاری، کۆڕەو و شەڕی چینایەتی ڕووبەڕوو بوونەوە. هۆگەلێکی کەم هەیە لەسەر ئەوەی کە نوێسازی لە کاتی گۆڕانی وڵاتانی جیهانی سێیەم تووشی داڕمان و هەڵوەشانەوە نەبێت.

تیۆرییداڕێژانی نوێسازی لە بابەت بەرژەوەندییەکانی ئاڵوگۆڕی ئابووری باکوور ـ باشوور لەسەر گەشەسەندنی باشوور زۆر گەشبینن. ئەم ڕاونگەیە کە دەڵێ پێوەندیی لەگەڵ باکوور دەبێتە هۆی مەرگی نوێسازی، سا دروست بێ یان نادروست، زۆربەی نووسەرانی سەر بە ڕوانگەی نوێسازی ناکۆکی هێزەکی بەرژەوەندییەکانی نێوان باکوور و باشوور پشت گوێ دەخەن. لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی پاشکۆبوونی باشوور بە باکوور و تەشەنەی سیاسی باکوور، وڵاتانی باکوور دەتوانن لە ئاکامی ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکانی باکوور-ـ باشوور، بەشی هەرە زۆری بەرژەوەندییەکان بە دەست بێنن.

وێڕای سەرجەم ئەم ڕەخنانە، تیۆریی نوێسازی زانیاری زۆر گرینگ لە مەڕ ئەزموونی گەشەی باکوور دەخاتە بەر دەست. لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخ، ئەگەر لەم زانیارییانە وانەی باش بۆ پەرەپێدان بە گەشەی باشوور وەرنەگرین داخێکی گەورە بە جێ دێڵێ. ڕەنگە گرینگترین وانە ئەمە بێ کەوا سەرمایەداری وەکو شێوازێکی جیاواز بۆ ڕێکخستنی پێوەندییە ئابوورییەکانی کۆمەڵگە، میکانیزمێکی بەهێز بۆ بەرهەمهێنانی سامان بێت.

گەشەی سەرمایەداری بە نۆرەی خۆی پێوەندیی بە گۆڕانکاری دەزگا پشتیوانی کەرەکانی کولتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کەشی نائابووری کۆمەڵگەدا هەیە. ئەوەی کە ئایا ئەم داهێنانە دەتوانێ لە کۆمەڵگەکانی دیکەدا بە شێوەی سەرکەوتوو بەڕێوە بچێت یان نا، و ئەوەی کە ئایا ئەم کۆمەڵگەیانە دەبێ بە شێوەی خۆهەڵقوڵیو گۆڕانیان بەسەردا بێت، پرسیارێکی بنەڕەتیە کە بە هەڵسەنگاندنی تایبەتمەندییەکانی گەشەی سەرمایەداری لە وڵاتانی جیهانی سێیەم پێوەندیی هەیە. لە ڕاستیدا ئەم پرسیارە بنەڕەتییە لە دووەم لایەنی گەشەی جیهان سێیەم، یانی تیۆریی پاشکۆبوون سەرچاوە دەگرێ کە لە نەسکی دووایی بە وردی باسی دەکەین.

## پەراوێزەکان:

١- مصطفي ازكيا، ***جامعه شناسي توسعه***، چاپ سوم، تهران: موسسه نشر كلمه، 1380، ص 87.

2- S. N. Eisenstadt, ***Modernization: protest and change*** ; prentice - **Hall**, Englewood clifs:1960. P. 1.

3- Wilbert. E. Moor,***The Impost of Industry*** ; prentice Hall,Englewood clifs:1965. P. 6.

٤- ئەزكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٩٠.

5- Robert Wood ,***'PoliticalModernization'World politics,*** vol. 15; No. 5, oct. 1963; P. 59.

٦- احمد ساعي، ***مسايل سياسي – اقتصادي جهان سوم***، چاپ ششم، انتشارات سمت، تهران 1378، صص 26-25.

٧- ساعي، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا 25.

٨- پيتر ورسلي، ***جامعه شناسي مدرن***، ترجمه حسن پويان، جلد اول، ص 200.

9- Francis M. Abraham, ***Perspectives on Modernization:Toward a General Theory of Third World Develepment***, PP. 5-10.

١٠- آلوين ي. سو: ***تغييرات اجتماعي و توسعه***، چاپ اول : تهران: پژوهشكده مطالعات راهبردي، 1378، ص31.

١١- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٣١.

١٢- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٣١

١٣- يان روكس برو، ***نظريه هاي توسعه نيافتگي؛ جامعه شناسي توسعه***، ترجمه مصطفي ازكيا، تهران : نشر توسعه، 1370، ص 12.

١٤- ازكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧٠.

١٥- هوشنگ فرخجسته، ***ويژگيهاي جوامع سنتي و جوامع صنعتي***، كتاب توسعه: شماره 3؛ نشر توسعه، 1373، ص 141.

١٦- بيژن زارع، ***نظريه هاي نوسازي***، كتاب مجموعه مقالات سمينار جامعه شناسي و توسعه؛ جلد اول، تهران: انتشارات سمت، 1372: ص 379.

١٧- ازكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧٠.

١٨- ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧١.

١٩- ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧٤.

٢٠- لوئيس كوزر، ***زندگي و انديشه بزرگان جامعه شناسي***؛ ترجمه محسن ثلاثي، تهران: انتشارات علمي؛١٣٦٨؛ ص ١٣٦.

٢١- كوزر، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٤٠.

٢٢- احمد نقيب زاده، ***درآمدي بر جامعه شناسي سياسي***، چاپ اول، تهران : انتشارات سمت، 1379: ص86.

٢٣- ازكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧٥.

٢٤- ازكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٧٦.

٢٥- روكس برو، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٥.

٢٦-نقيب زاده، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٥.

٢٧-نقيب زاده، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٦.

٢٨- حسين بشيريه، ***جامعه شناسي سياسي***، چاپ دوم، تهران : نشر ني، ١٣٧٤، صص ٥٨-٥٧.

٢٩-***هەمان سەرچاوە***، لا ٥٨.

٣٠- نقيب زاده، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٤.

٣١-***هەمان سەرچاوە***، لا ٨٣.

٣٢-به نقل از: بلونتشلي در جي. اچ. آبراهام، ***مباني رشد جامعه شناسي*** : ترجمه حسن پويان، تهران : انتشارات چاپخش، ١٣٦٣، س ٣٢٢.

٣٣-ئەزكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٠.

٣٤- ئالوين ئی. سو، ***سەرجاوەی پێشوو***، لا ٣٢.

٣٥-***هەمان سەرچاوە***، لا ٣٢.

٣٦- ئەزکیا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٢.

٣٧- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٨٢.

٣٨- بەشیریە، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٨٥.

٣٩-تقي آزاد ارمكي، ***نظريه هاي جامعه شناسي***، چاپ دوم، تهران : انتشارات سروش، ١٣٨١، ص٤٠.

40-See: Wallace and B. wolf: ***Contemporary Socialogical Theory*** ; prentice Hall:1980;17- 44.

٤١- ئازاد ئەرمەکی، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٤٥.

٤٢- ئالوین. ئی. سو، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٣٤.

٤٣- احمد ساغي، ***مسائل سياسي – اقتصادي جهان سوم***، تهران : انتشارات سمت، ١٣٧٨، ص ٢٣.

٤٤- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٣.

٤٥- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٤.

٤٦- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٤.

٤٧- ئەزکیا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٩٥.

# چەمکی پاشکۆبوون

پاشکۆبوون لە سادەترین واتادا بریتییە لە بەدواداچوون و کاریگەری وەرگرتنی بابەتێک (بریتی لە تاک، وڵات و بگۆڕ) لە بابەتێکی دیکە و مەبەست لە وڵاتە پاشکۆکان، وڵاتگەلێکە کەوا کاروبار و گۆڕانکاری ئەوان لەژێر کاریگەری و کۆنترۆڵی وڵاتانی دیکەدایە. لەم مانایەدا دەتوانین پاشکۆبوون وەکو، ڕوانگەیەکی تر لەمەڕ کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم پێناسە بکەین؛ بە چەشنێک کە پێشینەی کۆلۆنیالیزم (ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ) لە زۆربەی وڵاتانی ناسراو بە جیهانی سێیەم ئەم بابەتە پشت ڕاست دەکاتەوە. زۆربەی ئەو وڵاتانە ماوەیەکی زۆر لەژێر فەرمانڕەوایی کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاواییدا بوون و ژیانی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوان لەژێر کاریگەری ئەم فەرمانڕەواییەدا، تووشی گۆڕانکاری قووڵ بووە. ئەگەرچی لە سەدەی بیستەم – بە تایبەت نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە ــ چەرخی فەرمانڕەوایی ڕاستەوخۆی کۆلۆنیالیزم لەم وڵاتانە کۆتایی هات و ئەم وڵاتانە بە گشتی وەکو، یەکە سەربەخۆکانی نەتەوەییان لێهات، بەڵام بە ڕای زۆر لە پسپۆڕان، سڕینەوەی کۆلۆنیالیزم تەنیا بەشێکی بچووک لە بازنە پاشکۆکانی ئەو وڵاتانەی لەنێو برد؛ بۆ وێنە پاشکۆبوونی سیاسی، زۆرجار بە شێوەیەکی ناتەواو لەنێو چوو، بەڵام پاشکۆبوونی ئابووری نە تەنیا لەنێو نەچوو، بەڵکو زۆرجار پتەوتریش بووە. [١]

لە نێوان دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠، بۆچوون و ڕوانگەکانی تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی نوێسازی کە زۆرتر جەختیان لەسەر لەمپەرە نێوخۆییەکانی گەشە دەکرد، لە لایەن تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی پاشکۆبوون کەوتە بەر هێرش و ڕەخنەوە. ئەم تاقمە بە تایبەت سەرنجیان لەسەر تێکشکانە یەک لە پاش

یەکەکانی ئابووری وڵاتانی ئەمریکای لاتین بوو. تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی پاشکۆبوون لەسەر ئەو باوەڕە بوون، کەوا کۆمەڵگە گەشەنەسەندووەکانی ئەمڕۆیی بەشێک لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی گشتیی جیهانن. ئەم دەستەیە بە پێچەوانەی تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی نوێسازی باوەڕیان بە نوێسازی و گەشەی ئابووری لە قۆناغە یەک لە پاش یەکەکان نییە.

بەپێی بۆچوونی«یان ڕۆکس برۆف»، تیۆریی نوێسازی بە هۆی ئەوەی کە پرۆسەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی تەنیا بە دۆخی نێوخۆیی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان دەبەستێتەوە، ناتوانی بە تەواویی لەگەڵ ڕاستی مێژوویی گونجاو بێت. [٢]

تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی پاشکۆبوون لەسەر ئەو باوەڕەن کەوا گەشەنەسەندوویی بەرهەمی بنەما و تایبەتمەندییە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی یەک کۆمەڵگە نییە، بەڵکو تا ڕادەیەکی زۆر ئاکامی مێژوویی پێوەندیی ڕابردوو و بەردەوام بوونی پێوەندیی ئابوری نێوان وڵاتە گەشەنەسەندووەکان (کەمەرە یان perimeter) و وڵاتە گەشەسەندووەکانە (مێترۆپۆل یا نێوەند). [٣] بە واتایەکی تر کێشە سەرەکییەکان کە وڵاتانی گەشەنەسەندوو و جیهانی سێیەم لەگەڵی ڕووبەڕوون، بە هۆی کێشە نێوخۆییەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە، سەریان هەڵنەداوە بەڵکو لە کێشە دەرەکی و داسەپاوەکانی زاڵ بەسەر ئەم کۆمەڵگەیانە سەریان- هەڵداوە. کەوایە بەڕای لایەنگرانی ڕێبازی پاشکۆبوون، ئەم بانگەشەیە، کەوا تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی نوێسازی کردوویانە لەسەر ئەوەی کە، ئەزمونی مێژوویی وڵاتە گەشەسەندووەکانی ئەمڕۆیی بۆ ئەو وڵاتانەی لە حاڵی گەشەسەندنن دووپات دەبێتەوە، وەکوبانگەشەیەکی بێ بنەمایە.

**ڕیشە هزری–مێژووییەکان و بنەما تیۆرییەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون:**

هەروەکو لە نەسکی پێشتردا ئاماژەمان کرد، ڕێبازی نوێسازی وەکو کۆمەڵە تیۆرییەکە کەوا گەشەسەندن لە ڕوانگەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بە تایبەت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هەروەها لەمەڕ ڕێبازی پاشکۆبوون دەتوانین بڵێین، ئەم ڕێبازە، لە ڕوانگەی وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە دەڕوانێتە گەشەسەندن. بە ڕای«بلۆم سترۆم»و«بژورن هێتنە»، ڕێبازی پاشکۆبوون «دەنگدانەوەی ئاوازگەلێکە کە لە کەمەرەوە بە گوێ دەگا»و لەگەڵ فەرمانڕەوایی هزری ڕێبازی ئەمریکی نوێسازی بەرەنگار دەبێتەوە. [٤]

«فیلیپ ئۆبراین» ئاماژە بە سێ نەریتی جیاواز لە تیۆرییە پاشکۆکان دەکات. نەریتی یەکەم لە ڕوانگەی بنەماخوازییەوە »کۆمیسیۆنی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەمریکای لاتین» (ئیکلا)، بە پشتیوانی «ڕائۆل پڕبیش»، ئابوریزانی ئەرژەنتینی، سەرچاوەی گرتووە. «پڕبیش» جەختی لەسەر ئەوەیە کەوا ئەمریکای لاتین دەبێ تاریفە گومروکییە باڵاکان، دەستنیشان بکات و هەوڵ بدات بە پێکهێنانی پیشەسازی نەتەوەیی، داواکارییە فرەوانەکان بۆ بەرهەمە بیانییەکان، دابین بکات. تیۆرییداڕێژانی ئەم نەریتە لەسەر ئەم باوەڕە بوون، کەوا سیاسەتی «چوونە جێگەی هاوردە«، کۆنتڕۆڵی خۆوڵاتی لەسەر سیستەمی ئابووری زۆر دەکات، چینە دەسەڵاتدارە نەریتییەکان لاواز دەکات و دەبێتە هۆی گەشەی نەتەوەیی و سەرهەڵدانی یەک دەوڵەتی نوێ. شوێنەوارەکانی «سونکێل» و «سێلسۆ فورتادۆ»، ئابووریزانی لێهاتووی بەرازیلی، ناسینێکی قووڵتر لە پاشکۆبوون لە فۆڕمێکی دژە ئیمپریالیستی و نامارکسی بە ئێمە نیشان دەدات. نەریتی دووەم ڕیشەی لە چوارچێوەیەکی مارکسیستی وەرگرتووە. ئەم گرووپە بە سەرکردایەتی «دۆس سانتۆس» و هاوڵاتی بەرازیلی ئەو « رویی ماورۆ مارینی»، دژ بە نەریتگەرایی و دوگماتیزمی ستالینیزم شۆڕشیان کرد. ئەوان هەوڵیان دا جێ بۆ چەمکی پاشکۆبوون لەنێو فۆرمی تیۆریی مارکسیستی

سەرمایەداری و تیۆریی لینینیستی ئیمپریالیزم بکەنەوە. بە ڕای «فیلیپ ئۆبڕاین»، سێ کۆمەڵناس یانی «کاردۆزۆ» و بیرمەندانی بەرازیلی هاوسەدەی ئەو «ئۆکتایۆ ئێنی»، «ئانیبال کۆئیجانۆ» دانیشتووی پێرۆ، دوو ڕوانگەی مارکسیستی و بنەماخوازیان لەگەڵ یەک تێکەڵ کرد و سێیەمین نەریتیان لە تیۆرری پاشکۆبوون ساز کرد [٥].

ڕێبازی پاشکۆبوون سەرەتا لە ئەمریکای لاتین وەکو دژکردەوەیەک سەبارەت بە تێکشکانی بەرنامەی «کۆمێسیۆنی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەمریکای لاتین» (ئێکلا) لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ ساز بوو.

ڕوانگەی تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی «ئێکلا» ئەگەرچی لە بەرامبەر بۆچوونەکانی پێوەندییدار بە ڕوانگەی نوێسازی کە لە هەوڵی پەرەپێدان بە سیستەمی سەرمایەداری بوون ڕادەوەستێتەوە، بەڵام ڕوانگەیەکی مارکسیستی نییە و زیاتر لایەنی ناسیونالیستی و دژە ئیمپریالیستی هەیە. وڵاتانی ئەمریکای لاتین پێش پێشکەشکردنی ڕوانگەی ڕێبازی «ئێکلا» لە ستراتیجی هەناردە نەریتییەکان کەڵکیان وەردگرت. قەیرانی ئابووری لە دەیەی ١٩٣٠ بە شێوەیەکی بەربڵاو داواکارییەکانی ڕۆژئاوای بۆ بەرهەمەکانی ئەمریکای لاتین کەم کردەوە. کێشەی پاڵدانەوە و متمانەپێکردن بە دەرەوە بۆ ئەو وڵاتانە ئاشکرا بوو و ئەوە بەستێنێکی پێکهێنا کە ڕۆشنبیرانی ئەم وڵاتانە »ستراتیجیی گەشەی نێوخۆ» هەڵبژێرن کە لە بەرامبەر زیادەخوازییەکانی بازرگانی جیهان خەساری کەمتریان لێ کەوێ.[٦] بەڵام لە سەرەتادا ئەم ڕێگەیە، کەوا گەشەی نێوخۆی فۆرمبەندی دەکرد، پشتیوانی ئایدیالۆژیکی نەبوو. ئەم پشتیوانییە و پلانە پێشنیار کراوەکەی لەگەڵ سازبوونی کۆسیسونی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەمریکای لاتین کە لە ١٩٤٨ لە شیلی دەستی بە کار کرد، کاری پێکرا. بە گشتی گەشەی نێوخۆ لەگەڵ شێوەی ئارام و لەسەرخۆ و لێکۆڵینەوە و ڕێگەچارەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و لەگەڵ زمانی بیرۆکراسی

نێونەتەوەیی هاوڕێ ببوو. ڕێبازی «ئێکلا» سەرنجی بە دامەزراندنی سیستەمی سەرمایەداری دا و سەرقاڵی پێشنیارکردنی لێکۆڵینەوەیەکی بنەماگەرایانە لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین بوو. «ئێکلا» باوەڕی وایە کە زانیاری بەدەست هاتوو لەمەڕ ئابوری نەریتی وڵاتە گەشەسەندووە سەرمایەدارییەکان بۆ ئەمریکای لاتین گونجاو و تەواو نییە. «ئێکلا» بنەماکانی پێوەندییدار بە ئابووری نێوخۆیی وڵاتانی ئەمریکای لاتین لێکداتەوە و پێداگری لەسەر گەشەنەسەندوویی ئەم قارەیە دەکاتەوە.

بیرمەندانی ڕێبازی «ئێکلا» کۆتایی سەدەی نۆزدە تا نێوەڕاستی سەدەی بیستەم بە سەردەمی «گەشەی نێوخۆ» دەزانن. بە ڕای ئەوان لەو سەردەمەدا ئەمریکای لاتین بەرپرسی دابینکردنی ماددە خاوەکان و سەرچاوە خواردەمەنییەکان بۆ وڵاتە پیشەسازییەکان بوو و لە بەرامبەردا، کەلوپەلە بەرهەمهاتووەکانی ئەو وڵاتانەی وەردەگرت. ئەوان ئەم پێوەندییە لە نێوان وڵاتانی ئەمریکای لاتین (وڵاتە کەمەرە یا قەمەرەکان)و وڵاتە پیشەسازییەکان (وڵاتانی نێوەند یا مێترۆپۆلەکان) وەکو پێوەندییەکی نایەکسان و ناهاوسەنگ دەزانن.[٧] بە پێی ئەم بنەڕەتە »ڕئۆل پڕبیش» دەڵێ«وڵاتانی ئەمریکای لاتین بەشێک لە سیستەمی نێودەوڵەتی پێکدێنن کەوا پێ دەگوترێ سیستەمی «نێوەند – کەمەرە». [٨]

تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی «ئێکلا» جگە لە دابەشکاری جیهان بە دوو بەشی «نێوەند» و «کەمەرە«، لە فۆڕمی شیکردنەوەی بنەمایی خۆیاندا، جەخت لەسەر بوونی یەک بنەمای دووانە لەنێو وڵاتانی ئەمریکای لاتین دەکەن. لەنێو ئەو وڵاتانە بە هۆی پێوەندییەک کەوا ئەوان لەگەڵ وڵاتە پیشەسازییەکانی نێوەند بوویانە، دوو بەشی نەریتی و مۆدێرن ساز بووە کە ئەم دوو بەشە بە شێوەی جیا لەیەک چالاکیان هەیە و دواکەوتوویی و گەشەی وڵاتانی ئەمریکای لاتین لە سەر بنەڕەتی ئەم بنەما دووانەیە لێکدەدرێتەوە. ئەم بنەما دووانە ئاکامی پێوەندیی نایەکسان لەگەڵ وڵاتە گەشەسەندووە پیشەسازیەکان و پەیڕەوکردن و شوێن کەوتنی «شێوازی

گەشەی دەرەکی»یە.[٩] بە واتایەکی تر ستراتیجی «ئێکلا» لە سەر دوو پرەنسیپی سەرەکی دامەزراوە؛ بە پێی پرەنسیپی یەکەم، وڵاتانی لە حاڵی گەشەسەندن بنەمایەکی دووانەیان هەیە : بنەمایەکی پێشکەوتوو و نوێ و بنەمایەکی دواکەوتوو و دەرەبەگایەتی (فیئۆدالی). لەژێر سێبەری دەوڵەتی سەرمایەداری و سەربەخۆیی نەتەوەیی، دەتوانین بە سازکردنی بەشە ژێرخانەکان وەکو ڕێگە و بانەکان، بەرهەمهێنانی وزە و پێداویستییەکانی دیکە پێشکەوتن بەرەو پیشەسازی گارانتی بکەین. بە پێی پرەنسیپی دووەم، جیهان بە بەشێکی نێوەندی پیشەسازی و بەشێکی کەمەرەیی دابەش دەبێ. لە ڕەوشی ڕکەبەری کۆنترۆڵنەکراودا، نێوەند بەشی هەرە زۆری داهاتی فرەوانبووی جیهانی بە زیانی کەمەرە بە دەست دێنێ.[١٠]

لە ڕوانگەی تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی «ئێکلا» تا ئەو کاتەی کەوا وڵاتانی جیهانی سێیەم پەیڕەوی لە سیستەمی «گەشەی دەرەکی» بکەن و پێوەندیی خۆیان لە فۆرمی نایەکسان لەگەڵ وڵاتە پیشەسازییە گەشەسەندووەکان یان بە واتایەکی تر «مێترۆپۆل»ەکان بەردەوام بێت، ئەم بنەما دووانەیە هێز و توانای زیاتری دەبێت و لە ئەنجامدا دۆخی گەشەنەسەندوویی ئەم وڵاتانە هەروا بەردەوام و نەپساوە دەمێنێتەوە. ئەوان بە خوێندنەوە مێژووییەکان و بۆ چەسپاندنی ئەندیشەی خۆیان لەسەر ئەم خاڵە پێداگری دەکەن کە لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین، لە هەر سەردەمێک کە «شێوازی گەشەی دەرەکی»و پێوەندیی لەگەڵ نێوەند لە بەر هۆگەلێکی وەکو هەڵایسانی شەڕ یان وەستانی جیهانی تووشی وەستان بووە، گەشەی پیشەسازی لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین پەرەی سەندووە و لەگەڵ سازکردنی پێوەندیی دووبارە و پەیڕەوکردنی «شێوازی گەشەی دەرەکی» دواکەوتوویی و لەنێوچوونی گەشە ساز بووە.

بەپێی ئەم بنەڕەتە، ستراتیجی پێشنیارکراوی «کۆمیسیۆنی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەمریکای لاتین» (ڕێبازی ئێکلا) بۆ گەشەی وڵاتە کەمەرەکان بەتایبەت لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین، ستراتیجی «چوونە جێگەی

هاوردە« لە فۆرمی شێوازی«گەشەی نێوخۆ» لە بەرانبەر ستراتیجی «هاندان بۆ هەناردە «لە فۆڕمی «شێوازی گەشەی دەرەکی»پێشنیار کردووە. پلان و ستڕاتیجیی گەشەی پیشەسازیی «چوونە جێگەی هاوردە« بەرهەمهێنانی نێوخۆیی بە جێگەی بەرهەمەکانی بیانی پێشنیار دەکات. بۆ گەیشتن بە ئاوا پلانێک کەوا بەستێنێکی نێوخۆیی هەیە دەبێ بەربەستە نێوخۆیەکانی گەشەسەندن دیاری بکەین. بەپێی ئەم بنەڕەتەیە کەوا پێشکەشکردنی شیکردنەوە بنەماییەکان لەمەڕ بەربەستە نێوخۆییەکانی گەشەسەندن کەوتۆتە جێی سەرنجی خاوەنبیرانی ڕێبازی ئێکلا و پێشنیاری ئەوان بۆ وڵاتە کەمەرەکان لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی ئەوە بوو کە دەبێ هەوڵە سەرەتایی و بەرنامەڕێژکراوەکان کە ئەوان بۆ گەشە هەبوویان، بەشێوەی ڕێکوپێک و سیستەماتیک دەربێت و کاری باش و بەجێ بۆ پتەوکردنی سیاسەتی «بە پیشەسازی بوون» بە شێوەی «چوونە جێگەی هاوردە» ئەنجام بدرێت. بۆ ئەم مەبەستە، چەند کارێک لە لایەن ئەم ڕێکخراوە پێشنیار کرا کەوا کۆبەندێک لە سیاسەتی پشتیوانی بریتی لە دەرکردنی تاریف (تعرفە) بۆ پیشەسازی بیانی، کۆنترۆڵکردنی ورد لەسەر نرخەکانی ئاڵوگۆڕ بە مەبەستی بەرگری لە هاوسەنگنەبوون لە ئاڵوگۆڕەکاندا و کارگەلێکی دیکە بە مەبەستی پەرەپێدان بە بازاڕی نێوخۆیی لەخۆ دەگرت.

کەوایە بە پێی ستراتیجیی «چوونە جێگەی هاوردە»، سیاسەتگەلی وەکو دەستێوەردانی دەوڵەت لە پرۆسەی گەشەی ئابووری و بەپیشەسازی بوون، کۆنترۆڵی هاوردە و بازرگانی بیانی، بەکارهێنانی بازرگانییە گۆمرۆکییەکان و گوێ ڕایەڵی سیاسەتە پشتیوانی کەرەکان لە بەرهەمهێنانی نێوخۆیی کەوتە بەر سەرنج و ئامۆژگارییەوە. هەڵبەت نابێ ئەم خاڵە لە بیر کەین کە خاوەنبیرانی ڕێبازی «ئێکلا» لەگەڵ ئەوەی کە، بە چەشنێک پشتبەستووو بە دەزگایەکی نێودەوڵەتین کەوا بە دژ سیستەمی سەرمایەداری و ئیمپێریالیستییە، بە شێوەی ناڕاستەوخۆ جەخت لەسەر سەربەخۆیی دەوڵەت و وڵات و ڕۆڵی ئەو لە گەشەی نەتەوەیی دەکەن. جەختی ئەم ڕێبازە لەسەر

گەشەی سەرمایەداری سەربەخۆ، لەو کات لە لایەن سیاسەتمەدارە دیمۆکراتە چەپەکان یان سوسیال دیمۆکراتەکان، لەوانە »هایادێ لاتۆڕ» لە پیڕۆ، «ڕومولۆ بیتانکورت»لە ڤینۆزۆئیلا، و «ئارتورۆ فرۆندیزی»لە ئارژانتین پەسەند کرا. (١١)

ئەو بۆچوونانەی کەوا لە چوارچێوەی ڕێبازی «ئێکلا» گەڵاڵە دەکرا زۆر جار لە لایەن ئابووریزانەکانی گەشەسەندن باسیان لەسەر کراوە. سێ کەسایەتی لەم پێوەندییەدا ناوبانگیان هەبوو: «ڕائول پڕبیش» و «سێلسۆ فۆرتادۆ» هەر دوو لە ئارژانتین و « ئۆسوالدۆ سۆنکێل » لە شیلی کە دواتر باس لە تیۆرییەکانی ئەوان دەکەین.

***«ڕائول پڕبیش»*** لە ساڵی ١٩٠١ لە«توکومان»ی ئارژانتین لە دایک بوو، لە زانکۆی بۆینۆس ئایرێس لە وانەی ئابووری دەرسی تەواو کرد، پاشان لە زانکۆ دەوڵەتی ئارژانتین خەریکی کار بوو. لە ساڵی ١٩٣٥ تا ١٩٤٣ سەرۆکایەتی «بانکی نێوەندی» گرتە ئەستۆ و لە ساڵی ١٩٤٨ «ئێکلا»ی دامەزراند و لە کۆتاییدا وەکو سەرۆکی ئەو هەڵبژێردرا. (١٢)

«پڕبیش» لە بنەڕەتدا جیهانی بە دوو بەش دابەش کرد: «نێوەند» پێکهاتوو لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و «کەمەرە« پێکهاتوو لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان. پڕبیش ئەوەی پەسەند کردبوو کەوا پێوەندیی نێوان وڵاتە پێشکەوتووەکان و دواکەوتووەکان دەتوانێ بۆ هەر دوو لا قازانجی بێت، بەڵام بە پێی بۆچوونی «وێرنێر بائێر» باوەڕی نەبوو کەوا بەکارهێنانی بێ سنوور بتوانێ ئاوا ئاکامێک بەرهەم بێنێت. بە باوەڕی پڕبیش لە درێژ ماوەدا، خراپ بوونی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ لە وڵاتە کەمەرەکان کەوا بە هۆی دوورکەوتنەوەی نێوان پێشکەشکردن و داوا کردنی نێونەتەوەیی ساز بووە دەبێتە لەمپەر بۆ گەشەی ئەو وڵاتانە، چونکە هۆی گرانبوونی کەلوپەلە سەرمایەکان و کەلەوپەلە پیشەسازییە هاوردەکانی دیکە و کەمبوونەوەی داهاتە بیانییەکانی (ارز) وڵاتە کەمەرەکان پێکدێنێ. بۆیە بە ڕای پڕبیش ڕێگە چارەی لابردنی ئەم ناڕێکوپێکی یە، گەشەی پیشەسازی وێڕای پشتیوانی

گومرکانە لە بەرامبەر هاوردە پڕ تێچووەکانە کەوا ئامانجی پاراستن و هێنانە سەرەوەی ئاستی ژیانی جەماوەر لە ڕێگەی ڕێگرتن لە جێگۆڕکێی داهاتەکان بۆ نێوەند و پشتیوانی کردن لە پیشەسازی نێوخۆیە. دەوڵەت هەروەها دەبێ ژێرخان یان بنەماگەلێک کەوا بڕیار بوو ئەو پیشەسازییانە لە سەر ئەوان دابمەزرێ، وەکو نێوەندە وزەکان، ڕێگە و بانەکان و ماددە خاوەکان دابین بکات و پێداویستیگەلێک ساز بکات کە پیشەسازییە نێوخۆکان بتوانن لە خۆیان پشتیوانی بکەن. [١٣]

پڕبیش لە مانگی مەی ١٩٤٩ لە وڵامی بانگەوازی «مەنشوری ئێکلا» بۆ خوێندنەوەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ لە ئەمریکای لاتین دەستی دایە نووسینی بیر و بۆچوونی خۆی لەبابەت کەم بوونەوەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ. ئەو بەڵگەی دەهێناوە کەوا لە کۆتایی سەدەی نۆزدە تاکوو شەڕی جیهانی دووەم، هاوسەنگی نرخەکان لە لایەن هەناردەکەرانی کەلوپەلە کشتوکاڵی و ماددە خاوەکان لە وڵاتە کەمەرەکان بەرەو لای هەناردەکەرانی کەلوپەلە پیشەسازییەکان لە وڵاتە پیشەسازییە سەرمایەدارەکان چووە. پڕبیش جگە لە ڕەخنەگرتن لە دابەشکاری کاری جیهانی، ڕێگە چارەی بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ نارێکوپێکی گەشەسەندن لە نێوەند و کەمەرە، هاندانی گەشەی پیشەسازی لە وڵاتە کەمەرەکان دەزانێ.

بە ڕای «جۆزێف لاو»، بیروبۆچوونەکانی پڕبیش و ئێکلا لە چوار سەرچاوەی سەرەکی پێکدێن:یەک لەوان «تیۆریی کلاسیکی مێرکانتیلیزم»و ئەو سیاسەتانە بوو کەوا پاڵپشتیی لە »بە پیشەسازی بوونی» ئەو وڵاتانە دەکرد. یەکێک لەو سیاسەتانە دانانی گومرکانە بۆ پشتیوانی لە پیشەسازیی نێوخۆیی بوو. «ئالخاندرۆ بونکە «لە ئارژانتینییەکانی پاڵپشتی گەشەی پیشەسازی لە دەیەی ١٩٢٠، نوێنەری ئەم چەشنە بیرۆکەیە بوو. نووسراوەکانی ئابوریزانەکانی وڵاتانی ئەورووپای نێوەندی و ڕۆژهەڵاتی سەرچاوەی دووەمی ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە بوو. لە نێوان قەیرانی دەیەی ١٩٣٠ نووسەرانێکی وەکو «ن. کالدۆ» و «پ. ن. ڕۆزنشتاین ـ ڕوودان» بە

مەبەستی چاککردنەوەی نەبوونی ناهاوسەنگی پێکهاتوو لە هەناردەکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی، پشتیوانیان لە گەشەی پیشەسازی کرد. «میخائیل مانۆی لیسکۆ» هەروەها وەکو «پڕبیش» بەرپرسی بانگی نەتەوەیی بوو، لە نارەزایەتی دەربڕین بە نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان وڵاتە پیشەسازییەکان و وڵاتە دواکەوتووە کشتوکاڵیەکان، جەختی لەسەر سیاسەتە پشتیوانیکەرەکان دەکرد. سەرچاوەی چاوەڕوانکراوی چوارەم نووسراوەکانی«وێرنێر سومبارت»ی ئاڵمانییە کەوا لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٨ لە نووسراوەکانی خۆی ئاماژە بە نێوەندی سەرمایەداری و وڵاتە کەمەرەکان دەکات و سەرقاڵ بە وەسفی پاشکۆبوونی نێوان ئەوان دەبێ.[١٤]

پڕبیش لەسەر ئەم باوەڕەیە کەوا وڵاتە کەمەرەکان بە هۆی زاڵبوونی نێوەند، بە تایبەت لە تەکنۆلۆجی، ئامێرە مەسرەفییەکان (مصرفی)، فۆڕمە کولتووری و ئایدیالۆژییەکان، تووشی وەستانێکی مێژوویی لە گەشەی خۆیان بوون، ئاکامی ئەم کارە سازبوونی بنەمای کۆمەڵایەتی جیاواز لە نێوەند، لەنێو وڵاتە کەمەرەکانە. پڕبیش دەڵێ مەسرەفی ناتەواو، لە لایەن بەشێکی بەرچاو لە دانیشتوان، کە ناتوانن لە بەرژەوەندییەکانی گەشەی سەرمایەداری کەڵک وەرگرن، بە هۆی سەرمایەداری ساز نابێت، بەڵکو بەرهەمی چەشنە بنەمایەکی کۆمەڵایەتییە کەوا ڕێ دەدات داهاتەکان لە دەستی کەسانێک کۆ بێتەوە کەوا خاوەنداران و بەڕێوەبەرانی بەشێکی هەرە زۆر لە ئامێرەکانی بەرهەمهێنانن و بۆ جارێکی تر بەشێکی گەورەتر لە دانیشتووە کرێکارەکان بەرەو ئاستێکی زۆر کەم لە قازانجوەرگرتن ڕادەکێشێ. کەڵەکەکردنی سەرمایە بۆ ڕاکێشانی سەرجەمی وزەی کار بەس نییە، تەنانەت ئەگەر کەڵەکەکردنێکی ڕێکوپێکیش بوونی هەبێت، دەکەوێتە دەستی توێژە بەرزەکانی کۆمەڵگە کەوا لاسایی شێوازە مەسرەفییەکانی (الگوهاي مصرفي) نێوەند دەکەن و ئەو بەشە لە وزەی کار کەوا ڕاکێش دەبێ خاوەن پسپۆڕی و تەکنۆلۆجی کرێکارانی نێوەند نییە. [١٥]

پڕبیش، ئەو ڕاستییەی بۆ وەدەر دەکەوێ کەوا جۆرە حەزێک بۆ تێکهەڵچوون لە نێوان توێژە باڵاکانی « وزە کۆمەڵایەتییەکان» و توێژە نوێیەکانی «سەندیکا و وزە سیاسییەکان » هەیە کەوا بە هاتنی تەکنۆلۆجی و کاریگەری ئەو لەسەر پیشەسازی و چالاکییەکانی دیکە، ئەو تێکهەڵچوونە بە دەستی توێژە مامنێوەندییەکان هێور دەبێتەوە کە حەزیان لە گەشەی دیمۆکراسییە. یەکێکی دیکە لە ناکۆکییەکانی پێوەندیی نێوان نێوەند و کەمەرە، ئەم ڕاستیەیە کەوا فرەوانبوونی سەرمایەداری نێوەند لە کەمەرە بە شێوەیەکی خودکار (ئۆتۆماتیک) نییە، بەڵکو گەشەی پیشەسازی کەمەرە، ڕووداوێکی مەبەستدار و لە قەیرانە یەک لە پاش یەکەکانی نێوەند سەریهەڵداوە، وا دەکات کۆمپانیا گەورە و نێونەتەوەییەکان لە نێوەند بۆ کەمەرە کاریگەریان هەبێت. جگە لەوە کەمەرە حەزی لە جۆرە سیستەمێکی ماڵی نییە کەوا سەرمایە و ناهاوسەنگی لە پاش خۆی جێ دیڵێ. هەروەها کەمەرە لە ئاڵوگۆڕکردنی کاڵا پیشەییەکان کەوا قازانجی زۆری بۆ نێوەند هەیە بێ بەشە. هیچکام لە مارکسیستەکان و نوێ کلاسیکەکان نەیانتوانیوە پێناسەیەکی دروست لە تواناکانی کەمەرە بۆ گەیشتن بە سەرمایەداری لاسایی کەرەوە (تقلیدی)پێشکەش بکەن. پڕۆسەی سەرمایەداری کەمەرە لە بنەڕەتدا جیاوازی لەگەڵ نێوەند هەیە. پڕبیش لە سەنتزێکی گشتیدا دەڕوانێتە تیۆرییە لیبڕاڵ و سوسیالیستیەکان. بە باوەڕی ئەو دەوڵەت دەبێ ڕۆڵی یەکەم لە دەستنیشانکردنی ئاهەنگ و شێوەی کەڵەکەکردن بگێڕێ، بەڵام پێویست نییە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئامێری بەرهەمهێنان بۆ دەوڵەت ڕاگوێزێ. (١٦)

پڕبیش، تیۆریی سەرمایەداری کەمەرە بە پاشکۆبوون گرێ دەدات. حەزی سەرمایەداری کەمەرە سازکردنی کۆمەڵگەیەکی مەسرەفی (مصرفي)لە ئەمریکای لاتینە کەوا دەبێتە هۆی بێ بەش بوونی مرۆڤەکان. «پڕۆسەی کەڵەکەکردنی سەرمایە و هاوردەکردنی تەکنۆلۆجی نوێ لە نێوەندە پیشەسازییەکانەوە، بە مەبەستی تێکەڵکردنی هەرچی زیاتری توێژە

کۆمەڵایەتییە نوێیەکان لە پرۆسەی گەشەسەندندا جێبەجێ ناکرێ»[١٧] و ئەم خەیاڵە کەوا کەمەرە بتوانێ هاوشێوەی نێوەند، «دیسان بەرهەمهێنان» بکاتەوە، خەیالێکی هەڵەیە.[١٨] پرێبیش دەڵێ:

***بە ڕای من سەرمایەداری کەمەرەیی دیاردەیەکە کەوا، لە تەکنۆلۆجی نێوەندە پیشەسازییەکان سەرچاوە دەگرێت و بریتییە لە شێوازە مەسرەفییەکان، دامودەزگاکان، باوەڕەکان و ئایدیالۆژییەکان کە لە تایبەتمەندییەکانی سەرمایەداری تەواو ساختەیە (جعلی). . . . ئەگەری « دیسان بەرهەمهێنان » بە هۆی ئەو پاڕادۆکسانە مسۆگەر نییە. . . . کەڵەکەکردنی سەرمایە هەروەها بە نۆرەی خۆی لەگەڵ فرەوانبوونی کۆمەڵگەی مەسرەفی گونجاو نییە.*** [١٩]

پرێبیش هەروەها لە سەر ئەم باوەڕەیە :

مەبەستی من لە پاشکۆبوون چەشنێک لە پێوەندیی نێوان نێوەند و کەمەرەیە کەوا بە هۆی ئەو وڵاتێک، نە تەنیا لە بواری کێشە ئابوورییەکان بەڵکو لە بواری کێشە سیاسییەکان و ستراتیژییە سیاسییەکانی نێوخۆیی و دەرەکی، خۆی بە بڕیارەکانی نێوەند دەبەستێتەوە. ئاکامی ئەم پێوەندییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گوشارە بیانییەکانی، ئیزنی بڕیاردان لە وڵات بستێنن. گۆڕانکارییە بنەماییەکان دەبێتە هۆی ئاگاداربوونەوە لەو دیاردەیە و ئەم زانیاری و حەز بە سەربەخۆ بوونە، یەکێک لە بەشە پێویستەکان بۆ ناسینی ڕەخنەگرانەی سیستەمە. [٢٠]

پلانەکەی پرێبیش، بە ئاشکرا بەرەو ڕێگەچارەی سەرمایەداری سەربەخۆ دەڕواتە پێش. دەوڵەت دەبێ ڕۆڵێکی زاڵی هەبێت، بەڵام لە جیاتی بە گشتیکردنی ئامێرە بەرهەمهێنەرەکان، دەبێ هەوڵ بدات بە دروست کردنی هاوسەنگی نێوان ئاژانسە تایبەتی و گشتییەکان، لەسەر لەمپەر و ناکۆکییەکانی نێوان نێوەند و کەمەرە زاڵ بێت. پرێبیش دەیهەوێ بزانێ کەوا وڵاتە گەشەنەسەندووەکان چۆن لە ڕێگەی دەست تێوەردانی دەوڵەت بە شێوەی دانی سوبسیدی تاریفەیی یان چوونە جێگەی هاوردەکان خۆیان

لەگەڵ دۆخی نێونەتەوەیی دەگونجێنن. بەم چەشنە، کەمەرە ڕەنگە بتوانێ ئامێرێک بۆ قەرەبووکردنەوەی شوێنەوارە زاڵەکانی نێوەند بدۆزێتەوە.

***«سواڵدۆ سۆنکێل»*** ئابووریزانی دانیشتوی شیلی یەکێکی تر لە ئەندامانی کۆمیسیونی ئابووری ئەمریکای لاتین (ئێکلا) بوو کە جەختی لە سەر پاشکۆبوون لە پانتایی بازرگانی بیانی دەکرد و لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە کێشەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم (ناسەقامگیری، وەستان، نزمبوونەوەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ و هتد) ڕیشەی لە بنەمای پشتبەستوو بە بازرگانی بیانی ئەوان دایە. ئەوە بە مانای پاشکۆبوونی بنەمایی جیهانی سێیەم بە هەناردەی مادده خاوەکان و هاوردە پیشەسازییەکانە.

بەڕای سونکێل، ئەم پاشکۆبوونە بۆتە هۆی ئەوەی کە لە پڕۆسەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری دوو بنەما ساز بێت کەوا لە کۆتاییدا یەک هەمەکی پێک دێنێ: «یەک بنەمای زاڵی گەشەسەندوو»کە بریتی لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان و «یەک بنەمای پاشکۆی گەشەنەسەندوو» کە بریتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمە. [٢١]

بە ڕای سونکێل، سیستەمی وڵات – نەتەوە، وەکو وردە سیستەمێک لەنێو سیستەمی سەرمایەداری جیهانی حیسابی بۆ دەکرێ. لە دیدی سونکێل گەشەنەسەندوویی بە هۆی گۆشەگیری ئابووری، سیاسی و کولتووری کۆمەڵگە ساز نابێ، بەڵکو گەشە و گەشەنەسەندوویی پڕۆسەگەلێکی هاوکاتن کە نیشاندەری «دوو شێوەی جیاواز لە تەکامولی (گەشەی) مێژوویی سیستەمی سەرمایەدارین».

ئەو بە لێکدانەوەی ئەزموونە مێژووییەکانی نێوەندە کۆن و نوێیەکان جیهانی سەرمایەداریی ئەورووپا، ژاپۆن و نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کاریگەری ئەوان لە سەر ئەمریکای لاتین، سەرقاڵی شیکردنەوەی ئەم گریمانەیەی خۆی بوو. سونکێل سەرنجی خۆی بۆ کۆمپانیا فرەنەتەوەکان و هەروەها قەیرانە چەقبەستووەکان ڕاکێشا کە بە هۆی کاریگەری فرەوانی

ئەوان لە سەر ئابووری خۆولاتی، هاتنەژورەوەی تەکنۆلۆجی سەرمایەبەر و پەرەپێدانی سەرمایەداری مەسرەفی سەری هەڵداوە. [٢٢]

بە ڕای سونکێل، پاشکۆبوون و پەڕاوێزبوون کە بە ناچار ڕوو دەدات هاوکاتە لەگەڵ پڕۆسەی سەرمایەداری پشتبەستوو بە دەوڵەت. لەم پڕۆسەیەدا، بەشێکی زۆر لە خاوەنداریێتی و کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سروشتییەکان بە کۆمپانیا بیانییەکان دەسپێردرێ، ئەوە لە حاڵێکدایە کە دەزگای دەوڵەتی بە دابین کردنی ژێرخانەکان بۆ کارئاسانی سەرمایەگوزاری و فرەوان کردنی ئەوان سەرقاڵ دەبێت. ئەم پڕۆسە نەتەوەسڕە دەبێتە هۆی زۆربوونی نایەکسانی و پاشکۆبوون. بە ڕای سونکێل بەرازیل نموونەی ئەم حەزەیە و لەوێدا چینە دەسەلاتدارەکان ئەم دۆخەیان – پاشکۆبوون و زۆربوونی نایەکسانی- پەسەند کردووە. [٢٣]

بە پێچەوانەی نموونەی بەرازیل ولاتانی وەکو پێرۆ لە کاتی «خوان ولاسکو ئالۆڕادۆ» و شیلی لە کاتی «سالوادۆر ئالندە« هەوڵیان داوە لە ڕێگەی کۆنترۆڵی ئابووری، لە بەرامبەر ئەم دۆخە، دژکردەوە لە خۆیان نیشان بدەن. لە پێرۆ بەشە نەتەوەخوازەکان لە سوپا، دەوڵەتیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، لە حاڵێکدا لە شیلی بەشێک لەم چوونە جێگەیە لە ڕێگەی پڕۆسەی هەڵبژاردن جێبەجێ کرا.

بە ڕای سونکێل ئاوا ئاڵوگۆڕێک دەبێ لەگەڵ کاری چاکسازیی وەکو گۆڕانی بنەمای زەوی (چاکسازییی زەوی)، کەڵکوەرگرتن لە هەناردەی ماددە سەرەتاییەکان بە مەبەستی دابین کردنی باری ماددی بۆ فرەوان کردنی پیشەسازی قورس و مەسرەفی و ڕێکخستنی دووبارەی پیشەسازی بە مەبەستی دوور بوونەوە لە مەسرەفی گرانبەهایانەی (تجملی) کەمینە و مەیل بۆ دابین کردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی زۆرینەی جەماوەر، هاوکات بێت. بە واتایەکی تر ئامانجی سونکێل گەشەی سەرمایەداریی سەربەخۆ، ڕێفۆڕم خوازانە و نەتەوەخوازانە بوو. ئەو لە سەر ئەم باوەڕەیە:

***ئەو شتەی دەیبینین بریتییە لەوەیکە، بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی وڵاتەکانمان لە چوارچێوەی پێوەندییە ئابوورییە نێونەتەوەییەکانی ئەوان داوا بکەین. ئامانج، گەیشتن بە سەربەخۆیی زیاترە تا بتوانین بێ «پاشکۆبوون» و بە بێ لە پەراوێز بوون بە گەشە بگەین. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دەبێ سەرەتا چاکسازیی لە سروشتی ناهاوشێوەی سیستەمی ئێستای پێوەندییە ئابوورییە نێونەتەوەییەکان بکەین.*** [٢٤]

***«سێلسۆ فۆرتادۆ»*** وەکو، «ڕائول پڕبیش» و «سوالْدۆ سونکێل» لە بیرمەندانی ڕێبازی ئێکلا بوو. ئەم ئابووریزانە لە ساڵی ١٩٢٠ لە بەرازیل دایک بوو و لە زانکۆکانی بەرازیل و پاریس وانەی ئابووری تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٤٩ پێوەندیی لە گەڵ «ئێکلا» گرت و لەوێ خوێندنەوەگەلێکی لەسەر پڕۆگرامی گەشەسەندن بۆ بەرازیل ڕێکخست. پاشان بە دانانی پلانگەلێک لە بابەت باشبوونی ئابووریی باکووری ڕۆژهەڵاتی بەرازیل خەریک بوو. فۆرتادۆ وەکو سەرۆکی سودێن، یانی ڕێکخراوی بەڕێوەبردنی پلانە گەشەسەندووەکان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بەرازیل، کاریگەری بەرچاوی لە سەر پڕۆسەی پلاندارشتنی ناوچەیی دانا. بیروڕاکانی ئەو لە مەڕ گەشە و گەشەنەسەندوویی لە کاتی نووسینی زیاتر لە دە کتێب پەروەردە بوو کەوا گرینگترینی ئەوان بە ناوی «پێشکەوتنی ئابووریی بەرازیل»، شیکردنەوەیەکی مێژوویی لە بەرازیل، لە کاتی هاتنی پورتوگالیەکان بۆ ئەو وڵاتە دەخاتە بەر دەستمان. [٢٥]

فۆرتادۆ، لە سەر ئەم باوەڕەیە کەوا گەشەنەسەندوویی ئابووری لە کەمەرە و بە تایبەت ئەمریکای لاتین دەبێ وەکو یەک چالاکی مێژوویی بێتە بەرچاو. بە ڕای ئەو هەوڵدان بۆ دامەزراندنی شێوازی مەسرەفی کە بە هۆی شۆڕشی پیشەسازی سازبووە و لەڕێگەی سیستەمی دابەشکاری کاری نێونەتەوەیی بڵاو بۆوە، هۆی سازبوونی سەرمایەداری کەمەرە بوو. ئەم چەشنە لە سەرمایەی توانای داهێنانی نییە و پشتبەستوو بە بڕیارگەلێکە کەوا لە دەرەوەی ئەو دەبەسرێ. [٢٦]

فۆرتادۆ لە ڕاپۆرتە گشتیەکەی خۆی جەختی لە سەر کاریگەری سەرمایەداری بازرگانی پورتوگال لە بەرازیل کردووە، کاریگەرییەک کەوا لە ڕێگەی پیشەسازیی شەکر و بازرگانی کوێلەوە بەڕێوە دەچوو. ئەو لە شیکردنەوەیەکدا کەوا لەسەر پەرەسەندنی ئابووری «باکووری ڕۆژهەلات»لە نێوان سەدەکانی شانزدە و حەڤدە پێشکەشی کرد وێنەیەک لە دابەزین و قەڵەمبازلێدانی پیشەسازی شەکر و چالاکییە ئاژەڵدارییەکانی نیشان دا. ئاکامی لێکۆڵینەوەکەی ئەو ئەمە بوو کەوا دابەزینی بەرەبەرەی پیشەسازیی شەکر هۆی مانەوەی ئابووری بژیویانەی جەماوەر و کێشەکانی دوواڕۆژ بووە:

***بەم چەشنە "باکووری ڕۆژهەڵاتی بەرازیل» لە سیستەمێکی ئابووری چالاک و بەهرەمەند بە سیستەمێک گۆڕا کە لەوێدا بەشێکی هەرەزۆر لە دانیشتوانی تەنیا بۆ دابینکردنی کەرەسە سەرەتاییەکانی مانەوەی خۆیان کاری بەرهەمهێنانیان دەکرد. پرش و بڵاوی بەشێک لە دانیشتوان بە هۆی چالاکییە ئاژەڵدارییە بەربڵاوەکان تێکچنراوی لە دابەشکاری کار پێک هێنابوو و ئەوەش بە نۆرەی خۆی بوو بە هۆی گەڕانەوە بۆ تەکنیکە سەرەتاییەکان تەنانەت لە چالاکییە پیشەسازییە دەستکردەکاندا.*** (٢٧)

ئەو تێگەیشتنە لە مێژووی بەرازیل، نموونەیەکی شیکراوە لە گەشە و گەشەنەسەندوویە کەوا لە گشت شوێنەوارەکانی «فۆرتادۆ» بەر چاو دەکەوێت. ئەو لە نووسراوەیەکی خۆیدا باسی کەڵەکەکردنی سەرمایە بە تایبەت لە ئەورووپا دەکات. بە ڕای فۆرتادۆ ئەورووپا لە سێ ڕێگەی جیاوازەوە کەلێنی خستووەتە ئابووری جیهانی لە سەدەی هەژدەیەم و دواتریش:

١) تێکدانی دامودەزگا ئابوورییە پیشەییەکانی پێش سەرمایەداری،

٢) تێکدان و دەستکاریی سنوورەکان لەو شوێنانە کە زەوییە داگیرنەکراوەکان بوونی هەیە،

٣) پەرەپێدان و کاریگەری خستنەسەر ناوچە نشینگەکان، بەڵام ناسەرمایەداری.

بەرهەمی ئەم چالاکییانە، سەرهەڵدانی«بنەما ناهاوڕەگەزەکان» بوو، کە هەندێک لەوان وەکو بەشێک لە سیستەمی سەرمایەداری کاریان دەکرد و ئەوانی تر لە گەڵ پاراستنی تایبەتمەندییە پێش سەرمایەدارییەکانی خۆیان لەنێو سیستەمی کۆندا مانەوە. فۆرتادۆ ناوی «ئابووری دووانە« دەداتە پاڵ ئەم دۆخە، و باوەڕی وایە کە گەشەنەسەندوویی «پڕۆسەیەکی مێژوویی دیاریکراوە کەوا ئابوورییە گەشەسەندووەکانی ئێستا لەو قۆناغە تێنەپەڕیون (بە ناچار)». ئەو هەروەها بەڵگە دێنێتەوە کەوا گەشەنەسەندوویی بەشێک لە پڕۆسەیەکە کە بە هۆی «کاریگەری ئاژانسی مۆدێڕنی سەرمایەداری لە سەر بنەما کۆنەکان» دروست بووە.[٢٨]

هەروەها فۆرتادۆ پشکنینی لەسەر بنەما کۆمەڵایەتییە ئابوورییەکانی گەشەنەسەندوویی کردووە. ئەو چینی دەسەڵاتدار کەوا لە گرووپە جیاجیاکان پێکهاتبوو لە لوتکەی ئەم چەشنە ئابوورییانە دادەنا کە ئاسایانە لەگەڵ یەکتر دوژمنایەتیان هەبوو و لە پێشکەشکردنی پلانگەلێک بۆ گەشەی نەتەوەیی ڕێککەوتنیان لەگەڵ یەکتر پێک نەدەهێنا. ئەم گرووپانە بریتی بوون لە خاوەن زەویە نەریتییەکان کەوا پشتیان بە بازرگانییە بیانییەکان بەستووە و لایەنگرانی بازرگانی ئازاد کەوا دژ بە دەستێوەردانی دەوڵەتین و ئەو سەرمایەدارانەن کەوا لە بازرگانی ئازاد پشتیوانی دەکەن، بەڵام لە بواری بازرگانی بیانیدا پشت بە دەزگای دەوڵەتی دەبەستن و هەروەها سەرمایەدارگەلێک کەوا لە لایەن بازاڕی ناخۆ پشتیاونی دەکرێن، ئەوانە لایەنگرانی سیاسەتگەلی پشتیوانی کەرن و لە دەوڵەت بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردنی سەرچاوەکان لە پێناو بەرژەوەندیی خۆیان کەڵک وەردەگرن. لە ژێر چینی دەسەڵاتدار، کۆمەڵێکی زۆر لە کرێکارە شارییە مووچەخۆرەکان کەوا ئیشی خزمەتگوزاریان هەیە، چینی کرێکارە پیشەییەکان و چینێک لە جووتیاران بوونیان هەیە. فۆتاڕدۆ لە سەر ئەم باوەڕە بوو، کە بە هۆی

نزمبوونی ئاستی زانیاری چیانییەتی و نەبوونی ئایدیالۆژی ڕێکخراویی بۆ چینی کرێکار، وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە ئاسایی تووشی تێکهەڵچوونی چینایەتی نابن.

ئەو تێبینییە سیاسی و ئابوورییانە وای لە فۆرتادۆ کرد دان بەوە دابنێ کەوا "جێگۆڕکێی شێوازە مەسرەفییەکان"، لەڕێگەی "گەشەی پیشەسازی" و "چوونە جێگەی هاوردەکان" لە نێوخۆ، بووتە هۆی پێشکەوتنی سەرمایەداری کەمەرە. سەرمایەداری کەمەرە ناتوانێ داهێنان دروست بکات و بۆ گۆڕانکاری ئابووری لە نێوخۆ پشتی بە بڕیارە دەرەکییەکان بەستووە. فۆتاڕدۆ ئەم دۆخە بە »پاشکۆبوونی دەرەکی» ناو دەبات. بە وتەی فۆتاردۆ، پاشکۆبوونی دەرەکی دەبێتە هۆی ئەوەی کە پڕۆسەی گەشەنەسەندوویی خۆڕاگر (خودنگهدارنده) لە هەندێک وڵاتی تایبەت دروست بێت. ئەو ئەم تیۆرییە لە لایەنی سیاسی و ئابوورییەوە بەم چەشنە ڕاڤە دەکات:

***بەردەوام لەگەڵ فرەوانبوونی قازانجی ئابووری، جێگۆڕکێ و جێنشینی شێوازە مەسرەفییە نوێیەکان، یان بە واتەیەکی تر نوێسازی شێوە ژیانی کەمایەتییەکی بچووک لە دانیشتوان، دێتە ئاراوە. لە ماوەی سەردەمی گەشەسەندنی پیشەسازیدا کەوا پشتی بە چوونە جێگەی هاوردەکان بەستووە، داواکاری بیانی بۆ مادده سەرەتاییەکان ئیتر ڕۆڵێکی گرینگی لە گۆڕانکارییە ئابوورییە پاشکۆکان نەدەگێڕا. هاوشێوەسازی (شبیەسازی) پێشکەوتنە تەکنۆلۆجییەکان بۆ ماوەیەک پڕۆسەی گەشە تێر دەکات. بەڵام هەر کات کەرەسە سەرەکییەکانی ڕەوتی جێنشینی، کۆتایی پێ بدرێ، ئەم ڕۆڵە گرینگە دەبێ بە بەرهەمە نوێیەکان بدرێ کەوا بۆ کەمایەتی دەوڵەمەند لە نێوخۆ بەرهەم دێت. ئەوە تەنیا کاتێک ئەگەری هەیە کەوا ڕەهەندە ئابوورییەکان ڕێگە بدەن پڕۆسەی گشتی پیشەسازی بەڕێوە بچێت و هەروەها سیستەمی سیاسی هێزی سەرکوتی پێویستی بۆ پاراستنی نێوەندگری (تمرکز) دەرماڵەکان هەبێت.*** [٢٩]

کەوایە، پاشکۆبوونی دەرەکی و گەشەنەسەندوویی لە قۆناغە جیاجیاکانی گەشەدا بەردەوامە. لە قۆناغی سەرەتایی، فرەوانبوونی هەناردەی ماددە خاوەکان بە قازانجی کەمایەتییەکی دەوڵەمەندە کە شێوازە مەسرەفییەکانی خۆیان لەگەڵ بەهاکانی وڵاتە نێوەندەکان بەراورد دەکەن. لە قۆناغی پێشکەوتووتردا چوونە جێگەی هاوردە دەتوانێ بۆ گەشەی نێوخۆ بەسوود بێت، ئەگەرچی بە شێوەی کاتی بێت و لە کۆتاییدا گەشەی هەمەلایەنە پیشەسازی دەتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات. بەڵام لێرەش گەشەنەسەندوویی سەرمایەداریی کەمەرە خۆی هەمیشەیی دەکاتەوە، بە تایبەت لە بەرامبەر نەبوونی هاوسەنگی لە سیستەمی نێونەتەوەیی کەوا بە هۆی چالاکییەکانی کۆپمانیا فرەنەتەوەکان سازبووە. ئەم کۆمپانییانە بەرژەوەندییەکانیان لە فرەوانبوونی قازانجوەرگرتن لە وڵاتە پاشکۆکان بە دەست دێنن و ئەوەش دەبێتە هۆی هاوسەنگ نەبوونی سیستەمی نێونەتەوەیی.[٣٠]

«فۆڕتادۆ»، «پڕبیش» و «سونکێل» لە ستراتیجییەکی بنەماییدا کە نێوەندە سەرمایەدارییەکانی لەناوچە کەمەرەکان جیا دەکردەوە، لەگەڵ یەک هاوبیر بوون و هەر سێ لەوان دەیانهەویست گەشەنەسەندوویی بە گەڕاندنەوە بۆ سەر ئاڵوگۆڕەکان بخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە. پڕبیش، سەرنجی بە کاریگەری نەرێنی نرخەکان لە نێوان خولە چالاکییە ئابوورییەکان دەدا. ئەو شیکردنەوەی خۆی بە شیکردنەوەییەکی جیهانی دەزانی، بەڵام سەرنجی بە ستراتیجییە نوێ کلاسیک و مارکسییەکان نەدەدا. ئەو ناکۆکییە نێوخۆیەکانی کەمەرەی بە نێوەندگری (تمرکز) داهات لە دەستی خاوەندارانی کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان و نەک سەرجەم دانیشتووان گرێدەدا و ئەنجامێک کەوا ئەو پێی گەیشت ئەوە بوو، کەڵەکەکردنی سەرمایە لە کەمەرە لە ئاستی پێویستدا نییە کە بتوانێ گشت وزەکانی کار بۆ لای خۆی ڕابکێشێ.

سونکێل هەروەها لەگەڵ ئەوە بوو کەوا کەڵەکەکردنی سەرمایە بەرەو لای بەرژەوەندی گرووپگەلێکی تایبەت خوار دەبێتەوە. ئەو پاشکۆبوون و پەراوێزبوونی وەکو ڕەنگدانەوەیەک لە سەرمایەداری دەوڵەتی پاشکۆ و چالاکی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان لە قەڵەم داوە. ڕێگەچارەی ئەو بۆ ئەم کێشەیە، بەڕێوەبردنی هەندێک کاری چاکسازیی وەکو؛ چاکسازیی زەوییەکان، قازانجوەرگرتن لە هەناردەی ماددە سەرەتاییەکان بۆ دابینکردنی «بەپیشەسازی بوون»، و سەرلەنوێ ڕێکخراوەکردنی پیشەسازی بۆ دووربوونەوە لە داواکارییە مەسرەفییەکانی کەمایەتی دەسەڵاتدارە.

فۆتاڕدۆ بە دیاری کردنی کەلێنە سەرمایەدارییەکان لە ئەورووپا خەریکی شرۆڤەکردنی بنەما ناهاوتاکان و ئابوورییە دووانەکانی کەمەرە بوو. ئەو هەروەها بنەمای چینە کۆمەڵایەتییەکانی لە پێوەندیی لەگەڵ سەرمایەداری کەمەرە و پاشکۆبوونی دەرەکی دەدی. فۆتاڕدۆ هاودەنگ لەگەڵ پڕبیش و سونکێل بوونی ئەم دۆخەی بە شێوازی مەسرەفی کەمایەتی دەوڵەمەند پەیوەند دەدات. ئەو لە سەر ئەم باوەڕە بوو کەوا گەشەنەسەندوویی لە دۆخی سەرمایەداری کەمەرەدا زاڵ دەبێت و ڕێگەچارەی چاوەڕوان نەکراوی ئەو بۆ ئەم کێشە، پلانڕیژیی نێوەندگر (متمرکز) بە مەبەستی پەرەپێدانی سەرمایەداری سەربەخۆیە.

لە حاڵێکدا «پڕبیش» "چوونە جێگەیی هاوردە" و "گەشەی پیشەسازی" وەکو پێشەکی گەشەی سەرمایەداری سەربەخۆ و نەتەوەیی دەبینێ، «سۆنکێل» و «فۆتاڕدۆ» سنوورگەلێکی هزری و ئەزموونییان لەم ستراتیجییە دیتۆتەوە. بۆیە سۆنکێل سەرنجی خۆی خستە سەر چاکسازییەکانی دیکە و بەم شێوەیە فۆتاڕدۆ جەختی لە سەر پلاندارشتنی نێوەندگر کرد. هەر کام لەم سێ بیرمەندە خەریکی شیکردنەوەی ڕێکخستنی ناڕێکی کۆمەڵگە بە دەست سەرمایەداری بیانی بوون، بەڵام سونکێل و فۆتاردۆ پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە سەرمایەداری ناتوانێ لە کەمەرە

«دیسان بەرهەمهێنان» بکاتەوە و لە خزمەت پێداویستییەکانی زۆرینەی جەماوەر بێت.[٣١]

بەگشتی ڕێبازی « ئێکلا » پاش پەسەندکردنی ئەم گریمانەیە کەوا گەشەنەسەندوویی ئەمریکای لاتین پێوەندیی بە سیستەمی ئابووری نێونەتەوەیی و دابەشکردنی جیهان بە نێوەند و کەمەرە هەیە، بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ دەستێوەردانی بۆرژوازی نێونەتەوەیی چەند پرنسیپیک پێشکەش دەکات کەوا بریتین لە:

١) گۆڕانکاری لە گەشەی دەرەوە بەرەو لای گەشەی نێوخۆ کە لە ڕێگەی چەشنە ئابوورییەکی هەرێمی و دەوڵەتی کۆنترۆڵ دەبێ و پاشکۆبوون بە بازرگانی بیانی سنوردار دەبێتەوە.

٢) کەڵک وەرگرتن لە سیاسەتە پیشەسازییەکان بەجۆرێک کە ئۆلیگارکی نەریتی لاواز بکات و بەشداری چینی مامنێوەندی و خوارەوەی کۆمەڵگە لە کێشە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی ناو کۆمەڵگە بە هێز بکات.

٣) تێکەڵکردنی کۆمەڵانی جەماوەری دێهات لە سیستەمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگە لە ڕێگەی چاکسازیی لە زەوییەکاندا.

٤) بەهێزکردنی دەوڵەتی گەشەخواز و سەربەخۆی سیاسی.

٥) بە دەستهێنانی چەشنێک ئایدیالۆژی گەشەخواز لە چوارچێوەی شێوازی گەشەی نێوخۆ و وێڕای جەخت لە سەر ستراتیجی چوونە جێگەی هاوردە.[٣٢]

سەرەتا لە دەیەی ١٩٥٠، ستراتیجی پێشنیارکراوی «ئێکلا» لەگەڵ پێشوازی سارد لە لایەن دەوڵەتەکانی ئەمریکای لاتین ڕووبەڕوو بۆوە و هەر ئەم ڕووبەڕووبوونەوە بووە هۆی ئەوەی کە »ئێکلا» نەتوانێ هەندێک کاری شۆڕشگێرانەی خۆی وەکو چاکسازیی زەوییەکان پێشکەش بکات. لە ڕاستیدا گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکان، هیچکات وەکو پلانی یەکەمی «ئێکلا» هەنگاوی بۆ دانەنرا. تا ڕادەیەک دەتوانین بڵێین کەوا ستراتیجی

پێشنیارکراوی «ئێکلا» لە ڕادەبەدەر گەش بینانە بوو؛ چونکە وایدەزانی تایبەتمەندییە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی گەشەنەسەندوو بە شێوەیەکی خودکار (ئۆتۆماتیک) لە ڕەوتی « بە پیشەسازی بوون» لەنێو دەچن. یان بە واتایەکی تر «بە پیشەسازی بوون»، خاڵی کۆتایی لە سەر سەرجەم کێشەکانی گەشە دەبێت. [٣٣]

بە داخەوە بە هۆگەلێکی وەکو زۆربوونی دەستێوەردانی دەوڵەت و سیاسەتە تاریفە تووندەکان، هەروەها کەم بوونەوەی کوالیتی کەلوپەلە مەسرەفییەکان و گرینگتر لە هەموان دامەزراندنی پیشەسازی لە سەر بنەڕەتی شێوازە مەسرەفی و کۆنەکان و کەموکۆڕییەکان و چەشنە پاشکۆبوونێک لە بابەت تەکنۆلۆجی لە وڵاتانی کەمەرە، بووە هۆی ئەوەی کە ئەم ستراتیجی و شێوازە نەتوانێ پلانێکی سەرکەتوو لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین بێت. ئەو بابەتە بەستێنێکی بۆ ڕەخنەگرتن لە سەر ڕێبازی «ئێکلا» ساز کرد. [٣٤] بە واتایەکی تر شکستی پرۆگرامە چاکسازییەکانی «ئێکلا» ڕێبازی پاشکۆبوونی وا لێ کرد کە پرۆگرامێکی بنەڕەتی لە فۆرمی نوێمارکسیزم پێشنیار بکات.

هەر وەکو لە باسی دواتر دەیبینین لەنێوەڕاستی دەیەی ١٩٦٠ زۆر لە چەمکە سەرەکییەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون بۆ ڕەخنەگرتن لە پرۆگرامە چاکسازییەکانی «ئێکلا» و هەروەها ڕێبازی نوێسازی لە لایەن ئەم نەریتە نوێ مارکسییەوە ساز بوو.

### نوێمارکسیزم:

ڕووبەری بیری مارکسیزم لەگەڵ بۆچوونە جیاجیاکان دەستی داوەتە پشکنینی قووڵ لەمەڕ پاشکۆبوون و نایەکسانی. ئەگەرچی هەم مارکسیستە بناغەییەکان و هەم نوێ مارکسیستەکان، کۆلۆنیالیزم و ئێمپڕیالیزمیان لەگەڵ دیاردەی پاشکۆبوون پەیوەند دەدا، وێرای ئەوەش هەر دەستەیەک بە پێی تێڕامانی خۆی دەربڕینی لەسەر نووسراوەکانی مارکس داوە.

مارکسیستە بناغەییەکان، لە سەر ئەوە کۆکن کەوا خوێندنەوەی گەشە تا ئەو جێگەیەی کەوا ئەو وشەیە ئاماژە بە گۆڕانی یەک لە دوای یەکی بنەما ئابووری ـ کۆمەڵایەتییەکان لە یەک کۆمەڵگە و لە پرۆسەیەکی مێژوویی دەکات، لە بنەڕەتدا بابەتێکی مارکسیستییە. ئەوان وەکو «لینین» لە سەر ئەم باوەڕەن، سەرمایەداری توانا بە ڕاکێشانی زێدەی بەرهەمهێنان (کە دیسان بەرهەمهێنان دەکاتەوە) نییە و بازاڕی بیانی کەلوپەلە سازکراوەکان بۆ وڵاتە سەرمایەدارە پیشەسازییەکان گرینگییەکی تایبەتی هەیە. «مارکس» بە لێدوان لە سەر سەرمایەداری ئینگلیس، وەکو نموونەیەکی کلاسیک لە گەشەی سەرمایەداری، بانگەشەی ئەوە دەکات کە جیهانی گەشەنەسەندووە بە ناچار و کەم یان زۆر هاوشێوەی ئەم پرۆسە مێژووییە گەشە دەکات و ئەم بابەتە وەکو «یاسا سروشتییەکانی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری» بۆ وڵاتانی گەشەنەسەندوو پێناسە دەکات. (٣٥)

قوتابییەکانی ڕێبازی مارکس، بە سەرنجدان بە ڕووداوە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکان و گۆڕانکاری لە بنەمای سەرمایەداری سەدەی بیستەم، دەستیان بە لێکۆڵینەوە نوێیەکان کرد و بەم ئەنجامە گەیشتن کەوا مارکس لە هەندێک بواری بنەڕەتی تووشی هەڵەی جددی بووە. یەکێک لەو هەڵانە پێوەندیی بە وڵاتە نیوە دەرەبەگایەتییەکانی وەکو کوبا، ڤییەتنام و کامبۆج بوو. ئەم وڵاتانە بێ تێپەڕبوون لە قۆناغی سەرمایەرداری پێگەیشتوو (بالغ) بەرەو سوسیالیزم هەنگاویان هەڵێنا بوو. لاوازییەکی دیکە لە تیۆرییەکانی مارکس، پێوەندیی بەکاریگەری سەرمایەداری لەسەر گۆڕانکاری ناوچە «دواکەوتووەکان» هەیە. مارکس لە سەر ئەم باوەڕە بوو کەوا سەرمایەداری بە هۆی مەیل بۆ جیهانیبوون، پێوەندییە سەرمایەدارییەکانی لەناوچە دواکەوتووەکانی جیهان پەرە پێداوە. دەزگا پێش سەرمایەدارییەکان دەڕوخێن و دەزگا مۆدێرنە سەرمایەدارییەکان ساز دەبن. مارکس باوەڕی وابوو، ئەم گەشە نۆرماتیکە لەگەڵ تالانی ئاشکرای کۆلۆنییەکان بە دەستی هێزە گەورە سەرمایەدارییەکان و لەگەڵ هەمان یاسامەندی سەرمایە و کار

له سەرمایەداریی پێشکەوتوودا کە خاوەن تایبەتمەندی ئاشتی وەرنەگرە، بەڕێوە دەچێت. مارکسیستەکان دوواتر، له سەر ئەم باوەڕە بوون کە شاهیدە مێژووییەکان و ڕاستییە بەرچاوەکان بە پێچەوانەی هزری مارکس باس لەوە دەکەن کەوا گەرچی سەرمایەداری ڕۆژئاوا له هەندێک جێگەی دەگمەن یارمەتی بە گەشەی کۆلۆنییەکان دەکا، بەڵام چەوساندنەوەی سەرمایەداری، دابەشکاری نایەکسانی کاری نێونەتەوەیی، جێگۆڕکێی بەردەوامی زێدەی وڵاتە کۆلۆنی و نیوەکۆلۆنییەکان، دەبێتە هۆی نایەکسانی زۆرتر و کەڵەکەکردنی سەرمایە لە نێوەند و کەڵەکەکردنی هەژاری له وڵاتە گەشەنە- سەندووەکان.[٣٦]

له پێوەندیی لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێیەم و لەژێر تیشکی دۆخی ڕاستەقینەی نیوەی سەدەی بیستەم، پێویستی بە »پێداچوونەوە« یا دەربڕینێکی دووبارە لەسەر مارکسیزم هەستی پێ دەکرا. پڕۆسەی پێداچوونەوە بە دەستوورەکانی مارکسی له ڕۆژئاوا له لایەن «جان ئەتکینسۆن هابسۆن» و «ڕۆزا لۆکزامبۆرگ» دەستی پێکرد. ئەم دوو نووسەرە بە شێوەی تایبەتی خۆیان، ڕوانگەی باویی ئیمپریالیزمیان خستە ژێر ڕەخنەوە. هەروەها «ئانتۆنیو گرامشی» شیکردنەوەیەکی له کۆمەڵگە له ژێر ناوی «هێژمۆنی» پێشکەش کرد. ئەو ئەم چەمکەی بۆ دەربڕینی پێوەندیی نێوان «کۆلۆنییە چەوساوەکان»ی باشووری ئیتالیا و دوورگەکان لە لایەکەوە و «مێترۆپۆلی سەرمایەداری» باکووری ئیتالیا له لایەکی ترەوە بە کار هێنا. «گرامشی» له خوێندنەوەکانی خۆی له سەر گەشەنەسەندوویی له نێوخۆی وڵاتێک نموونەیەکی پێشکەش کرد کە دواتر بە مۆدێلی «کۆلۆنیالیزمی نێوخۆیی» ناسرا. له سەردەمی پاش شەڕی دووەمی جیهانی، نوێمارکسیزم بە هێزتر له پێشو و بە ئەزمونێکی زیاتر هەوڵی دا تا هەرچی زیاتر بە سەر لاوازییەکانی مارکسیزمی بنەڕەتی زاڵ بێت. ڕێفۆرمگەلێک کە کەسایەتیە لێهاتووەکانی وەکو«ژان پۆل سارتر»و«جۆرج لوکاچ» پێشکەشیان کرد، ژیانێکی نوێی بە جەستەی بێ جووڵەی مارکسیزم دا.

«سارتر» کولتوور وەکو پاژی جیانەکراوە لە هەر چەشنە خوێندنەوە و ناسینێک لە مەڕ بزووتنەوەی ئافریقاییەکان لە بەرانبەر کۆلۆنیالیزم دادەنێ و «لوکاچ» لە بۆچوونی خۆیدا بانگەشەی کرد کەوا مارکسیزم بە ناچار بە مانای لە پێشتربوونی بزوێنەرە ئابوورییەکان نییە، بەڵکو پێداگری لەسەر شیکردنەوەی سەرجەم پێوەندییە مرۆڤییەکان دەکات. [٣٧]

هەڵبەت «پۆل باران»، دەتوانین وەکو بە ناوبانگترین و کاریگەرترین نووسەری نوێ مارکسیست لە پاش شەڕی جیهانیی دووەم ناو بەرین. تا ئەو جێگەیە کەوا »ئایدێن فوستێر کارتر»، پۆل بارانی وەکو « باوکی دامەزرێنەری نوێمارکسیزم» ناو ناوە. کتێبی بە ناوبانگی ئەو «ئابووری سیاسی گەشە« (١٩٦٨) کتێبێکی ڕەخنەگرانەیە کە لەمەڕ کێشەکانی گەشەنەسەندوویی نووسیوێتی. لەم کتێبەدا «باران» هەوڵی داوە گەشەنەسەندوویی جیهانی سێیەم لە بوارێکی ترەوە شی بکاتەوە. «باران» بە لێدوان لە سەر زێدەی ئابووری، بانگەشەی ئەوەی کرد کە سەرمایەداری پاوەنی، بە ڕووخانی (روبنا) سیاسی کۆنەپەرستانە کارامە نییە و ناتوانێ ڕیفۆرم ساز بکات. «باران» بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم لاوازییانە، پشتیوانی لە چەشنە پلانێکی نێوەندگری (متمرکز) «عەقڵانی» دەکرد.

خاڵە گرینگەکانی چوارچێوەی لێدوانی نوێمارکسیزم دەتوانین بە شێوەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- گەشەنەسەندوویی ئابووری پرۆسەیەکە کەوا تایبەتمەندی زاڵی ئەو بریتییە لە ڕاگوێستنی هەمیشەیی زێدەی بەرهەمهاتوو لە کەمەرەوە بۆ ئابوورییە پێشکەوتووە سەرمایەدارییەکان. (زێدە بریتییە لە جیاوازیەک کە لە نێوان بەرهەمی ڕاستەقینە یا وزەکی (بالقوە)و مەسرەفی ڕاستەقینەی بنەڕەتی هەیە. )

٢- لە ئەنجامدا، وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە تایبەتمەندی نزم بوونی داهاتە تاکە کەسییەکان و نرخی کەمی کەڵەکەکردن دیاری دەکرێن.

٣- کەوایە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، گەشەی ئابووری هەڵگری سەرمایەگوزاری دووبارە لە ئاستی نەتەوەیی و لە ئەنجامدا گەشەی بەرهەمی نەتەوەیی و دابەشکاریی یەکسانی ئەوە.

٤- ئاسۆگەی (چشم انداز) گەشەی ئابووری سەرمایەدارانەی هەر وڵاتێک دۆخ و پێگەی ئەم وڵاتە لە ئابووری نێونەتەوەیی دیاری دەکات.

٥- دوو ئەندامی بنەڕەتی لە شێوازی لێدوانی نوێ مارکسیستی بریتین لە: پەسەندکردنی ڕوانگەیەکی مێژوویی و جەختکردن لەسەر ڕێکخستنی چینایەتی بۆ کۆنترۆڵی زێدە لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان.

٦- لە ڕابردوودا، سەرمایەدارییە پێشکەوتووە پیشەسازییەکانی ئەمڕۆ، وڵاتە کەمەرەکانیان بەرەو سیستەمێکی ئاڵوگۆڕی نایەکسان هان دەدا تا بتوانن لەم ڕێگەیەوە زێدەی ئابووری لە کەمەرە بکێشنە دەرەوە.

٧- ئەم پێوەندییە ئاڵوگۆڕە نایەکسانە کە زۆرجار بە زورەملێ داسەپاوە، تا ئەمڕۆ هەروا بەردەوام ماوەتەوە و بە گشتی هەر ئەم بابەتە لەمپەری بۆ گەشەی سەرمایەداری لە کەمرە دروست کردووە.

٨- ئاڵوگۆڕی نێونەتەوەیی لەگەڵ نێوەند، دەبێتە هۆی لەنێوبردنی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی پێش سەرمایەداری لە کەمەرە و ئەوەش زۆرجار هاندانی گەشەی سەرمایەداری پیشەسازی خۆوڵاتی لە کەمەرە لەنێو دەبا.

٩- گەشەی پیشەسازی کە هەنووکە لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ڕووی داوە، زۆرجار بریتییە لە زنجیرەیەکی سنووردار لە پاوەنە پیشەسازییەکان کە لە دەستی سەرمایەدارە بیانییەکان یا سەرمایەدارە نێوخۆییە پاشکۆکاندایە کە قازانج و سوود بۆ نێوەند دەگەڕێننەوە.

١٠- چینە دەسەڵاتدارەکان لە کەمەرە (خاوەن زەوییەکان، بۆرژوازی بازرگانی، خاوەندارانی سەرمایەی پاوەنی و سەرمایەدارە بیانییەکان) بە هۆی سەرچاوەکانی داهاتەکانیان، حەزیان لە گەشەی «سەرمایەداری بەرهەمهێنان» لە وڵاتی خۆیان نییە.

١١- کەوایە ئابوورییە گەشەنەسەندووەکانی ئەمڕۆیی، بە هۆی گۆڕانی دۆخی نێونەتەوەیی، توانا بە تێپەڕبوون لە هەمان قۆناغە گەشەکان کە پێشتر ئابووریە پێشکەوتووە پیشەسازییە نوێیەکان تێیان پەڕاندووە، نین. قۆناغی گەشەی سەرمایەداری نەتەوەیی، کە لەوێدا سەرمایەداری لە بەرزترین پلەی جمووجوڵی خۆیدایە، لە کەمەرە لە ژێر سێبەری ڕکەبەرایەتی بیانی دایە.

١٢- گەشەی هەمەلایەنەی ئابووری تەنیا لە دوای شۆڕش (شۆڕشی سوسیالیستی) ڕوو دەدات.

«دایانا هانت»، چەند هۆکارێکی هاوبەشی لە شێوازی نوێ مارکسیستی دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ دەستنیشان کردوە. (٣٨)ئەوان لەسەرەتای شیکردنەوە- کانیان ئاوڕیان داوەتەوە سەر ئابووری سیاسی مارکس و بە گشتی گریمانەکانی خوارەوەیان خستۆتە بەرچاو:

١- مارکس لە پێشبینی کردنی کاریگەرییەکانی سەرمایەداری لە سەر ئابوورییە کەمەرەکان کەمترخەمی کردووە.

٢- کاریگەری تیۆریی لینین، بە چەشنێک گەشەی بە مارکسیزم داوە کەوا پێوەندییەکانی نێوەند و کەمەرە لە سەرجەم ئابووری سیاسی مارکسیستی لەخۆ دەگرێ.

٣- کردەی بەرامبەری ئابوورییە کەمەرە و نێوەندەکان، هاوکاتە لەگەڵ زاڵبوونی نێوەند بەسەر بازرگانی و سەرمایەگوزاریی بەرهەمهێنان. ئاکامی ئەم کارە ڕەوتی بەردەوامی جێگۆڕکێی زێدە لە کەمەرە بۆ نێوەندە.

٤- هەر ئەم کردە بەرامبەرە دەبێتە بەربەست بۆ، سەرهەڵدانی سەرمایەداری ڕکەبەرایەتی خۆولاتی لە کەمەرە.

٥- پیشەنگەکان لە کەمەرە، بەشێکی زۆر لە داهاتەکانی خۆیان لە ڕێگەی چالاکی بەرهەمهێنان بە دەست ناهێنن (بازرگانی و کرێی زەوی). کاریگەری سەرمایەی پاوەنی نێوەند لە سەر کەمەرە بە شێوەیەکی بەرچاو

دەبێتە هۆی فرەوانبوونی دەرفەتە بازرگانییەکانی سەرمایەی بازرگانی خۆولاتی.

٦- داهاتەکانی پێشەنگەکان لە کەمەرە زۆرجار بۆ خۆشگوزەرانی و سەرمایەگوزاری بازرگانی بە کار دەهێنرێ و یان ئەوەی کە لە ئابوورییە مێترۆپۆلەکاندا (نێوەند) سەرمایەگوزاری دەکرێ.

٧- هەر چەشنە سەرمایەگوزاریی خۆولاتی سنوردار بە بەرهەمهێنان لە کەمەرە، هەر لە سەرەتاوە شوناسێکی پاوەنی هەیە.

٨- سەرمایەی پاوەنی مێترۆپۆل (نێوەند) و دەوڵەتە مێترۆپۆلەکان (نێوەند) بە دوای پاراستنی بارودۆخی ئێستا لە ڕێگەی دامەزراندنی ڕژیمە کۆمپرادۆرەکان لە کەمەرەن.

٩- تەنیا یەک شۆڕشی سوسیالیستی دەتوانێ ڕەوشی گەشەی هەمەلایەنە لە کەمەرە ساز بکات.

هەڵبەت لە بابەت چۆنێتی ڕوودانی شۆڕشی سوسیالیستی لە جیهانی سێیەم جیاوازی بیروڕا لە نێوان مارکسیستە بنەڕەتییەکان و نوێ مارکسیستەکان هەیە. بە واتایەکی دیکە مارکسیستە بنەڕەتییەکان لە ستراتیجییەکی دوو قۆناغی بۆ شۆڕش پشتیوانی دەکەن، بە چەشنیک کە شۆڕشێکی بورژوازی پێش ڕوودانی شۆڕشی سوسیالیستی، بە پێویست دەزانن. بە هۆی ئەوەی کە زۆربەی ولاتانی جیهانی سێیەم لە دۆخی دواکەوتوویی دان، چاوەڕوانیی مارکسیستە بنەڕەتییەکان ئەوەیە کەوا بورژوازی پێشکەوتوو لەم ولاتانە بتوانێ قۆناغی سەرەتایی شۆڕشی بورژوازی تێپەڕکات. ئەوە لە حاڵێکدایە کە نوێ- مارکسیستەکان باوەڕیان وایە جیهانی سێیەم لە دۆخی ئەمڕۆی خۆیدا دەتوانێ شۆڕشی سوسیالیستی بەڕێوە ببات. ئەوان شۆڕشیان بۆ ئەمڕۆ دەوێت. بە ڕای نوێ مارکسیستەکان، بۆڕژوازی، دەستکرد و ئامێری ئێمپریالیزم بووە و توانای بەڕێوەبردنی ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆی یانی ئازادکردنی وزە بەرهەمهێنەرەکانی نییە.

لە لایەکی ترەوە لە بابەت ڕوودانی شۆڕشی سوسیالیستی، مارکسیستە بنەڕەتییەکان حەز دەکەن ئەو کارە بە دەستی کرێکارە پیشەسازییەکان لە شارەکان جێبەجێ بکرێت؛ لە حاڵێکدا نوێ مارکسیستەکان زۆرتر ڕاکێشی ڕێگەیەکن کەوا وڵاتانی چین و کوبا بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی سوسیالیستی تێیان پەڕاندووە. نوێ مارکسیستەکان هیوایەکی زۆریان بە توانای شۆڕشگێڕی وەرزێرەکان لە دێهاتەکان هەیە و شەڕی چریکی سوپای جەماوەری بە باشترین ستراتیجی سەرکەوتن لە شۆڕش دەزانن.

**پرەنسیپ و بنەما تیۆرییەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون:**

ڕێبازی پاشکۆبوون هەر وەکو ڕێبازی نوێسازی بەشی زۆر نایەکسان و ناهاوسەنی تێدایە و تیۆرییداڕێژانی ئەم ڕێبازە بە هۆگرییە سیاسیەکان و بۆچوونی ئایدیالۆژیکی جیاواز، لە نێوان لقە جیاوازەکانی زانستی کۆمەڵایەتی سەریان هەڵداوە و بۆچوونی خۆیان لەسەر وڵاتە جیاوازەکان لە ئەمریکای لاتین و ناوچەکانی تری جیهان چەقبەستوو کردووە. ئەوان بە پێچەوانەی بۆچوونە ئایدیالۆجی و سیاسییە جۆرواجۆرەکانی خۆیان لەسەر پرەنسیپ و بنەما بنەڕەتییەکانی خوارەوە کۆکن:

یەکەم ئەوەی کە، پاشکۆبوون وەکو پرۆسەیەکی زۆر«گشتی»دەخەنە بەر چاو کە بۆ گشت وڵاتانی جیهانی سێیەم بوونی هەیە. ئامانجی ڕێبازی پاشکۆبوون پێشکەشکردنی شێوازی گشتی پاشکۆبوون لە جیهانی سێیەم بە درێژایی مێژووی سەرمایەداری لە سەدەی شانزدە بەم لایەوەیە.

دووەم ئەوەی کە، ئەوان پاشکۆبوون وەکو دۆخێکی «بیانی» پێناسە دەکەن؛ یانی دۆخێک کەوا لە دەرەوە داسەپاوە. کەوایە گرینگترین لەمپەرەکانی گەشەی نەتەوەیی، نەبوون یان کەم بوونی سەرمایە، شارەزایی لە بواری پیشەسازی یان ڕێکخراوە دیمۆکراتیکەکان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم لەمپەرانە دەبێ لە دەرەوەی ڕووبەری ئابووری نەتەوەیی

یانی لە میراتی مێژووی کۆلۆنیالیزم و بەردەوامی دابەشکاری کاری نایەکسانی نێونەتەوەیی پشکنینی بۆ بکرێت.
سێیەم ئەوەی کە، پاشکۆبوون زۆرجار وەکو دۆخێکی«ئابووری» هەڵدەسەنگێندرێ. بە ڕای ئەم دەستە لە تیۆرییداڕێژان، پاشکۆبوون لە ئەنجامی پڕۆسەی جێگۆڕکێی زێدەی ئابووری لە وڵاتە جیهان سێیەمەکانەوە بۆ وڵاتە سەرمایەدارە ڕۆژئاوایەکان دروست دەبێ. بە پێی ئەم بنەڕەتە وڵاتە جیهان سێیەمەکان بە گشتی لە کەم بوونەوەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ لەگەڵ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، زیان و خەساریان پێ دەگات.
چوارەم ئەوەی کە، لە دیدی تیۆرییداڕێژانی ئەم ڕێبازە پاشکۆبوون وەکو بەشێک لە »جەمسەربەندی ناوچەکان» لە ئابووری جیهاندا دەژمێردرێ؛ چونکە لە لایەکەوە ڕەوتی چوونە دەرێی زێدەی ئابووری لە وڵاتە جیهان سێیەمەکان هۆی گەشەنەسەندوویی ئەوانی پێک هێناوە و لە لایەکی ترەوە، جێگۆڕکێی ئەم زێدە ئابوورییە بە قازانجی گەشەی ڕۆژئاوا تەواو دەبێت. بەم هۆیەوە، هەروەکو «ئاندرێ گوندر فرانک» دەڵێ گەشەنەسەندوویی لە کەمەرە و گەشەسەندن لە نێوەند، دوو لایەنی جیاوازی یەک ڕەوتی یەکەی کەڵەکەکردنی سەرمایە پێکدێنن کە دەبێتە هۆی سازکردنی جەمسەربەندی نێوان ناوچە ئابوورییە جیهانییەکان.
پێنجەم ئەوەی کە، پاشکۆبوون و گەشەسەندن دوو پڕۆسەی «نەگونجاو»ن. لە ڕوانگەی ڕێبازی پاشکۆبوون وڵامدانەوە بەو پرسیارە کە ئایا ئەگەری گەشەسەندن لە وڵاتە جیهان سێیەمەکان هەیە، بە گشتی نەرێنییە. ئەگەرچی لەوانەیە چەشنێک لە گەشەی سنووردار، لەنێوان خولە گۆشەگیرییەکانی وەکو، خولی قەیرانی جیهانی یان شەڕی جیهانی ڕوو بدات، بەڵام ڕوودانی گەشەی ڕەسەن و ڕاستەقینە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم یا بە واتایەکی تر کەمەرەکان، بە سرنجدان لەسەر جێگۆڕکێی بەردەوامی زێدە بۆ نێوەند، کارێکی زۆر زەحمەتە.

لە کۆتاییدا، ڕێبازی پاشکۆبوون لەسەر ئەم باوەڕەیە کە پێوەندیی زیاتر لەگەڵ وڵاتە نێوەندەکان بە زیانی وڵاتە کەمەرەکان تەواو دەبێت. لە ڕاستیدا ڕێبازی پاشکۆبوون دەڵێ تا ئێرەش کەمەرە « پێوەندییەکی زیاناوی لەگەڵ نێوەند » هەبووە و هەیە. بە واتایەکی تر ئابووری سیاسی کەمەرە لە هەمان سەردەمی کۆلۆنیالیزم بەگشتی بە چەشنێک ڕیکخرا کە پێداویستییەکانی نێوەند دابین بکات. بۆیە ڕێبازی پاشکۆبوون پێشنیار دەکات وڵاتە کەمەرەکان پێوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ وڵاتە نێوەندەکان بچڕن. ئەوان بەجێی پاڵدانەوە لەسەر یارمەتی بیانی و تەکنۆلۆجی بیانی، دەبێ شێوازی گەشەی خۆوڵاتی لەسەر بنەڕەتی سەرچاوەی خۆیی هەڵبژێرن و خەریکی پلاندارشتن و ڕۆیشتن بەرەو گەشە تایبەتییەکانی خۆیان بن تا بتوانن بە سەربەخۆیی و گەشەی نەتەوەیی بگەن. هەڵبەت لە دیدی ڕێبازی پاشکۆبوون پشت بەخۆ بەستن بە مانای گۆشەگیری تەواو لە وڵاتانی دیکە نییە، بەڵکو تەنیا بەم مانایە دێ کەوا وڵاتە کەمەرەکان نابێ لەژێر فەرمانڕەوایی وڵاتە نێوەندەکان بن. ئەوان دەبێ لەسەر بنەڕەتی دۆخی یەکسان و بەرژەوەندییە دوو قۆڵییەکان خەریکی بازرگانی لەگەڵ وڵاتە کەمەرەکانی دیکە بن.

لە ڕوانگەی ڕێبازی پاشکۆبوون، زۆر ئەستەمە کە پێشەنگە نەریتییەکانی وڵاتە کەمەرەکان ڕازی بە دابڕانی گشتی پێوەندیی لەگەڵ وڵاتە نێوەندەکان و کۆمپانیا فرەنەتەوەکانی ئەوان بن. پێوەندیی نێوان بەرژەوەندییەکانی پێشەنگە ناوبراو و بیانییەکان لەوە زۆرترە کەوا بتوانن ئاوا ڕێگەیەک هەڵبژێرن. کەوایە بە باوەڕی زۆر لە لێکۆڵەران ڕێبازی پاشکۆبوون ڕەنگە پێویستی بە شۆڕشێکی سوسیالیستی بۆ تێپەڕبوون لە بەندی ئەم پێشەنگە نەریتییە دەسەڵاتدارانە هەبێت.

بە گشتی بە ڕای لایەنگرانی ڕێبازی پاشکۆبوون، پێویستە پێناسەیەکی نوێ لە وشەی«گەشە« بکەین. مانای گەشە نابێ لە بەدەستەوەبوونی پیشەکان و تەکنۆلۆجی پێشکەوتوو، بەرهەمهێنانی زۆرتر و قازانجوەرگرتنی

کورت کرێتەوە. بەجێی ئەم نیشانانە باشتر وایە، پێناسەیەکی دیکە بەپێی باش بوونی ئاستی ژیانی سەرجەم جەماوەری کەمەرە پێشکەش بکەین. کەوایە، پلانەکانی گەشە بەجێی ئەوەی کە بۆ خۆشگوزەرانیی پێشەنگەکان و شارنشینەکان دارێژرێ، دەبێ بۆ دابینکردنی پێداویستییە مرۆڤییەکانی وەرزێرە لادێییەکان، بێکارەکان و هەژارەکان هەوڵ بدات. لە ڕاستیدا هەر پرۆگرامێکی گەشە کەوا لەسەر بەرژەوەندییەکانی تەنیا بەشێکی بچووک لە کۆمەڵگە دابمەزرێ و بەشە زۆرینەکانی دیکەی کۆمەڵگە بێبەش بکات، بە هیچ چەشنێک ناتوانێ پروگرامێکی سەرکەوتوو بێت.

**هەڵسەنگاندنی تیۆرییەکانی نوێسازی و پاشکۆبوونی کلاسیک:**

لێرەدا پێویستە ڕادەی لێکچوون و جیاوازی بیروڕاکانی نێوان ڕوانگە نەریتییەکانی پاشکۆبوون و نوێسازی نیشان بدەین، (کورتەیەک لەم بەراوردکردنە لە خشتەی ژمارە یەک هاتووە).

**لێکچوونەکان:**

یەکەم ئەوەی کە هەر دوو ڕوانگە لە لایەنی بابەتی پشکنین لە یەک دەچن. سەرنج و جەختی هەر دوو، لەسەر گەشەی جیهانی سێیەمە و خەریکی پشکنین لەمەڕ هۆکارگەلێکن کەوا یارمەتی بە باش بوونی بارودۆخی گەشە لەو ناوچانە بدات.

دووەم ئەوەی کە، هەر دوو ڕوانگە لە مێتۆدۆلۆجی و شێوە پشکنینی یەکسان کەڵک وەردەگرن. بۆچوونەکانی ئەوان لە یەک ئاستی زۆر هەمەکی و دەرهەست (انتزاعی) پێشکەش کراوە و لەوە دەگەڕێن کەوا ئەم پرۆسە گشتییە بتوانێ گەشە لەگەڵ دۆخی گشت وڵاتەکان بەراورد بکات.

سێیەم ئەوەی کە، هەر دوو ڕوانگە لە چوارچێوەی تیۆرییەکانی خۆیاندا یەک شێوازی جەمسەربەندی پێشکەش دەکەن؛ ئەوە لە حاڵێکدایە کەوا ڕوانگەی سەرەتایی نوێسازی، ئەو بە »بەرەنگاربوونەوەی نێوان نەریت و

نوێ گەرایی» ناو دەبا و ڕوانگەی کلاسیکی پاشکۆبوون ئەم شێوازە بە «بەرەنگاربوونەوەی نێوان نێوەند و کەمەرە« ناو دەبا.

**جیاوازییەکان:**

یەکەمین جیاوازی دوو ڕوانگەی نوێسازی و پاشکۆ بوون ئەوەیە کە ئەوان لە دوو بەستێنی تیۆرییکی جیاواز سەریان هەڵداوە. ڕوانگەی نوێسازی بە توندی لەژێر کاریگەری تیۆرییە کۆمەڵناسییەکانی «تەکامول گەرایی ئەورووپا» و تیۆرییە »کارکردگەراکانی ئەمریکا» دایە. لە حاڵێکدا ڕوانگەی نەریتی پاشکۆبوون، زۆرجار بۆچوونەکانی خۆی لە پرۆگرامی چاکسازییە لیبراڵەکانی ڕێبازی «ئێکلا» و بۆچوونە شۆڕشگێڕانەکانی نوێ مارکسیستی بە ئیلهام وەرگرتووە.

دووەم ئەوەی کە، لە پێوەندیی لەگەڵ هۆکانی کێشە و گرفتەکانی جیهانی سێیەم، ڕوانگەی نوێسازی وێڕای پێشکەشکردنی یەک دەربڕینی نێوخۆیی، بە بوونی تایبەتمەندیگەلێک وەکو کولتووری نەریتی (تیۆرییەکانی گابریەل ئالمۆند و سیدنی وێربا)، نەبوونی سەرمایەگوزاری بەرهەمهێنەر (تیۆرییەکانی وێلبێرت مۆر و واڵت رۆستو)و نەبوونی هاندەری پێشکەوتن (تیۆرییەکانی دەیوید مەک کلەند و ئەلێکس ئینگلس) لەنێو وڵاتە جیهان سێیەمەکان ئاماژە دەکات؛ لە حاڵێکدا لە لایەکی ترەوە، ڕوانگەی نەریتی پاشکۆبوون جەخت لەسەر ڕۆڵی کۆلۆنیالیزم و کۆلۆنیالیزمی نوێ بۆ سازبوونی گەشەنەسەندوویی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەکات و پشکنینێکی دەرەکی بۆ ئەم کێشەیە پێشکەش دەکات.

سێیەم ئەوەی کە، ڕوانگەی نوێسازیی سازکردنی پێوەندیی وڵاتانی جیهانی سێیەم یا کەمەرە لەگەڵ وڵاتە ڕۆژئاوییەکان یا نێوەند بە قازانجی ئەوان دەزانێ. لەم ڕوانگەیەوە، وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، یارمەتی کەمەرە لە ڕێگەی گەیشتن بە گەشە دەکەن. لە لایەکی ترەوە، ڕوانگەی نەریتی پاشکۆبون بە زیاناوی و خراپ خوێندنەوەی ئەم پێوەندییانە، لەم باوەڕەدان

كە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ڕێگەی بە دواداچوونی بەرژەوەندییەکانی خۆیان خەریکی چەوساندنەوەی وڵاتانی جیهانی سێیەمن.

چوارەمین جیاوازی بیروڕای ئەم دوو ڕوانگەیە، لەبابەت پێشبینی کردنی ڕێگەی داهاتووە. ڕوانگەی نوێسازی لەم بابەتەوە زۆرجار گەشبین بووە و باوەڕی وایە کە وڵاتانی جیهانی سێیەم لەگەڵ هەندێک بیرکردنەوە و خۆڕاگرتن، لە کۆتاییدا بە ئاستی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان و ئامانجە نوێسازییەکان دەگەن. لە حاڵێکدا، ڕوانگەی نەریتی پاشکۆبوون سەبارەت بە داهاتووی وڵاتانی جیهانی سێیەم ڕەشبینە. ئەگەر پێوەندییە چەوسێنەرەکان ئێستا گۆڕانی بەسەردا نەیە، پاشکۆبوونی وڵاتانی جیهانی سێیەم بە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان هەر ڕۆژ زیاتر دەبێت و بەردەوامبوونی ئەم پێوەندییانە، ئەوان بەرەو گەشەنەسەندوویی و خاپووربوونی زیاتر دەبات.

لە کۆتاییدا لەبابەت پێشکەشکردنی ڕێگەچارە بۆ دەرچوونی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە ڕەوشی دواکەوتوویی، ڕوانگەی نوێسازی لایەنگری لە سازکردنی پێوەندیی زیاتر لە گەڵ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دەکات، بۆ وێنە لە ڕێگەی وەرگرتنی یارمەتی بیانی، فرەوانبوونی ئاڵوگۆڕە کولتوورییەکان و جێگۆڕکێی زیاتری تەکنۆلۆجی. ئەوە لەحاڵێکدایە کە لێکۆڵەرە نەریتییەکانی پاشکۆبوون ستراتیجییە- کی تەواو جیاواز بەڕێوە دەبەن. ئەوان بۆ گەیشتن بە گەشەی سەربەخۆ، خۆوڵاتی و خودموختار لە جیهانی سێیەم، لە کەم بوونەوەی پێوەندیی ئەم وڵاتانە لەگەڵ نێوەند (چەوسێنەر) لایەنگری دەکەن و بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە ڕوودانی شۆڕشێکی بنەڕەتی سوسیالیستی بە پێویست دەزانن.

خشتەی ١- هەڵسەنگاندنی ڕوانگەی نوێسازی و ڕوانگەی نەریتی پاشکۆبوون

| | خوێندنەوە نوێسازییەکان | خوێندنەوە نەریتییە پاشکۆبوونەکان |
|---|---|---|
| **لێکچوونەکان** | | |
| بابەتی پشکنین | گەشەی جیهانی سێیەم | هەمان |
| شێوەی پشکنین | ئاستی بەرزی واتایی (انتزاع) و جەختکردن لەسەر پرۆسەی گشتی گەشە | هەمان |
| بنەمای تیۆرییکی دامەزراو لەسەر جەمسەربەندی | نەریت و نوێگەرایی | نێوەند و کەمەرە |
| **جیاوازییەکان** | | |
| پێشینەی تیۆریی | تیۆرییە تەکامولگەرا و کارکردگەراکان | پرۆگرامی چاکسازییەکانی ڕێبازی ئێکلا و تیۆرییە شۆڕشگێرانەکەی نوێمارکسیزم |
| ڕیشە دۆزینەوەی کێشەکانی جیهانی سێیەم | زۆرجار لە نێوخۆ | زۆرجار لە دەرەوە |
| سروشتی پێوەندییەکانی نێوان نەتەوەکان | بە گشتی قازانج | بە گشتی زیاناوی |
| پێشبینی ڕێگەی گەشە | گەشبین | ڕەشبین |
| شێوەکانی گەیشتن بە گەشە | فرەوانکردنی پێوەندیی لەگەڵ ڕۆژئاوا | کەم کردنەوەی پێوەندیی لەگەڵ نێوەند وێڕای شۆڕشی سۆسیالیستی |

**تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی ڕوانگەی نەریتیی پاشکۆبوون:**

سەرجەم خوێندنەوەکانی پاشکۆبوون لەسەر ئەم پرەنسیپانە هاوبیرن کەوا بارودۆخی داسەپاو لە دەرەوە بۆتە هۆی پاشکۆبوونی وڵاتانی جیهانی سێیەم و پاشکۆبوون هەروەها بە نۆرەی خۆی ئەم وڵاتانە بەرەو لای گەشەنەسەندوویی ڕادەکێشێ.

**١- پاشکۆبوون وەکو دۆخێکی داسەپاو لە دەرەوە:**

بیری قووڵی تیۆرییە نەریتییەکانی پاشکۆبوون، لێکۆڵەرانی بۆ پشکنینی پرۆسەگەلێک ڕێنوێنی کردووە کە لە ڕێگەی ئەوانەوە دەسەڵاتدارێتی بیانی، خەریکی دەستنیشانکردنی چەشنەکانی گەشە لە جیهانی سێیەم بووە. بۆ وێنە »پۆل باران» خەریکی پشکنین لەمەڕ ئەم بابەتە بوو کە چۆن بریتانیا لە ڕێگە جیاجیاکان وەکو تاڵانی سامانە ماددییەکان، سڕینەوەی پیشەسازی و کوشتن و قڕکردنی کۆمەڵانی خۆوڵاتی، وڵاتی هێندی بەروە لای گەشەنەسەندوویی هانداوە.

**٢- پاشکۆبوون وەکو ڕەوشێکی ئابووری:**

تیۆرییە نەریتییەکانی پاشکۆبوون، ئاڵوگۆڕی نایەکسانی ئابووری لە چوارچێوەی دابەشکاری کاری نایەکسانی نێونەتەوەیی وەکو هۆی سەرەکی پاشکۆبوون دەزانن، بۆیە پشکێنەرەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەت لایەنەکانی ئابووری پاشکۆبوون، ڕێنوێنی دەکەن. بەم چەشنە، لایەنە سیاسی و کولتووریەکانی پاشکۆبوون زۆرجار وەکو دوواهاتە سروشتییەکانی ئەم لایەنە ئابوورییە دەژمێردرێن. بۆ وێنە بەپێی باوەڕی « پۆل باران » لایەنە ئابوورییەکانی کۆلۆنیالیزم (وەکو سڕینەوەی پیشەسازی، بەرهەمهێنانە کشتوکاڵییە هەناردەکان و جێگۆڕکێی زێدەی ئابووری) بنەمایەکیان پێکهێناوە کە بەپێی ئەو بنەمایە، چینە کۆمەڵایەتییە پاشکۆکانی هێند توانیان وەکو یەک دەزگای سەقامگیر بمێننەوە. لە ئەمریکای لاتینی ئەمڕۆدا قەیرانی قەرزەکان

بووەتە هۆی کەمبوونەوەی بەهای یەکسانی پارەی نێوخۆیی، فرەوانبوونی ئاستی ئاوساوی، کەم بوونەوەی بەرهەمهێنانی ناڕاستەوخۆی نەتەوەیی (تولید ناخالص ملي) و پەرەسەندنی بێکاری کە بە نۆرەی خۆی نائارامیە سیاسییەکان و وورەی دژە ئەمریکایی لە نێوان جەماوەر سازکردووە.

**٢- جەختکردن لەسەر ناکۆکیی نێوان پاشکۆبوون و گەشەسەندن:**

تیۆرییە نەریتییەکانی پاشکۆبوون تا ئەو ڕادەیەی توانیویانە ئاماژەیان بە ئەنجامە زیانابەخشەکانی پاشکۆبوون بۆ وڵاتانی جیهانی سێیەم کردووە. ئەوان زۆرجار لێکۆڵەران بەرەو ئەم باسە ڕێنوێنی دەکەن کە گەشەی سەربەخۆ، خۆوڵاتی و خودموختار ئەگەری نییە مەگەر بە لەنێوبردنی بارودۆخی پاشکۆبوون. بۆ وێنە «پۆل باران» بەڵگە دێنێتەوە کەوا میراتی مێژوویی کۆلۆنیالیزم، ئێستاش لە بارودۆخی ئەمڕۆی گەشەی هێند ماوتەوە. یان لە ئەمریکای لاتین، قەرز وەرگرتنی پارە لە بانگە ڕۆژئاواییەکان تەنیا بۆتە هۆی زۆربوونی نالەباری بۆ پاشکۆبوونی ماددی ئەم وڵاتانە و ئەوانی هەرچی زیاتر بۆ لای نەخۆشی ئابووری و ئاژاوە سیاسییەکان هانداوە. هەروەها، ئەگەرچی گەشەی پیشەسازی بۆ هەناردە لەوانەیە هۆی فرەوانبوونی بەرهەمهێنانە پیشەسازییەکان و هێزی کار بێت، بەڵام نەیتوانیوە گەشەی ئابووری خۆڕاگر و ڕەسەن لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ساز بکات. چونکە پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی بە کەڵکوەرگرتن لە وزەی کاری ناپسپۆڕ، کۆنترۆڵی ورد لە لایەن کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان، و ناسەقامگیری ئابووریی جیهان، سەرجەم هەوڵەکانی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ بەرۆژکردن و فرەوانکردنی چەشنەکانی پیشەسازیی خۆیان پووچەڵ کردۆتەوە.

**دوس سانتۆس و تیۆریی پاشکۆبوون:**

یەکێک لە بەناوبانگترین و سەرنجڕاکێشترین پێناسەکانی نوێ مارکسیستی لەبابەت پاشکۆبوون لە لایەن «تیئۆتۆ نیو دۆس سانتۆس»ی بەرازیلی پێشکەش کراوە. دۆس سانتۆس، بیروڕاکانی خۆی لەبابەت گەشەنەسەندوویی و پاشکۆبوون لە نێوان ساڵەکانی ڕیکخستنی سیاسی و نەتەوەخوازی لە بەرازیل نووسیوە. لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ بە هاوکاری لە گەڵ «زانکۆی بەرازیلیا» سەرقاڵ بوو و پاش کودێتای ( Coup d etat) 1969 بە ئەندامێتی « نێوەندی خوێندنەوە ئابووری – کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی شیلی» وەرگیرا. ئەو بە هاوکاری هاوسەرەکەی «وانیا بامبیرا» خەریکی خوێندنەوە لەسەر ئێمپریالیزم و ڕۆڵی ئەو لە کۆمەڵگە پاشکۆکان بوو. لەگەڵ ڕوودانی کودێتای ساڵی ١٩٧٣ لە لایەن «جێنڕال پینۆشە»، بە دژ دەسەڵاتدارێتی «سالوادۆر ئالندە» لە شیلی، ناچار بوو پەنابەریی مەکزیک وەرگرێ و لە زانکۆی نەتەوەیی مەکزیک بە دووای لێکۆڵینەوە و نووسینەکانی خۆی کەوێ.

دوس سانتۆس لە یەکەمین نووسراوەکانی خۆی کە بڵاوی کردەوە چەمکی پاشکۆبوون بەم چەشنە شرۆڤە دەکات:

***پاشکۆبوون بارودۆخێکی سنوورداركەرە کە لەوێدا ئابووری گرووپێکی دیاریکراو لە وڵاتان، ملکەچی ئابووری وڵاتانی دیکە دەبێ. پێوەندیی «پاشکۆبوونی بەرامبەر» لە نێوان دوو یا چەند وڵات یا ئەم وڵاتانە و سیستەمی بازرگانی جیهانی کاتێک بە »پێوەندیی پاشکۆبوون» دەگۆڕێ کە هەندێک لە وڵاتەکان بتوانن لەڕێگەی هاندەرە نێوخۆییەکانەوە پەرە بسێنن، لە حاڵێکدا ئەوانی دیکە، کەوا لە دۆخی پاشکۆبوون دان، تەنیا بتوانن وەکو دەنگدانەوەی گەشەی وڵاتە زاڵەکان پەرە بسێنن، کە ئەوە خۆی لەوانەیە کاریگەری ئەرێنی یا نەرێنی لەسەر گەشەی ئەوان دابنێت.*** [٣٩]

بەواتایەکی سادەتر، پاشکۆبوون دۆخێکە کە لەوێدا ئابووری گرووپێک لە وڵاتەکان (بۆ وێنە وڵاتانی ناوسراو بە جیهانی سێیەم)ملکەچی گەشەی

ئابووری گرووپێکی دیکە لە وڵاتەکان (بۆ وێنە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری) دەبێ و ئەم پێوەندییە پاشکۆبوونە لەو کاتەوە سازبووە کە ئەم دوو دەستە لە وڵاتەکان لە حاڵێکدا تێکەڵی پێوەندییە بەرامبەرە بازرگانییەکان بوون کەوا لەنێوەوەی وڵاتەکانی گرووپی یەکەم (پاشکۆ) لەبەر هۆگەلێک ئەم چەشنە هاندەر و تواناییانە بوونی نەبوو. لە ئاوا بارودۆخێکدا، وڵاتانی پاشکۆ تەنیا دەیانتوانی لە گەشەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کاریگەری وەرگرن (بێ ئەوەی کە لەسەر ئەوان کاریگەری دانێن) و بەم چەشنە »پاشکۆبوونی بەرامبەر»بە »پاشکۆ بوون» گۆڕدرا.

ئەم بەشە لە پێناسەکەی «دۆس سانتۆس»، هەمان شتە کە ڕێبازی «ئێکلا» پێشتر باسی لێکردبوو، بەڵام دۆس سانتۆس لایەنێکی تر بۆ پاشکۆبوون دەخاتە ڕوو و ئەویش کاریگەری «پێوەندیی پاشکۆبوون» لەسەر بنەمای نێوخۆیی وڵاتانی پاشکۆیە. دۆس سانتۆس باوەڕی وایە کە پاشکۆبوون تەنیا پێوەندییەکی ئابووری نییە بەڵکو بنەمایەکی کۆمەڵایەتی تایبەتی لەنێو وڵاتە پاشکۆکاندا لەگەڵدایە.

«دۆس سانتۆس» ئاشکرا لەژێر کاریگەری «پۆل باران» لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە پێوەندیی نایەکسانی بازرگانی لەسەر بنەڕەتی هێزی پاوەنی نێوەند، هۆی جێگۆڕکێی زێدە لە وڵاتە پاشکۆکان بۆ وڵاتە زاڵەکانە. ئەم نایەکسانییە، سنوورگەلێک لەسەر توانایی بازاڕی نێوخۆی وڵاتە پاشکۆکان سازدەکات و شوێنەواری خراپ لەسەر ژیانی جەماوەر بەجێ دێڵێ.

«دۆس سانتۆس» لە لایەنی مێژووییەوە سێ شێوازی پاشکۆبوون لە ئەمریکای لاتین لە یەک جیا دەکاتەوە: شێوازی یەکەم بریتییە لە؛ پاشکۆبوونی «بازرگانی» سەردەمی کۆلۆنیالیزم کە لەوێدا پاوەنە بازرگانییەکان، کۆنترۆڵی زەوی، مووچە، کان و وزەی کاریان لە کۆمەڵگەی ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم بەدەستەوە بوو.

شێوازی دووەم یان پاشکۆبوونی «ماددی – پیشەسازی» هەروەها هاوکات لەگەڵ سەردەمی ئیمپریالیزم لە کۆتایی سەدەی نۆزدە دایە و قسە

لە زاڵبوونی سەرمایە گەورەکان لە نێوەندە هێژمۆنییەکان و پەرەگرتنی ئەو لە دەرەوە بوو و لە کۆتاییدا چەشنی نوێی پاشکۆبوون یانی پاشکۆبوونی«تەکنۆلۆجی-پیشەسازی» کەوا لە سەردەمی پاش شەڕی جیهانی دووەم سەری هەڵدا و تایبەتمەندی ئەو سەرمایەگوزاری کۆمپانیا فرەنەتەوەکان لە پیشەسازییەکان دایە کەوا بازاڕە نێوخۆییەکانی وڵاتە پاشکۆکانی کردۆتە ئامانجی خۆی. ئەم پێوەندییە جۆراوجۆرانەی پاشکۆبوون هەرکام سنورگەلێکی سەرەکی بۆ ئاسۆگەی (چشم انداز) گەشە دادەنێن.

لە دوواترین قۆناغ لەم قۆناغانەدا، کە دۆس سانتۆس زۆرجار سەرنجی داوە، سێ لایەنی پاشکۆبوون ئاوێتەی یەکتر بوون و لەمپەریان لە بەرامبەر گەشەی ئابووری دروست کردووە.

١- بە هۆی ئەوەی کە گەشەی پیشەسازی لە کەمەرە بۆ بە دەستهێنانی پارەی بیانی بە مەبەستی هاوردەی کەلوپەلە بنەڕەتییەکان پشتبەستو بە هانەردەیە، هەر بۆیە یەکەم ئاکامی پاشکۆبوونی سەردەم، پێویستی بە پاراستنی بەشی نەریتی هەناردەیە. ئەم کارە خۆی بە هۆی پاراستنی پێوەندییە دواکەوتووەکانی بەرهەمهێنان، سنورگەلێکی لە لایەنی ئابووری بۆ گەشەی بازاڕی نێوخۆ ساز کردووە و هەروەها لە لایەنی سیاسییەوە دەربڕی پاراستنی هێز لە دەستی ئۆلیگارکی نەریتییە کە ڕوو لە نەمانە. لەو وڵاتانەی کەوا بەشی هەنارده بە هۆی سەرمایەداری بیانی کۆنترۆڵ دەکرێ، ئەم پرۆسەیە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی بەشێکی بەرچاو لە قازانج بۆ وڵاتە نێوەندەکان و لە کۆتاییدا هۆی پاشکۆبوونی زیاتری سیاسی پێکدێنێ.

٢- نەک هەر گەشەی پیشەسازی بە توندی بە هۆی ئاستی دانەوەکان (تراز پرداختها)مەرجدار دەبێتەوە، بەڵکو ئاستی دانەوەش بە هۆی پێوەندییە پاشکۆکان، مەیلی زاتی بە لێ داشکاندن (کسری) هەیە. کەوایە پێوەندییە بازرگانییەکان لە بازاڕێکی نێونەتەوەیی زۆر پاوەنیدا ساز دەبێت کەوا، حەز بە دابەزینی نرخی مادده خاوەکان و چوونە سەرەوەی نرخی بەرهەمە

پیشەسازییەکان دەکات. جگە لەوەش تەکنۆلۆجی مۆدێرن بەرەو جێگیربوونی بەرهەمە تێکەڵە و دەستکردەکان بە جێی ماددە سەرەکییە سروشتییەکان و لە پاشان هاتنە خوارەوەی داواکاری نێوەند بۆ هەناردەی کەمەرە هەنگاو دەنێ. لەوەش زیاتر، سەرمایەی بیانی کۆنترۆڵی خۆی لەسەر بەشە چالاکەکانی کەمەرە پاراستووە و قازانجە زۆرەکانی خۆی بۆ دەرەوە دەنێرێ. کەوایە پێویستی بە دابین کردنی پارەی بیانی (پاشکۆبوونی ماددی) هەم بۆ قەرەبوو کردنەوەی داشکانی ئاستی دانەوە هەنووکەییەکان و هەم بۆ دابین کردنی پارەی بیانی بە مەبەستی گەشەی زیاتر هەیە.

٣- گەشەی پیشەسازی هەروەها بە هۆی پاوەنی تەکنۆلۆجی کەوا لە لایەن نێوەندە ئیمپریالیزمەکانەوە ساز بووە و هەروەها بە هۆی تێچووی زۆری ئەم تەکنۆلۆجییە و مەیل بۆ بەدەست هێنانی ئەو لە ڕێگەی سەرمایەگوزاری کۆمپانیا بیانییەکان، مەرجدار بۆتەوە. کەڵک وەرگرتن لەم تەکنۆلۆجییە لە ئابوورییە کەمەرەکان کە پێویستییان بە دابینکرنی کار بۆ کرێکار و بێکارەکان هەیە، دەبێتە هۆی چەوساندنەوەی دوو قاتی کار لە ئاستی نزم، سنوردار بوونی ڕاکێشانی کار، بەدەوام بوونی بێ بەشی گشتی و ڕێگری لە گەشەی بازاڕی نێوخۆ.

ڕێگەچارەی«دۆس سانتۆس»بۆ لابردنی ئەم کێشەیە، ڕێگەچارەی شۆڕشگێڕانە بوو. ئەو هەستی بەوە دەکرد کە ڕێگەچارە پێشنیارکراوەکانی «ئێکلا» و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی دیکە توانا بە لەنێوبردنی «ئەم زنجیرە تۆقێنەرانەی کەوا لە ڕێگەی گەشەی پاشکۆ داسەپاوە«نییە. وەکو ئەو دەڵێ باشترین شت ئەوەیە کە دڵ بە بەرەنگاربوونەوە بەدژ ڕژیمە نیزامی و فاشیستەکان لە لایەک و دەوڵەتە شۆڕشگێڕە جەماوەری و سۆسیالیزمەکان لە لایەکی ترەوە ببەستین، چونکە «هەر چەشنە ڕێگەچارەی نێوبژیوانە لەوەها کەشێکی ڕاستەقینە و پڕ لە ناکۆکیدا، ڕێگەچارەیەکی خەیاڵی و بێ کەڵکە «.

**کاردۆزۆ و فالْتۆ و تیۆریی پاشکۆبوونی بنەمایی:**

جەختی دۆس سانتۆس لەسەر لایەنە بنەرەتییەکانی پاشکۆبوون و هەروەها ئاماژەی خێرای ئەو بۆ ڕۆڵی هۆکارە نێوخۆییەکانی وڵاتە پاشکۆکان لە ساز کردنی بارودۆخی پاشکۆبوون، بابەتگەلێکی زۆر سەرەتایی بوون کە زۆر زوو بە دەستی کەسانێکی دیکە پەرەی پێدرا. لە نێوان کەسانێک کەوا لە بابەت ئەم لایەنە پاشکۆیانە بە چڕوپڕی باسیان لەسەر کردووە دەبێ بە دوو تیۆرییداڕێژی دیکەی ئەمریکای لاتین واتە «فێرناندۆ هنریکۆ کاردۆزۆ »و «ئێنزۆ فالْتۆ» ئاماژە بکەین کەوا هەر دوو بۆ ماوەیەک لەگەڵ «ئێکلا» هاوکاریان کرد.

کاردۆزۆ، تا کاتی هەڵوەشاندنەوەی مافی وانە گوتنەوە پاش کۆدێتای ١٩٦٤، مامۆستای زانکۆی سائۆپالۆ (بەرازیل) بوو. لە زانکۆ ئەو لەژێر چاودێری و کاریگەری کۆمەڵناسی بەرازیلی، «فلۆرێستان فێرناندز» لەگەڵ « ئەکتاڤیو یانی » و چەند کەسێکی تر، لەسەر کێشەی «کۆیلایەتی»ی پارێزگاکانی «پاڕانا«، «سانتا کاتارینا» و «ڕیوگراند دوسول» کاریان کرد.

ئاکامی ئەو پشکنینانە تێزی دۆکتواری ئەوی بە ناویی ***سەرمایەداری*** پێک هێنا. «کاردۆزۆ»، خوێندنەوەی هەروەها لەبابەت خاوەن ئیشەکانی پیشەسازی و گەشەی ئابوری بەرازیل ئەنجام دا. ئەو لە نووسینی یەکەمدا، حەزی خۆی سەبارەت بە شێوەی دیالکتیک و بۆچوونی مارکس دەربڕی، بەڵام ئاماژەگەلێکی هەروەها بە نووسینەکانی ڕەوتی سەرەکی کۆمەڵناسی و بیرمەندانی لێهاتووی سەردەمی خۆی وەکو«ڕابێرت مێرتۆن»، «ڕادکیف براون»و«کلۆد لیڤی ستراوس» و ئەوانی تر هەبوو. کاردۆزۆ بە هۆی ئەم نووسەرانە توانی کاریگەری لە تیۆرییەکانی کارکێردگەرایی و بنەماگەرایی وەرگرێ. ستراتیجیی ئەو لە کاتێک کەوا لە سانتیاگۆی شیلی لە «ڕێکخراوەی پلان داڕشتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەمریکای لاتین»دابوو کە لقێکی لێبۆوە لە ئێکلا بوو، فۆڕمی گرت. بەرهەمی کارەکە، چاپی کتێبی «پاشکۆبوون و گەشە لە ئەمریکای لاتین» لەگەڵ «ئێنزۆ فالْتۆ» بوو. (٤٠)

کاردۆزۆ و فالێتۆ، کەوا هەر دوو ماوەیەک لەگەڵ «ئێکلا» هاوکاریان کردبوو لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ پاش ڕەخنەگرتن لە تیۆریکانی ڕێبازی ئێکلا، لەو جیابوونەوە و باسی زۆریان لەمەڕ پاشکۆبوون پێشکەش کرد کەوا بە تیۆریی «پاشکۆبوونی نوێ» ناسراوە. ئەوان هەوڵیان دا لە شرۆڤە و لێکدانەوەی پاشکۆبوون سەرنج بدەنە ڕۆڵی هۆکارە نێوخۆکانی وڵاتە پاشکۆکان. بە ڕای ئەوان هەڵەیە، ئەگەر ئیمپریالیزم و پاشکۆبوون بە دوو لای پارەیەک دابنێین، چونکە لەو حاڵەدا هۆکاری بیانی (ئیمپریالیزم) وەک بکەری هەرەگرینگ و وڵاتە پاشکۆکان وەک بوونەوەرانێکی شەرمەزار دێنینە بەرچاو. ئەوان بەڵگەیان هێناوە کەوا لەم پرۆسەیەدا نەک تەنیا هۆکارە بیانییەکان، بەڵکو هەروەها پێوەندییەکانی نێوان هێزە نێوخۆیی و بیانییەکانیش پاشکۆبوون دروست دەکات. ئەوان پاشکۆبوونیان بەم چەشنە پێناسە کردووە: «لە لایەنی ئابووریەوە سیستەمێکی کاتی پاشکۆیە کەوا کەڵەکەکردن و پەرەپێدانی سەرمایە ناتوانێ هۆکارە پێویستە دینامیکەکانی خۆی لەنێو سیستەم بدۆزێتەوە «. ئەوان لە لێدوانی ئەم پێناسەیەی خۆیان بەردەوام دەبن لەوەی کە«لە ئابوورییە سەرمایەدارییەکان، بەشی سەرەکی گەشە بریتییە لە بوونی کەرەسە خۆزیادکەرەکان بۆ سەرمایە. ئەم کەرەسانە هەروەها بریتییە لە دامەزراندنی تەکنۆلۆجی نوێ، فرەوان کردنی بەردەوامی بەرهەمهێنانی کەرەسەی بەرهەمهێنان (ئامێر و کەرەسەکان) و بوونی یەک سیستەمی بانکی بەهێز کەوا پشتیوانی لەم ئابوورییە بکات». پاشان بەم ئەنجامە دەگات کەوا »گشت ئابوورییە سەرامیەدارییەکان توانای ئەوەیان نییە ئەم کەرەسانە لە نێوخۆ بەرهەم بێنن و هەر بۆیە ئەوانەی کەوا بەری لەم کەرەسانەن ناچارن لە ئاستی جیهانی (یانی لە وڵاتانی خاوەن ئەم کەرەسانە) بە دوایدا بگەڕێن. ئابوورییە پاشکۆکان لە ڕاستیدا ئاوا ئابوورییەکن».

بە ڕای کاردۆزۆ و فالێتۆ، پاشکۆبوون تەنیا لەسەر بنەڕەتی چەوسانەوە و سەرکوتی هێزە بیانییەکان دانەمەزراوە بەڵکو لەسەر بنەڕەتی پێوەندیی

بەرژەوەندی و هاودەنگی نێوان چینە دەسەڵاتدارە نێوخۆکان و چینە نێونەتەوەییەکان (بورژوازی بیانی، کۆمپانیا فرە نەتەوەکان و. . . . ) دامەزراوە. بە ڕای ئەوان، زاڵبوونی هێزە بیانییەکان لە ڕێگەی شێوە کاری گرووپ و چینە دەسەڵاتدارە نێوخۆکان وەکو هێزێکی نێوخۆیی دێتە بەرچاو. بە واتایەکی دیکە، چینە دەسەڵاتدارە نێوخۆییەکان بەچەشنێک هەڵسوکەوت دەکەن کە بەرژەوەندیەکانی هێزە بیانییەکانیش دەپارێزن و بازاڕی نێونەتەوەیی وەکو هۆکاری پێویست بۆ کامڵ کردنی بازنەی سوڕانی سەرمایە دەژمێردرێ.

لە چەشنێکی تر لە پاشکۆبووندا، کە کاردۆزۆ و فالێتۆ ئەوان بە «ئابووریە دوورگەییەکان»پێناسە دەکەن، سەرمایەگوزارییەکان لە دەرەوە دابین دەبێ و لەگەڵ پرۆسەی بەرهەمهێنانی خۆولاتی تێکەڵ دەبێ و لە ڕێگەی چەوساندنەوەی وزەی کاری خۆولاتی زیاد دەکات و بەرهەمەکانی ئەو سا پیشەسازی بێ یان کشتوکاڵی و ماددە سەرەتاییەکان، بە دەستی کۆمپانیا بیانییەکان هەناردە دەکرێ و لە بازاڕی جیهانیدا دەفرۆشرێت.

پاشکۆبوونی چەشنی سێیەم کەوا کاردۆزۆ و فالێتۆ ئاماژەی پێدەکەن، هەمان ئابوورییە پیشەسازییە پاشکۆکانە کە لێرەدا بەگشتی کەڵەکەکردنی سەرەتایی لە سەرمایەگوزاری بیانی بە دەست دێت (ئەگەرچی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان، زۆرجار لە گەنجینە نەتەوەییەکان کەوا لە جێدا هەیانە کەڵک وەردەگرن). جیاوازی ئەم ئابوورییانە لەگەڵ ئابوورییە دوورگەییەکان لەوە دایە کەوا، لێرەدا بەرهەمە پیشەسازییەکان، بە گشتی لە بازاڕی نێوخۆیی دەفرۆشرێن.

کاردۆزۆ و فالێتۆ، پاشکۆبوون بە بابەتێکی بنەمایی دەزانن و سەرنج دەدەنە کاریگەرییەکانی پێوەندییە بیانییەکان لەسەر بنەما نێوخۆییەکانی وڵاتە پاشکۆکان لەوانە پێوەندییە بەرهەمهێنانەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان. بنەمایی بوونی پاشکۆبوون لە هزری کاردۆزۆ و فالێتۆ مانایەکی دیکەشی هەیە و ئەو ئەمەیە کەوا، گۆڕانکارییە هەنووکەییەکان لە ئابووری وڵاتە

پاشکۆکان، تەنیا لەوانەیە فۆڕمە پاشکۆکان بگۆڕێ، بەڵام ناوەڕۆکی پاشکۆی ئەم ئابوورییانە درێژەی دەبێت. لەسەر ئەم بنەڕەتە، کاردۆزۆ و فالێتۆ، بەڵگە دەهێننەوە کە ئابووری کەمەرەیی (پاشکۆ) تەنانەت کاتێک کەوا تەنیا سەرقاڵی بەرهەمهێنانی ماددە خاوەکان نابێت (بەڵکو سەرقاڵی بەرهەمهێنانی کەلوپەلە پیشەسازییەکان دەبێت) دیسان پاشکۆ دەمێنێتەوە، چونکە بەرهەمهێنانی کەلوپەلە سەرمایەکانی ئەوان ناتوانێ «دیسان بەرهەمهێنان» بکاتەوە و پەرەگرتنی ئەوان دابین بکات. هەروەها بە ڕای ئەوان پاشکۆبوون، تەنانەت لەگەڵ بوونی دەوڵەوتی سەربەخۆی نەتەوەیی لە وڵاتە کەمەرەکان هەمیسان بەردەوام دەبێت. لە ڕاستیدا ئەوان گەشەی وڵاتە پاشکۆکان (جیهانی سێیەم) بە دوور نازانن، بەڵام ئەم گەشەیە جیاواز لە گەشەی وڵاتە پیشەسازییەکان دەزانن و بە »گەشەی پاشکۆ» ناوی دەبەن.

لەمەڕ پاشکۆبوون، ئەم ڕەخنەیە خراوەتە سەر پێناسە و دەربڕینی کاردۆزۆ و فالێتۆ کەوا، زیادە لە ڕادە گرینگی بۆ ڕۆڵی هۆکارە نێوخۆییەکانی وڵاتە پاشکۆکان دادەنێت. لە بابەت ئەم کێشەیە کەوا ئەوان ڕۆڵێکی گرینگ بۆ چینە باڵا دەستەکانی وڵاتە پاشکۆکان، سا لە دامەزراندن و پاراستنی پێوەندیی پاشکۆبوون و سا لە گەشەی وڵاتە پاشکۆکان دادەنێن، ڕەخنەی زیاتر کراوەتە سەریان.

هەندێک لە خاوەنبیران، پاشکۆبوون وەکو لایەنێک لە سیستەمی جیهانیی سەرمایەداری دادەنێن؛ سیستەمی جیهانیی سەرامەیداری لە بۆچوونی ئەواندا شتێکی گشتی و بە یەک پێوەندییدارە کەوا لە سەر بنەڕەتی یەک دابەشکاری کاری نێونەتەوەیی سازبووە و جیهانی بە دوو بەشی جیاواز دابەش کردووە؛ یەک بەشی گەشەسەندوو (کە بە ناوگەلێک وەکو نێوەند یا مێترۆپۆل دیاریان دەکات) و یەک بەشی گەشەنەسەندوو (کە بە ناوگەلێک وەکو کەمەرە یا پڕیمێتری ناویان دەبا). لەم سیستەمەدا بەشی گەشەسەندوو بە هۆی کەڵک وەرگرتن لە ڕۆڵە باڵادەستەکان و بە هۆی سەرتربوونی ماددی (سەرمایەداری) تەکنۆلۆجیک، میلیتاری و سیاسییەکەی بە سەر

بەشی گەشەنەسەندوو زاڵە و هەڵبەت بەشی گەشەنەسەندوو هەروەها بە هۆی ئەرکەکانی بۆ ژیان و مانەوەی ئەو سیستەمە، پێویستە.

بە ناوبانگترین تیۆرییدارێژەکان کە سەرنجیان بە پاشکۆبوون لە چوارچێوەی سیستەمی جیهانی داوە بریتین لە : »پۆل باران»، «ئاندرێ گوندرفرانک»، «سەمیر ئەمین» و«ئەمانۆئێل والرشتیان». لەو بەشە بەکورتی خەریکی پێناسەکردن و لێدوانی پۆل باران، ئاندرێ گوندر فرانک و سەمیر ئەمین لە بابەت پاشکۆبوون دەبین. لە نەسکی دووایی بە تێروتەسەلی باس لە تیۆرییەکانی ئێمانۆئل والرشتاین لە بابەت ڕێبازی سیستەمی جیهانی دەکەین.

**لێدوانی پۆل باران لەسەر پاشکۆبوون و هۆیەکانی گەشەنەسەندوویی:**

پۆل باران لە ساڵی ١٩١٠ لە ڕووسییە لە دایک بوو و بەشێک لە ژیانی خۆی لە ڕووسییە (ئەنستیتۆی ئابووری پۆڵخانۆفی مسکۆ) و پۆلەندا تێپەڕ کرد و پێش ڕۆیشتنی بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٣٩ زایینی بۆ بەردەوامی خوێندنەوەکانی خۆی لە »زانکۆ هاروارد» و « ئەنیستیتۆی بڕۆکینز» ماوەیەک لێکۆڵینەوەی لە برلین، فرانکفۆرت و پاریس ئەنجام داوە، پاشان لە « زانکۆ ستانفۆرد » بە پلەی دوکتورا لە ئابووری گەیی. (٤١) ئەو یەکێک لە بیرمەندە نوێ مارکسیستەکان بوو، کە لەو کاتەدا لە یەکێک لە زانکۆ گەورەکانی ئەمریکا وانەی دەگوتەوە. باران بە هۆی نووسراوەکانی لە بابەت دوواکەوتوویی و سەرمایەداری پاوەنی ناوبانگی دەرکردووە کە گەرنگترینی ئەوان بریتین لە: ***ئابووری سیاسی گەشە، ڕوانینێک بە دوورتر*** و نامیلکەی ***سەرمایەداری پاوەنی*** کەوا بە هاوکاری پۆل سوئێزی نووسرواە.

کێشەی گرینگ بۆ باران، لێکدانەوەی کاریگەرییەکانی سەرمایەداری پاوەنی لە سەر تاک و کۆمەڵگە بوو. ئەو بە تایبەت سەرقاڵی پشکنین و خوێندنەوەی نایەکسانی و نەبوونی عەقڵانییەتی سیستەمی سەرمایەداری لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بوو و لە سەر ئەم باوەڕە بوو کەوا مارکسیزم

دەتوانیٚ لە تێگەیشتنی ئەم بارودۆخە یاریدەر بێت، بە وتەی « جان ئۆنایل»، «باران هیچ کات لە دەربڕینی هەستی خۆی تووشی شک نەبوو کە دەڵیٚ: بۆ تێگەیشتن لە پاشکۆبوونی بەرامبەر لە نێوان چارەنووسی تاک لە سیستەمی سەرمایەداری پاوەنی و لە دایک بوونی تاک لەو وڵاتانەی کەوا لە ژێر سێبەری ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا دان، دەبیٚ لە مارکسیزم یارمەتی وەرگرین». ڕای باران ئەوە بوو کە مارکس لە سەدەی نۆزدە و پاشان لێنین، ڕۆدۆڵف هیلفردینگ، ڕۆزا لۆکزامبۆرگ و ئەوانی تر، مەیلی سەرمایەداری بۆ وەستان، ئیمپریالیزم و قەیرانی سیاسییان بە وردی شیکردۆتەوە.

ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کەوا سۆسیالیزم لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، لە کۆتاییدا لە خزمەت مرۆڤایەتیدا دەبێت. ئەو لایەنگری لە چەشنێک سۆسیالیزم دەرکرد کەوا، «نە تەنیا لەگەڵ تەممەڵ بوون، نەبوونی عەقڵانییەت و شوورەیی کولتووری و ڕەوشتی ڕۆژئاوا بەرەنگار بێتەوە، بەڵکو «توانای خۆی بۆ چارەسەری گشت گرفتەکانی هەژارەکان، نەخۆشەکان و برسییەکان لە بەشە گەشەنەسەندووەکانی جیهان بە کار بێنیٚ». بە بۆچوونی ئەو، سۆسیالیزم لە ڕۆژئاوا دەبیٚ خۆی لە بەکارهێنانی قەدەغەکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی زۆر توونـد کەوا لەگەڵ قۆناغە سەرەتاییەکانی سوسیالیزمی ڕۆژهەڵات هاوکات بوو، دوور ڕاگریٚ و سوسیالیزم لە وڵاتە دواکەوتوو و گەشەنەسەندووەکان هەروەها دەبیٚ بەسەر «مەیلی زۆری خۆی بۆ ئەوەی کە سۆسیالیزم دواکەوتوو و گەشەنەسەندوو بمێنێتەوە« زاڵ بێت.

باران لە گشت شوێنەوارەکانی خۆی لەسەر شوناسی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان پێداگری دەکات، کە »جیهانی دواکەوتوو، هەموو کات نیشاندەری گۆڕەپانی گرینگ و جیانەکراوەی سەرمایەداری پێشکەوتووی ڕۆژئاوا بووە«. باران بە هۆی ئەوەی کە کۆلۆنیالیزم و پاشکۆبوون لە جیهانی سەردەم وەکو یەک دەبینیٚ، پاشکۆبوونی ئەم وڵاتانەش باوەڕ دەکات و بەڵگە دێنێتەوە کەوا وڵاتە دواکەوتووکان ناتوانن وەکو وڵاتە

پێشکەوتووەکان سەرمایە کەڵەکە بکەن، یان بەسەر لەمپەرەکانی سەرمایەداری پاوەنی و ئیمپریالیزم زاڵ بن.

جەختی «باران» لەسەر کێشەی گەشەنەسەندوویی بووە هۆی ئەوەی کە لایەنگرانی گەشەی سەرمایەداری کەوا سەرمایەدارییان وەکو تەنیا ڕێگەی دەربازبوون لە دواکەوتوویی دەزانی، بەرەنگاری بۆچوونەکەی باران ببنەوە. باران بە تایبەت لەمەڕ خاڵە لاوازەکانی «واڵت ڕۆستۆ» لە کتێبی «قۆناغە گەشە ئابوورییەکان، مانیفێستی ناکۆمۆنیستی» چەند باسێکی پێشکەش کرد. ڕۆستۆ وێڕای لێکدانەوەی قۆناغە مێژووییەکانی گەشەی ئابووریی، لە سەر ئەم باوەڕە بوو کەوا پڕۆسەی گەشە، پڕۆسەیەکی بڕگەبڕگە (منقطع) و دیالکتیکی یە تا لە ئەنجامدا لە قۆناغی قەڵەمبازلێدان بە پێشکەوتنی خۆهاندەر و بەردەوام دەگات. باران بە چەشنێک کەوا لە خوارەوە هاتووە ڕەخنە لە چەمک بەندی ڕۆستۆ دەگرێ:

***تیۆریی قۆناغە گەشە ئابوورییەکانی ڕۆستۆ، بە پێچەوانەی بانگەشەکەی کە دەڵێ لە لایەنی مێژووییدا بەربڵاوە و لە لایەنی پشکنین کۆمەڵناسانەیە، بەڵام گەشەی ئابووری تەنیا بە شێوازێکی یەکەوە دەبستێتەوە. . . . تیۆریی ڕۆستۆ لە چوارچێوەی سنووورە تەواو تەنگەکانی خۆیدا، گەر سەرنج بەو تێبینی یانە نەدا کە هیچ پێوەندییەکی بە پلانی قۆناغەکانی گەشە نییە، توانا بە لێدوان و پێشبینی کردن نییە. . . بەو پێیە، لێکدانەوەی بابەتە سەرەکییەکانی تیۆریی گەشەی ئابووری ڕۆستۆ. . . نیشاندەری ئەوەیە کەوا ئەم تیۆرییە نە شتێک بە زانستی ئێمە لەمەڕ مێژووی گەشەی ئابووری زیاد دەکات ونە توانیویەتی تێگەیشتنی ئێمە لە پڕۆسەکانی پێوەندییدار قووڵتر بکات.*** (٤٢)

باران وێڕای ڕەخنەی نەرم لە سیستەمە ئابوورییە نامارکسیستەکان، هەوڵی داوە چوارچێوەی بۆچوونی خۆی لەمەڕ گەشەنەسەندوویی پتەو بکات. پشکنینی باران لەمەڕ گەشەنەسەندوویی، چوار چەمکی سەرەکی دەخاتە بەر چاو : سەرمایەداری پاوەنی، ئیمپریالیزم، چین و زێدەی

ئـابووری. بـاران، لێـدوانی مـارکس لـە بابـەت شوناسـی سـەرمایەداری و سەرمایەداری پاوەنی پەسەند دەکات و وێڕای پەیڕەوی لە لێنین، ئیمپریالیزم وەکو، سەرچاوەی میلیتاری و سیاسی سیستەمی سەرمایەداری دادەنێ کەوا لـە هـەوڵی بە دەست هێنـانی زێدەی ئـابووری دایـە (بـە تایبـەت لـە کۆتـایی سـەدەی ١٩ و سـەرەتای سـەدەی ٢٠، ئـەم هەوڵـە لـە لایـەن سـەرمایەداری پاوەنی ئەنجام دەدرێ) و چین وەکو، چەمکی کلاسیکی مارکسیستی پێناسـە دەکـات، یـانی ئـەو وەکـو چەشـنە بابـەتێکی کۆمەڵایـەتی چـاو لێدەکا کـەوا نیشـاندەری گرووپێـک لـە تاکەکانـە، کـە گشـتیان پێوەنـدییان بـە ئـامێری بەرهـەمهێنانی هاوشـێوە هەیـە و لـە بابـەت بەرهـەمی وزەی کـار مـافی یەکسـانیان هەیـە. بـەڵام لـە بـەروارد لەگـەڵ مارکسـیزمی کلاسـیک پلانـی وردتـری ئـەم چەمکـە لای بـاران، بـە هـۆی کێشـەی دابەشـکردنی زێـدە، گرینگییەکی تایبەتی لە چاو کێشەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا هەیە.

هەروەها لە بابەت چوارەمین و دوایین چەمک، باران بیروبۆچوونی نوێ پێشکەش دەکات. تێگەیشـتنی دروسـت لـەم چەمکـە، یـانی زێدەی ئـابووری، تێگەیشـتنی هـزری پـۆل بـارانی بـە دواوەیـە. زێـدەی ئـابووری بریتییـە لـە جیـاوازی نێوان دەرهـاتووی هەنووکـەیی ڕاسـتەقینەی کۆمەڵگـە و مەسـرەفی (بـەکارهێنانی) هەنووکـەیی ڕاسـتەقینەی ئـەو. لـەم ڕوانگەیـەدا شـێوەی کـەڵک وەرگـرتن لـەو زێدە ئابوورییـە لـە بابـەتی گەشـەدا ڕۆڵـی سـەرەکی هەیـە بە چەشـنێک کـەوا گوێسـتنەوەی بەشـێکی زۆر لـە زێـدەی وڵاتـە گەشەنەسەندووەکانی ئێستا لـە درێژایی ئـەزموونی کۆلۆنیالیزم و بەشداری لـە سیسـتەمی سـەرمایەداریی جیهـانی، وەکـو هـۆی گەشەنەسـەندوویی ئـەم وڵاتانە دەزانێ.

پۆل باران دوو چەشنە زێدەی ئابووری لە یەکتر جیا دەکاتـەوە : زێدەی ئابووری ڕاستییانە (لەبەر دەست)کە بریتییە لە جیاوازی نێوان بەرهـەمهێنانی ڕاسـتییانەی هەنووکـەیی لـە کۆمەڵگـە و مەسـرەفی ڕاسـتییانەی ئـەو؛ کەوایـە

بەشی ئەو لەگەڵ پاشەکەوتی (پس انداز) هەنووکەیی یا کەڵەکەکردنی سەرمایە یەکسانە و لە فۆڕمی سامانە جیاجیاکان خۆی نیشان دەدات کە لە درێژەی خولی باسکراو هۆی زیادبوونی سامانی کۆمەڵگە پێکدێنێ، وەکو ئامێر و کەرەسەکانی بەرهەمهێنان، شت و مەکی ئەمار، سەرجەم هەبووەکانی پارەی بیانی و زەخیرەی ئاڵتون. ئەو لە درێژەی باسەکەی خۆیدا زێدەی ئابووری شاراوە

زۆرجار لە من دەپرسن کە بیروڕای ئێستای من لە بابەت پاشکۆبوون چیە؟ جیاوازی بیروڕاکانی ئەمڕۆی من لەگەڵ ڕوانگەکانی ڕابردووە لەوەدا نییە کە «پاشکۆبوون» ئیتر بوونی نییە بەڵکو دەگەڕێتەوە سەر ئەو بابەتە کە ڕاکردن لە پاشکۆبوون بەم شێوەیە کەوا لە ڕابردوو بیرم لێ دەکردەوە ئیتر بوونی نییە. (٥٠)

فرانک لەسەر ئەم باوەڕەیە کە لە دەیەی ١٩٩٠ بەولاوە کێشەی سەرەکی، گەشە نییە، بەڵکو بەڕێوەبردنی قەیرانە. ئەو باوەڕی وایە کە قەیران لە کەمەرە لە دۆخێکی خراپتر دایە و بۆ وڵاتە مێترۆپۆلەکان ئەو ئەگەرە هەیە کەوا قەیرانی خۆیان بۆ کەمەرە بگوێزنەوە، بەڵام کەمەرە ناچارە (و لە لایەکەوە بێ توانا لە جێگۆڕکێی ئەو قەیرانە) لەگەڵ ئەو قەیرانە دەستەویەخە بێتەوە. ئەم بارودۆخە دەتوانێ هۆی داڕمان و تێکچوونی کەمرە بێت.

**تیۆریی سەمیر ئەمین لەبابەت بەم چەشنە پێناسە دەکات**: زێدەی ئابووری شاراوە بریتییە لە جیاوازی نێوان بەرهەمێک کەوا دەتوانێ بە یارمەتی سەرچاوە بەرهەمهێنەرەکانی بەکەڵک هاتوو (لە دۆخی تەکنۆلۆجیکی و سروشتی دیاریکراو) بەرهەم بێت، و ئەوەی کە بەشێک لە مەسرەفە سەرەکییەکان دیاری دەکات. باران لە سەر ئەم باوەڕەیە کەوا بۆ گەیشتن بەم چەشنە زێدەیە، دەبێ گۆرانکاری لە ڕێکخراوی بەرهەمهێنان و دابەشکاری بەرهەمی کۆمەڵایەتی و هەروەها گۆڕانکاری قووڵ لە بنەمای

کۆمەڵگە دروست بێت. ئەو بە فیڕۆدانی زێدەی شاراوە لە چوار ڕووبەرەوە دەخاتە ژێر پشکنینەوە:

یەکەم، مەسرەفی زیادە لە ڕادەی کۆمەڵگە (زۆرجار لە لایەن توێژە دەوڵەمەندەکان).

دووەم، بەرهەمێک کەوا بە هۆی بوونی کارمەندە نابەرهەمهێنەرەکان لە کۆمەڵگە بە فیڕۆ دەچێ.

سێیەم، بەرهەمێک کەوا بە هۆی بێ سەرەوبەرەیی و خراپ چاودێری کردنی دەزگای بەرهەمهێنان بە فیڕۆ دەچێت.

چوارەم، بەرهەمێک کەوا بە هۆی بوونی بێکاری سەرهەڵداو لە بشێوی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و نەبوونی داواکاری کاریگەر، بە هیچ چەشنێک بەرهەم نایە.

ئەم چەشنە تێگەیشتنانە لە بابەت زێدەی ئابووری، بارانی هاندا کەوا لەمەڕ کێشەی دواکەوتوویی لێکۆڵینەوە بکات. بە بۆچوونی باران دەبێ « یاسا تەکامولییەکانی جیهانی سەرمایەداری هەم لە بەشە پێشکەوتووەکان و هەم لە بەشە دواکەوتووەکانی ئەو » دیاری کرێ. ئەو دەیەوێت تایبەتمەندییە تایبەتییەکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان وەسف بکات و هۆیەکانی گەشەنەسەندوویی ئەوان لێکبداتەوە. ئەو لە هەوڵی ئەوەدا بوو کەوا بە خوێندنەوەی مێژووی هێند و ژاپۆن نیشان بدات کەوا ڕۆڵی کۆلۆنیالیزم لە گەشەنەسەندوویی هێند بنەڕەتی بووە و نەبوونی یەک ڕابردووی کۆلۆنیالیزم لە بابەت ژاپۆن یارمەتیەکی بنەڕەتی بۆ گەشەی پیشەسازی ئەم وڵاتە بووە.

باران دەڵێ:

***نابێ ئەم خاڵە پشت گوێ خەین کەوا ئەگەر هێند لە ڕەوشی خۆیدا بمایەتەوە، لەوانە بوو وردە وردە ڕێگەیەکی نێزیکتر و کەم مەترسیتری بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەی باشتر و خوشگوزەران بدۆزیبایەوە؛ ڕێگەیەک کەوا لەوێدا ناچار دەبوو بەرزەخی شۆڕشی بورژوازی بخاتە پشت سەر و بێ***

***شک گەشەی سەرمایەداری وەکو نرخی ئەم پێشکەوتنە تێپەڕێنێ. . . . بەم چەشنە بە تەواویی هێندێکی نوێ و جیهانێکی ترمان دەبوو؛ ئەگەر بیانهێشتبایە - هەر وەکو بۆ تاقمێک لە وڵاتە بەختەوەرەکان (ژاپۆن) هێشتیان – کەوا چارەنووس بە هەمان شێوە کەوا خۆیان دەیانهەویست بینووسن، سەرچاوەکانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بە کار دەهێنا، یان هێز و وزەکانیان لە ڕێگەی پێشکەوتنی جەماوەری خۆیان تەیار دەکرد.*** (٤٣)

لە بەرامبەر ئەم ڕاستییەدا، باران گەشەی ئابووری ژاپۆنی خستە ژێر سەرنجی خۆی و ئەوی قەرزدار بە تووش نەبوون بە حکوومەتی داگیرکەر و پاشکۆ بە سەرمایەداری جیهانی (پێش گەشەی پیشەسازی) دەزانی :

***ژاپۆن تەنیا وڵاتیکە لە ئاسیا (یان ئەفریقا و ئەمریکای لاتین) کە لە کۆلۆنیالیزم و پاشکۆبوون بە سەرمایەداری ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکا بە سڵامەت مایەوە و دەرفەتێکی بۆ گەشەی سەربەخۆی نەتەوەیی بە دەست هێنا. . . ژاپۆن نە بازاڕێکی ئەوتۆی هەبوو کە دروست کراوە بیانییەکان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و نە دەیتوانی بۆ پیشەسازی ڕۆژئاوا، ئەماری مادده خاوەکان بێت؛ کەوایە ژاپۆن هیچکات وەکو ئاڵتونی ئەمریکای لاتین و بەرهەمە گیایی و ئاژەڵی و کانزاییەکانی ئەفریقا، سامانە سەرسوڕهێنەرەکانی دوورگە هێندییەکان، یا بازاڕە بێ سنوورەکانی چین بۆ سەرمایەدارەکان و دەوڵەتە ئەورووپییە ڕۆژئاواییەکانە سەرنجڕاکێش نەبووە.*** (٤٤)

باران تایبەتمەندی تایبەتی پێشکەوتنی ئەورووپای ڕۆژئاوای وەکو هۆکاری دەستنیشانکەر بۆگەشەنەسەندوویی کۆمەڵگە دواکەوتووەکان دەزانی. ئەو ئەم ڕستەیەی مارکس دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە دەیگوت: «وڵاتێک کەوا لە لایەنی پیشەسازییەوە پێشکەوتنی بە دەست هێنابێ نموونەیەکە بۆ داهاتووی وڵاتە کەم گەشەسەندووەکان، ئەو ئەم ڕوانگەیەی مارکس دەخاتە ژێر ڕەخنەوە و دەڵێ لە ڕاستیدا ئەم ڕووداوە ڕووی نەدا و ئەورووپای ڕۆژئاوا، پاشماوەی جیهانی، بە خێرایی بە جێ هێشت. (ئەم

کـاره) بــه هــیچ چەشــنێک نــه وەک ڕووداو بــوو و نــه لــه دایــک بــووی تایبەتمەندییــە ڕەگەزییــەکانی ئــەم یان ئــەو قــەوم بــوو. تایبەتمەنـدی تایبــەتی پێشکەوتنی ئەورووپای ڕۆژئاوا هۆکاری دەست نیشانکەر بوو و بەس.

بــاران لەســـەر ئـــەم بـــاوەڕە بـــوو کـــە ئەگـــەر وڵاتـــە پێشـــکەوتووە ســـەرمایەدارەکان لەگـــەڵ یـــەکتر هاوکاریـــان بکردایـــە و بـــە جێـــی زوڵـــم و چەســـاندنەوەی جیهـــانی دواکـــەوتوو یارمـــەتی ئـــەوانیان بدایـــە، ئـــەو کـــات گەشەیەک کەوا ڕووی دەدا، گەشەیەکی پێشکەوتوو بوو. بەڵام بە جێی ئەو، دەســـت بەســـەرداگرتنی دڵڕەقانـــه و وێرانکـــەری وڵاتـــه لاوازەکـــان لـــه لایـــەن سەرمایەداری ڕۆژئاوا، گەشەی ئەوانی بە تووندی بە لاڕێدا برد.

**لێــدوانی فرانــک لەســـەر گەشـــەی گەشەنەســـەندوویی لـــە سیســـتەمی سەرمایەداریدا**

«ئاندرێ گۆندرفرانک» یەکێک لە لێهاتووترین تیۆرییداڕێژەکانی ڕێبازی پاشـکۆبوون دەژمێـردرا. ئـەم لێهـاتوویی و گرینگییـە بـەو هۆیـەوە نییـە کـەوا فرانک چەمکە نوێ- یەکانی لەم ڕوانگەیەدا پێشـکەش کـردووە، بـەڵکو زۆرتـر لــە بــەر ئەوەیــە کــەوا بۆچــوون و تیۆرییــەکانی ئــەم ڕوانگەیــەی گشــتی کردۆتەوە.

لە دەیەی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ «ئاندرێ گۆندر فرانک» بۆچوونێکی ڕادیکاڵی هـەبوو و بیروڕاکـانی ئـەو سـەچاوەی نیگـا بـۆ بزووتنـەوەکان، ڕێبازەکـان و ڕووداوە ڕادیکاڵەکان لە وڵاتـە گەشەنەسـەندووەکان بـە تایبـەت لـە ئەمریکای لاتین بوون. بەڵام لە دەیەی ١٩٨٠ بەولاوە فرانک بیروڕایەکی جیاوازی گرتـە بـەر؛ ئـەو جگـە لەوەیکـە بۆچـوونی سـەرەکی خـۆی یـانی پاشـکۆ بـوون و سیستەمی جیهانی وەلانـابوو، بـەڵام لـە سـەر ئـەم باوەڕە بـوو کـەوا نـاتوانین کۆتایی بە پاشکۆبوون بێنین.

ئانـدرێ گونـدر فۆانـک لـە سـاڵی ١٩٢٩ لـە بـرلین لـە دایـک بـوو و پلـەی دۆکتواری خۆی لە ئابووری لـە زانکـۆی شـیکاگۆ وەرگـرت و لـەو کاتـەوە لـە زانکۆ جیاجیاکان لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کانادا، ئینگلیس و ئاڵمان

خەریکی وانەوتنەوە بووە. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٢ بۆ ئەمریکای لاتین ڕۆیشت و لە ماوەی چوار ساڵ مانەوەی خۆی خەریکی وانە وتنەوە لەسەر تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکان لە »زانکۆی بەرازیلیا» و گەشەی ئابووری لە زانکۆ نەتەوەییەکانی شیلی و مەکزیک بوو. فرانک لە یەکێک لە نامیلکەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٦٦ بەڵگەی هێناوە کەوا »تیۆرییەکانی زۆر جار توانا بە دەربڕینی بنەمای سیستەمی سەرمایەداری و گەشەی ئەو وەکو هەمەکی (کل)نەبوون و ناتوانن لێدوانێک لەسەر گەشەنەسەندوویی هەندێک لە بەشەکان، هاوکات لەگەڵ گەشە لە بەشەکانی تر پێشکەش بکەن ». فرانک لەو نامیلکەیە بۆ یەکەم جار تیۆریی کاریگەر و باسهەڵگری خۆی لە بابەت گەشەی «سەرمایەداری کەم گەشەسەندوو» پێشکەش کرد. ئەو ئەم تیۆرییەی پەسەند نەدەکرد کەوا گەشەی ئابووری، بە ئاراستەی زنجیرە قۆناغە یەک بە دوای یەکەکان ڕوو دەدات و ئەوە کەوا وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ئێستاش دەتوانن بە پلە بەرزەکانی گەشە بگەن. بە وتەی ئەو : «گەشەنەسەندوویی نە دیاردەیەکی زاتییە و نە حاڵەتێکی نەریتییە. . . . . و وڵاتە گەشەنەسەندووەکانی ئێستا هیچکات گەشەنەسەندوو نەبوون؛ ئەگەرچی لەوانەیە سەردەمێک لە گەشە بێگانە بووبێتن».

فڕانک لەم بابەتەوە دەڵێ:

***وڵاتە گەشەسەندووەکانی ئێستا هیچکات گەشەنەسەندوو نەبوون بەڵکو ڕەنگە ئەوان وەکو وڵاتە »بێ گەشەکان» یاد بکرێنەوە. مەبەست لە وڵاتی «بێ گەشە» لێرەدا وڵاتێکە، کەوا تا ئێستا لە قۆناغی گەشەی سەرمایەداری کە لە پاشان دەست دەداتە دروست کردنی سیستەمە سەرمایەدارییە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان، جێ گیر نەبووە. ئەم چەمکە لە بەرامبەر وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بەکار دێنن و مەبەست وڵاتیکە کەوا لە سەرچاوە و دۆخە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی پێویست بۆ هەنگاو هەڵێنان لە ڕێگەی گەشە بێ بەش ماوەتەوە. وڵاتی گەشەنەسەندوو لە ڕاستیدا وڵاتێکە کە بە هۆی تاڵانی کۆلۆنیالیزم و «بەشداری لە سیستەمی یەکەی***

***جیهانیی سەرمایەداری (سەرەتا سەوداگەرانە و پاشان پیشەسازی)» لە گەشە بێ بەش بووە و بە شێوەی هاوکات لە گەشەی سەرمایەداری و گەشەنەسەندوویی خۆی (وەکو یەک پرۆسەی یەکە وێڕای ئاکامە بەرامبەرەکانی ) بەشداربووە.*** [٤٥]

فڕانک بە ئاوێتەکردنی دوو چەمکی «چەوسانەوەی چینایەتی» و «جێگۆڕکێی بەها» لەناوچە جوگرافیا گەشەنەسەندووکان بۆ ناوچە پێشکەوتووەکان، چەمکی زنجیرە پێوەندییە چەوساندنەوەکانی نێوەند – کەمەرە پێشکەش دەکات و پاشان مۆدێلی هزری خۆی لە ئاستێکی جیهانیدا ئاوا دەکێشێتەوە:

***یەک زنجیرەی کامل (پڕاوپڕ) لە سیستەمە پێکهاتووە نێوەند و کەمەرەکانە، گشت بەشەکانی سیستەم، لە نێوەندی گەورەشاری سەرەکی لە ئەورووپا یا نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا دوورکەوتووترین ناوچەی لادێ یی لە ئەمریکای لاتین پێکەوە گرێ دەدات.*** [٤٦]

بە ڕای ئەو ئەم زنجیرەیە لە ئاستە جیاجیاکانی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی بوونی هەیە، بەو مانایە کەوا لە ئاستی جیهانی، پێوەندیی نێوان وڵاتە پیشەسازییە ڕۆژئاواییەکان و جیهانی سێیەمی ناپیشەسازی وەکو، پێوەندیی مێترۆپۆل (نێوەند یا گەورەشار ) – پریمێتری (کەمەرە )یە. هاوشێوەی ئەم پێوەندییە دەتوانین لە پێوەندیی نێوان پایتەختە پێشکەوتووەکانی وڵاتە دواکەوتوەکان لەگەڵ ناوچە دواکەوتووەکانی ئەم وڵاتانە ببینین. هەروەها ئەم پێوەندییە لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکانیش بوونی هەیە. بۆ وینە پێوەندیی نێوان خاوەن زەوی و وەرزێر یا پێوەندیی سەرمایەدار و کرێکار لە نێوخۆی وڵاتەکاندا فۆرمێکە لە پێوەندیی مێترۆپۆل (گەورەشار) – پریمێتری.

بە بۆچوونی فڕانک لە سیستەمی سەرمایەداری جیهانیدا، تەنیا ئەو نێوەندە مێترۆپۆلانە دەتوانن بە تەواوی گەشە بکەن کە بەشیکی بەرچاو لە زێدەکانیان ناکەوێتە دەست سەرمایەی جیهانییەوە، گشت ئەم ناوچانەی کەوا

زێدەی ئەوان بەم شێوەیە تاڵان دەکرێ، مەحکووم بە گەشەنەسەندووییین و ئەم کارە لە پڕۆسەیەکی پلەبەپلەدا جێبەجێ دەکرێت.

فرانک سیستەمی سەرمایەداری جیهانی وەکو هیرارشی یا بنەمایەکی هەرەمی گریمانە دەکات کەوا لە ژێرەوە، ناوچە لادێیە کەمەرەکان جێگیر بوون. ئەم ناوچە کەمەرانە لە ڕێگەی بازرگانی لەگەڵ نێوەندە بچوکەکانی کەڵەکەکردنی زێدە، کە ڕۆڵی مێترۆپۆلە خۆولاتییەکانیان بۆ ئەوان هەیە، پێوەندیی دروست دەکەن. ئەوانەش ڕۆڵی کەمەرە دەگێڕن چونکە لە ڕێگەی بازرگانی و چالاکییە ئابوورییەکانی تر زێدەکانیان بە دەست نێوەندە گەورەکانی تر (شارە ناوچەییەکان) تاڵان دەبێ. ئەم شارانەش وەکو، کەمەرەکانی نێوەندە بچوکەکان لە ئابوورییە نەتەوەییەکانی کەمەرەیان لێدێت؛ ئەو نێوەندانە بەندەری سەرەکی یان پایتەختن.

فرانک نەک هەر دەڵێ، سەرمایەداری بازرگانی بە تەواوی لە بنەوەی (بن) هەرەم نێزیک بۆتەوە، بەڵکو لە سەر ئەم باوەڕەیە کەوا ئەم پێوەندییە ئاڵوگۆڕانە گشتیان لایەنی پاوەنییان هەیە. لە هەر ئاستێکدا تاڵانی زێدە بە دەستی بازرگانە پاوەنخوازەکان کە بە هەرزان دەیکڕن و بە گران دەیفرۆشن، بە لووتکەی خۆی دەگات؛ ئەگەرچی لە بابەت فرۆش، هەمیشە ئەگەری هاتنە خوارێی نرخی بەرهەمە هاوردەکان (لە کاتێکدا لاوازی بەرهەمهێنەرە خۆولاتییەکان مەبەست بێت) هەیە.

فرانک ئاماژە بە قەیران و چەرخە مێژووییەکانی وەکو؛ قەیرانی ئەورووپا لە سەدەی حەڤدە، شەڕەکانی ناپلئون، شەڕی جیهانی یەکەم، قەیرانی گەورەی ۱۹۳۲ و شەڕی جیهانی دووەم دەکات کە لەو قەیران و چەرخانەدا، بەشێک لە کەمەرە بە پلەیەکی دیاریکراو لە گەشەسەندوویی گەیشتن و فرانک هۆی کارەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ لاوازی و سست بوونی پێوەندیی پاشکۆبوونی کەمەرە بە نێوەندەکان. لەو خولە ئاماژەپێکراوانە کەوا قەیران، شەڕ و وەستانی ئابووری بازنەی پێوەندیی نێوەندە مێترۆپۆلەکان لەگەڵ کەمەرە هەڵدەوەشێنێ، سرووەی گەشە و ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان لە

کەمەرە هەڵی کرد و بەرهەمهێنانی بەرهەمە کارخانەییەکان بە مەبەستی چوونە جێگەی هاوردە، بە شێوەی کاتی گەشەی کرد.

بەم حاڵەوە، پاش ئەوەی کە نێوەندەکان لە قەیران و شەڕە ئاماژە پێکراوەکان ڕزگاریان دەبوو، کەمەرە دیسان ڕاکێشی سیستەمی جیهانی دەبوو و لە ئەنجامدا گەشەی پێشویان لە دەست دەدا. بە واتایەکی تر، دووبارە ژیانەوەی بازرگانی نێونەتەوەیی، هەمیشە هۆی لاوازی پیشەسازیی بەرهەمهێنانی نوێ لە ئابوورییە کەمەرەکان بووە بە شێوەیەک کەوا ئابوورییە کەمەرەکان ناچار بوون بگەڕێنەوە بۆ ڕۆڵی نەریتی خۆیان وەکو هەناردەکەری سەرچاوە خاو و سروشتییە هەرزانەکان بۆ نێوەندە مێترۆپۆلە سەرمایەدارییە نێونەتەوەییەکان.

دژایەتی لەگەڵ ئاوا ڕۆڵێک لە کەمەرە لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەی توند لە لایەن سەرمایەداری بیانی ڕووبەڕوو دەبێ، چونکە لە کاتی بە دەستهێنانی سەربەخۆیی سیاسی ڕواڵەتییانە لە کەمەرە، سەرمایەداری بیانی لەگەڵ چینی سەرمایەداری پاشکۆ لە وڵاتە کەمەرەکان یانی بورژوای کۆمپرادۆر کە خاوەن بەرژەوەندی ئابووری بازرگانییە، هاوکاری دەکات.

بنەڕەتی تیۆرییەکانی فرانک لە بابەت گەشەنەسەندوویی دەتوانین لە نامیلکەکان و هەروەها پەرتووکەکانی وەکو؛ «سەرمایەداری و گەشەنەسەندوویی لە ئەمریکای لاتین»، «ئەمریکای لاتین:گەشەنەسەندوویی یا شۆڕش» و «لە بابەت گەشەسەندن لە سیستەمی سەرمایەداری» بدۆزینەوە. ئەو لەم کتێب و نامیلکانە بە کەڵک وەرگرتن لە ئەزمونی مێژوویی پێوەندییە بیانی و نێوخۆییەکانی دوو وڵاتی شیلی و بەرازیل باسێک دەخاتە ڕوو کەوا بڕوای وایە پێش سازبوونی گەشە، گەشەنەسەندوویی بە هیچ چەشنێک بوونی نەبووە. بە وتەی ئەو : « ئەم گەشەنەسەندووییە کە ئەمڕۆ دەیبینین و هەروەها گەشەی ئابووری، هەر دوو بە شێوەی بەرامبەر و هاوکات، بەرهەمی گەشەی. . . . سیستەمێکی یەکە و یەکگرتووی ئابوورییە کە هەمان سیستەمی سەرمایەدارییە».

لە تیۆریی فرانک، نێوەند لە هیرارشی هێزی ئابووریدا جێگەیەکی تایبەتی هەیە و بەو پێیە لە ڕێکخراوی جیهانی بەرهەمهێنان و دابەشکاری کەلوپەل ڕۆڵ دەگێڕێ. کەوایە، مێترۆپۆلەکان بەها زیادبووە زۆرەکان لەناوچە کەمەرەکان دەبەنە دەرێ. بەم چەشنە هەڵسوکەوتی بیانی ئەم دوو دەستە وڵاتە بە تەواوی لەگەڵ یەک خراپە. لێرەدا فۆڕمی پێوەندیی، پاشکۆبوونە، بەڵام ئەم پاشکۆبوونە بە شێوەی یەک لایەنە لە لایەن نێوەندەکان و بە یارمەتی «بۆرژوازی کۆمپرادۆر» لە وڵاتە کەمەرەکان بەسەر هەڵسوکەوتی وڵاتە کەمەرەکان دادەسەپێ. کەوایە بنەمایەکی ئابووری، سیاسی تایبەت لە وڵاتە کەمەرەکان دروست دەبێ کەوا بە پێی ئەو لە پانتای بیانیدا، وڵاتی کەمەرە تووشی پاشکۆبوونی بنەمایی پێوەندیی لەگەڵ مێترۆپۆل دەبێ. جگە لەم پاشکۆبوونە بیانی یە، لە قۆناغی دووایی‌دا، پێگەی وڵاتی پاشکۆ پلەبەپلە لە لایەنی پەرەسەندنی هەژاری، کەم بوونی پیشەسازی، نەخوێندەواری و ناسەقامگیری زۆر، کەم دەبێتەوە؛ بە پێچەوانەوە مێترۆپۆل لە پێگەیەکی باشتر قازانج وەردەگری. وڵاتە پاشکۆکان (کەمەرە) لە ڕواڵەتدا خاوەن سەربەخۆیی سیاسین، بەڵام سەرمایەداری پاشکۆ لە ڕاستیدا بەرەو بەرهەمهێنانی بەهای زێدە بۆ وڵاتە نێوەندەکان کار دەکات؛ لە ئەنجامدا سەرمایەداری نەتەوەیی و پێشکەوتنی ئابووری ئەم دەستە لە وڵاتەکان بە فۆڕمێکی تەواو جیاواز لە وڵاتە پیشەسازی و مێترۆپۆلەکان گۆڕانکاری بە سەردا دێت. بۆیە لە پێوەندییە بیانییەکان ناتوانین بە هیوای ئەوە بین کەوا لەگەڵ بوونی پاشکۆبوون، پێگەی کەمەرە لە پەراوێزەوە (حاشیە) بۆ مێترۆپۆل (نێوەند) بگۆڕدرێ. ئەو پێشبینی دەکات کەوا ئەم پێوەندییە نایەکسانانە بەردەوام ساز دەبێ. وڵاتە سەرمایەدارە کەمەرەکان، ناتوانن لە بنەمای سەرمایەداری ڕزگاریان بێت و چالاکانە لە سیستەمی سەرمایەداری جیهانی کە وەکو یەک هەمەکی وایە، تێکەڵ بن و ڕێگەیەک جگە لە گەشەنەسەندوویی چاوەڕێیان ناکات.

جگە لەوە، فرانک ناکۆکی و جیاوازی نێوان ئەکترەکانی وڵاتە نێوەند و کەمەرەکانی پێشکەش کرد و گوتی زێدەی ئابوری کەمەرە لە لایەن نێوەندەوە دەستی بەسەردا دەگیرێ. بە هۆی دەست بەسەردا گرتنی ئەو زێدە ئابوورییە، تاقمێکی کەم لە وڵاتەکان بە پتەو کردنی ڕەوشی نێوخۆیی بە پلەیەکی بەرزتر و لوتکەیەک لە سیستەمی هیرارشی جیهان دەگەن. ئەوە لە حاڵێکدایە کە زۆربەی وڵاتەکان لە باری گەشەنەسەندوویی و دەست پێ ڕانەگەیشتنی زێدەی ئابووری، لە دۆخی گەشەنەسەندوویی دەمێننەوە. لە کۆتاییدا فرانک ئەنجامی کارەکەی بەم جۆرە پێشکەش دەکا؛ یەکەم لە باری نێوخۆیی، نێوەند بە ڕادەیەک بۆ بنەمای کەمەرە مەرج دادەنێ کە ئەو وڵاتانە ناتوانن بە گەشەی سەربەخۆ و پەسەندکراو بگەن؛ دووەم ئەگەر وڵاتە کەمەرەکان پێوەندیی خۆیان لەگەڵ نێوەند لاواز بکەن، دەتوانن گەشەی ئابووری زیاتر تاقی بکەنەوە.

لە کۆبەندی باسەکانی سەرەوە بەم ئەنجامە دەگەین کەوا بنەڕەتی ترین گریمانەی زەینی فرانک ئەوەیە کەوا گەشەی گەشەنەسەندوویی کەمەرە لە لایەکەوە و گەشەی گەشەسەندوویی نێوەند لە لایەکی ترەوە بەرهەمی سەرمایەدارییە.

هێڵکاری خوارەوە گریمانەی فرانک نیشان دەدات :




فڕانک بە جەخت لەسەر پڕۆسەی گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی ئەمریکای لاتین بە تایبەت شیلی و بەرازیل، بانگەشەی ئەوە دەکات کەوا پێوەندیی

پاشکۆبوونی ئابووری ئەم ناوچەیە، لەگەڵ هێرشی ئیسپانیا و پورتوگاڵ لە چوارچێوەی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری لە سەدەی شانزدە دەستی پێکرد.

ئەو لەبابەت شیلی بۆچوونی وابوو کە خولە ئابوورییەکان کە لە لایەن گەشەی جیهانی سیستەمی سەرمایەداری ساز ببوون، ئابووری ئەو وڵاتەی بە شێوەی ڕێژەیی لە نێوەند جیا کردبۆوە. شیلی بە درێژایی سەدەی حەڤدە «گۆشەگیرتر لە کۆلۆنییەکانی تری ئیسپانیا بووە و کەمتر لە ئەوانی تر ڕاکێشی بنەمای جیهانی نێوەند – کەمەرە لە سیستەمی سەرمایەداری بووە«. لە نێوان سەدەی هەژدە هەروەها شیلی ئابووری دامەزراو لەسەر هەناردەی خۆی سەرەتا بە هەناردەکردنی ئاڵتون و زێو و مس پەرە پێدا لە حاڵێکدا لە سەدەی نۆزدە، سیستەمی سەرمایەداری هۆکاری پتەوکردنی گەشەنەسەندوویی لە نێوخۆی ئەو وڵاتە ساز کرد. بە وتەی فڕانک: «ناکۆکییە بنەڕەتییەکانی سیستەمی سەرمایەداری. . . . بە لەباربردنی هەوڵەکانی شیلی لە پێناو گەشەی نەتەوەیی ئەو وڵاتە، خەڵکی ئەو وڵاتەی بە ڕازی بوون بە گەشەی گەشەنەسەندوویی مەحکووم کرد». لە سەدەی بیستەم لەگەڵ زیادبوونی پاشکۆیی شیلی بە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو ناکۆکییانە قووڵتر بوونەوە. ئەو بەم ئەنجامانە گەیی کە گەشەنەسەندوویی شیلی هۆکردی بنەمای دەرەبەگایەتی ئەو نییە، بەڵکو هێزە خۆوڵاتییەکان کە هەمیشە لەگەڵ بەرژەوەندییە بازرگانییە بیانییەکان هاوپەیوەند بوون، و هەروەها دەوڵەت و ڕێکخراوەکانی ئەو «هەموو کات بەشێک لە سیستەمی سەرمایەداری لە شیلی و جیهان و ئامێری دەستی بۆرژوازی بوون».

فڕانک شیکردنەوەیەکی تا ڕادەیەک هاوشێوەی لە مەڕ گەشەنەسەندوویی بەرازیل پێشکەش کردووە. بانگەشەی تیۆریی فڕانک ئەوەیە کەوا ئەو پێوەندییە پاشکۆبوونە تەنیا بە ئەمریکای لاتین نەبەستراوەتەوە. هەر بەشێک لەناوچە کەمەرەکانی جیهان کەوا لە ڕێگەی

زنجیرە پاشکۆکان لەگەڵ مێترۆپۆل پێوەندیی دەگرن، بەم شێوەیە تووشی گەشەی گەشەنەسەندوویی دەبن: فرانک بە جەخت لەسەر نموونەی بەرازیل بانگەشەی ئەوە دەکات کە کاریگەرییە خراپەکانی پاشکۆبوون تا ڕادەیەک فرەوانە کە تەنانەت بە بەشە ئابوورییە بژیوەکانی وڵاتە کەمەرەکانیش دەگات. ئەو دەڵێ هیچ جێگەیەک لە ئەمریکای لاتین نییە کە لە شوێنەواری خراپی پاشکۆبوون لە ئاسایش دابێت. لە ئاکامی بەکارهێنانی ئەو پاشکۆبوونە، کەمەرە لە سەرچاوە پێویستەکان بۆ سەرمایەداری بێ بەش دەبێت. سەرچاوە سەرمایەدارییە پاشکۆکان لەو وڵاتانە بە شێوەیەک لەگەڵ بەرژەوەندییە مێترۆپۆلەکان پەیوەند دەدرێ کەوا خۆی هۆی بەردەوامی پاشکۆبوونی کەمەرە دروست دەکات. ئەو سەرمایەدارییە پاشکۆیە بە شێوەی سەرمایەداری لۆمپەنی خۆی دەردەخات. (٤٧)

ئاندرێ گوندر فرانک لە دەیەی ١٩٨٠ بەولاوە لە بەراورد لەگەڵ دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠، سیستەمی سەرمایەداری جیهانی بە بەردەوامی لە هزری خۆی دەهێڵێتەوە و هەمدیسانەوە بە ئاڵوگۆڕی نایەکسان و پێوەندیی نێوەند – کەمەرە باوەڕی هەیە. ئەو لە وڵامدانەوە بەو پرسیارە کەوا جیاوازی نێوان فرانک لە دەیەی شەست و حەفتا لەگەڵ فرانک لە ئەمڕۆدا چیە دەڵێ:

***ئەوەی کەوا لە هەر دووی ئەو خولانە هاوبەشە بیری پاشکۆبوونە و ئەوەی کەوا دەتوانرێ وەکو جیاوازی ئەو دوو خولانە یا ڕیزپەڕتر بڵێین لە نێوان دەیەی ١٩٦٠ و ١٩٨٠ بەم لاوە پێشکەش بکرێ ئەوەیە کەوا، ئێستا بەو ئەنجامە گەیشتوم کە ڕاکردنێک لە دەست پاشکۆبوون نییە. ئەمڕۆ پاشکۆبوون لە خراپترین ڕەوشی ژیانی خۆی دایە، بەڵام ڕێگەچارەی وەک سوسیالیزم کە پێشتر بۆ ڕزگاری لە پاشکۆبوون بیرم لێدەکردەوە ئیتر بوونی نییە.*** (٤٨)

ئەو بە پێچەوانەی دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ کە باوەڕی وابوو لە ڕێگەی گەشەی سوسیالیستی دەتوانین بەسەر گەشەنەسەندوویی سەرهەڵداو لە

گەشەی سەرمایەداری لە ئاسیا، ئافریقا و ئەمریکای لاتین زاڵ بین لە دەیەی ١٩٩٠ بەولاوە بەروە ئەو باوەڕە ڕاکێشرا کە وڵاتە سوسیالیزمەکان نەیانتوانیوە بۆ خۆیان یا بۆ جیهانی سێیەم، دابەشکاری کار و بازاری بەهێز وەکو ئەڵتەرناتیڤێک لە بەرامبەر دابەشکاری کاری سەرمایەداری جیهانی دروست بکەن. سۆسیالیزم تەنیا لە لایەنی ڕووخانییەوە (سیاسی) یارمەتی گەیاندووە و هیچ جۆرە ڕێگەیەکی تری لە لایەنی ژێرخانییەوە (ئابووری ) بەوان پێشکەش نەکردووە. فرانک رای خۆی لە بابەت سۆسیالیزم بەم شێوەیە دەردەبڕێ:

***سەرمایەداری، چەوساندنەوەی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤە و سۆسیالیزم ڕێک بە پێچەوانەی ئەوە و هیچ جیاوازییەکی ناوەڕۆکی لە نێوان ئەو دووانە (سۆسیالیزم و سەرمایەداری) نییە و هەر دووی ئەوان پاژەکانی یەک سیستەمی جیهانین و هێز و یاساگەلێکی یەکە بەسەریاندا زاڵە.*** (٤٩)

فرانک لە جێگەیەکی دیکە دەڵێ:

**گەشەنەسەندوویی کەمەرە:**

سەمیر ئەمین لە ساڵی ١٩٣١ لە میسر لە دایک بوو. پلەی دوکتورای خۆی لە ئابووری لە پاریس وەرگرت. مامۆستای ئابووری لە زانکۆکانی «داکار»، «پویتی یرنر» و «پاریس» و هەروەها وەکو سەرۆکی «ڕێکخراوی ئافریقایی گەشە و پلان دارێژی ئابووری» لە داکار خزمەتی کردووە. خاوەنی شوێنەوارێکی زۆر بە ناوبانگ لە بابەت گەشە و گەشەنەسەندووییە کە گرینگترینی ئەوان بریتین لە : ***کەڵەکەکردنی جیهان، گەشەی نایەکسان، ئێمپریالیزم و گەشەی نایەکسان، یاسای بەها و ماتریالیزمی مێژوویی و چین و نەتەوە.*** سەمیر ئەمین شوێنەوارێکی گرینگی لە بابەت ڕۆژهەڵاتی ناوین و ئەفریقا هەیە کەوا لە نێوان ئەواندا دەتوانین بە ***کۆلۆنیالیزمی نوێ لە ڕۆژئاوای ئەفریقا، ڕۆژئاوا لە جیهانی نوێ دا: ئەلجەزایر، تونس، مەراکش و نەتەوەی عەرەب*** ئاماژە بکەین.

ئەو لە کتێبی ***کەڵەکەکردنی جیهانی***، وێژەی ڕەوتی سەرەکی ئابووری سیاسی گەشەی بە شێوەیەکی سیستەماتیک خستە ژێر ڕەخنەوە و بە پێشکەشکردنی سەنتێزێک لە تیۆریی و چەمکە مارکسییەکان و مارکسیستەکانی تر، گەشەنەسەندوویی پێشکەش کرد. ئەو لە تیۆریی خۆی ئەو گریمانەیە پەسەند ناکات کە جیهان بریتی لە وڵاتە گەشەسەندوو و گەشەنەسەندووەکانی سەرمایەداری و سوسیالیستییە و هەموویان لە تۆڕی بازرگانی و ماڵی جیهانی تێکەڵ بوون. بە باوەڕی ئەو «بەم چەشنە نییە کە دوو بازاڕی جیهانی، یەکیان سەرمایەداری و ئەوی تریان سۆسیالیستی بوونی هەبێت، بەڵکو جیهان تەنیا خاوەن یەک بازاڕە کە هەمان بازاڕی جیهانی سەرمایەدارییە و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی هەروەها لەوێدا بەشداری ڕێژەیی هەیە».

سەمیر ئەمین پاشکۆبوون وەکو بەشێک لە سروشتی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی دەزانێ. ئەو دەستی بە شیکردنەوەی «جیهانیبوونی سەرمایەداری» لەسەر بنەڕەتی کەڵەکەکردنی سەرمایە کردوە. بە ڕای ئەو کەڵەکەکردن «یەکێک لە گرینگترین پرنسیپە زاتییەکانی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و هەروەها بێ شک شێوەی بەرهەمهێنانی سوسیالیستییە بەڵام. . . . پرنسیپی زاتی بۆ کارکردی شێوازەکانی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری ناژمێردرێ».

سەمیر ئەمین باوەری وایە کە یەک سیستەمی سەرمایەداری جیهانیبوونی هەیە کە بزوێنەرەکانی گەشەی خۆی لە نێوەندی ئەم سیستەمە (وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکان) دەگرێ. ئەم نێوەندانە توانا بە گەشەی خودکار و سەربەخۆن، لە حاڵێکدا وڵاتە کەمەرەکانی ئەم سیستەمە (وڵاتە گەشەنەسەندوو ناپیشەسازییەکان) توانا بە وەها کارێک نیین. هەڵبەت گەشەی نێوەند هەروەها مەرجدارە بە کۆنترۆڵ کردنی مووچەکان و دۆزینەوەی ڕێگە دەربازبووەکان بۆ سەرمایە زێدەکان. هەرچەند لە نێوخۆی نێوەند کەرەسەگەلێک بۆ وڵامدانەوە بەم دوو پێداویستییە هەیە، بەڵام لە

چەند سەدەی ڕابردوودا هەوڵی داوە تا بۆ هەرچی باشتر دابین کردنی ئەم پێداویستییانەی خۆی، کەمەرە بخاتە ژێر چەوساندنەوە و دەسەڵاتی خۆی. نێوەند ئەو کارە لە ڕێگە جیاجیاکانی وەکو؛ گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنان لە کەمەرە و دامەزراندنی فۆڕمە جیاجیاکانی پێوەندییە پاشکۆکان لە نێوان کەمەرە و نێوەند بەڕێوە ببات و بەم چەشنە، کەمەرە لە ئەگەری سەرمایەداری سەربەخۆ بێبەش ماوتەوە.

سەمیر ئەمین لە درێژەی باسەکەی خۆی تایبەتمەندییە بنەماییەکانی گەشەنەسەندوویی وڵاتە کەمەرەکانی بە چەشنی خوارەوە دیاری کرد:

١- نایەکسانی قازانجوەرگرتن لە بەرهەمهێنان لە نێوان بەشە جیاوازەکان یا بە واتایەکی تر نایەکسانیی ئاستی قازانجوەرگرتن.

٢- هەڵوەشاوە بوونی سیستەمی ئابووری نەتەوەیی یا بە واتایەکی تر هەڵوەشاوەبوونی ئابووری.

٣- زاڵبوونی هێزە بیانییەکان.

هەڵبەت ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم بابەتانە بە تەواوی تایبەتمەندییە ئابوورییەکانی نەریتی نین، بەڵکو تایبەت بە ئابووریگەلیکن کەوا لە فۆڕمێکی دیاریکراودا ڕاکێشی ئابووری نێونەتەوەیی بوون. (٥١)

بە ڕای سەمیر ئەمین، نایەکسانی ئاستی قازانجوەرگرتن لە گشت شوێنەکان تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتوەکان دێتە بەرچاو، چونکە لەوێشدا گەشە و پێشکەوتن لەگەڵ پیشەسازی نوێ هاورێن. هەڵوەشاوە بوون بە هۆی نەبوونی پێوەندیی نێوان بەشە جیاجیاکانی ئابوورییە. زاڵبوونی بیانی بەرهەمی پاشکۆبوونە کە نیشانە بۆ ئەو، بوونی تاقمێک لە ئاژانسە گەورە بیانییەکانە کە پشتبەستووو بە کۆمپانیا گەورە نێونەتەوەییەکان و نێوەندگەلێکە کە لە دەرەوەی وڵاتە گەشەنەسەندووەکانن. بۆیە پاشکۆبوونی بیانی لەگەڵ بازرگانی بیانی دروست دەبێ کە بریتی لە هەناردە کردنی ماددە سەرەکییەکان لە بەرامبەر هاوردەی کەلوپەلە دروست کراوەکانە. ئەم پاشکۆبوونە بازرگانییە زۆرجار زۆربوونی پاشکۆبوونی ماددی سەرمایە

بیانییەکانی لە پاشە، کە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی دەرچوونی قازانجەکان و گڕانەوەی سەرمایە بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان. ئەم بارودۆخە پەرەسەندنی خێرای هەناردە داوا دەکات، تا بتوانێ وڵامدەری پەرەسەندنی زۆری هاوردە بێت کە بە هۆی فرەوانبوونی شارنشینی و بەرهەمهێنانی ناتەواوی ماددە خواردەمەنییەکان پێکهاتووە، هەروەها پێویستی زیادکردنی خێرای تێچووە دەوڵەتییەکان سەبارەت بە پێداویستییە ئابوورییە نێوخۆکان دێنێتە گۆڕێ و دەبێتە هۆی دابەشکاری نایەکسانی دەرماڵەکان و مەسرەفگەرایی توێژە باڵادەستەکانی کۆمەڵگە و گەشەی ناتەواوی پیشەسازی کە دواتر وڵات بە هاوردەی کەلوپەلە سەرماییەکان پاشکۆ دەکات. ئەمین، کاریگەری ئەم بارودۆخە لەسەر ڕەوشی گەشە و گەشەنەسەندوویی بەم چەشنە کورت دەکاتەوە:

***لە حاڵێکدا لە نێوەند پەرەسەندن، هاوشانی گەشەیە - یانی بە واتایەک دەبێتە هۆی یەکگرتوویی و یەکبوون - لە کەمەرە بەم چەشنە نییە؛ چونکە بەپێچەوانە، دەبێتە هۆی دابڕانی بەشە ئابوورییەکان. بە واتایەکی ڕوونتر، پەرەسەندن لە کەمەرە، کە لەسەر بنەڕەتی تێکەڵ بوون بە بازاری جیهانییە، هۆی «گەشەی گەشەنەسەندوویی» ئەو دروست دەکات.*** (٥٢)

سەمیر ئەمین لە باسی گەشەی وڵاتە کەمەرەکان باوەڕی وایە، کە یەکێک لە یەکەمین هەنگاوەکانی ئەم گەشەیە، دامەزراندنی ئابووری نەتەوەیی یەکدەستە کە دەتوانێ لە ڕێگەی کارامەکردنی کرێکارەکان و گۆڕینی دۆخی کشتوکاڵی بۆ دۆخی پیشەسازی جێبەجێ بکرێت. جگە لەوە، تەنانەت دەتوانین لە دەرفەتی گونجاودا و بە شێوەی ژیرانە، سەنتەر یا جەمسەرە گەشەکان لەگەڵ گرووپە پیشەسازییە یەکپارچەکان کە هاندەری چالاکییە سەربەخۆیە »خودمۆختارەکانن«، دروست بکەن و لە پاشان دەبێ گۆڕانکارییەک لە بنەمای بازرگانی بیانی و دابەشکاری دەرماڵەکان و کار و باری دارایی بۆ ئاسان کاری پرۆسەی ڕۆیشتن بەرەو گەشە پێک بێت.

ئەمین ئاماژە بە گەشەی وڵاتانی ئاسیای باشووری ڕۆژهەڵات دەکات و دەڵێ نابێ وا تێبگەین کەوا »بەپیشەسازی بوونی« ئەم وڵاتانە دەبێتە هۆی پچڕانی بازنە پاشکۆکان لە پێوەندییە بیانییەکانی ئەوان. لەم بابەتەوە ئەمین دەڵێ :

***لە ڕابردوودا جەمسەربەندی لەسەر بنەڕەتی پیشەسازی بوون و پیشەسازی نەبوونی وڵاتەکان بوو، بەڵام لە داهاتوودا ئەم جەمسەربەندییە ناتوانێ بەردەوام بێت. نێوەندە نوێیەکان، ئەو وڵاتانەن کە کۆنترۆڵی سیستەمی پیشەسازی جیهانیان بە شێوەیەکی پاوەنی لە دەست دایە و تەکنۆلۆجی پێشکەوتوو، کۆنترۆڵی سەرچاوە داراییەکان، هێزی بڕیاردان لە بابەت سەرچاوە جیهانییەکان، بەڕێوەبردنی پێوەندییەکان و کۆنترۆڵی ڕوانگە سیاسییەکان و پاوەنی چەکە کۆمەڵ کوژەکانیان لە کۆنترۆڵ دایە.***[٥٣]

**خوێندنەوە نەریتییەکانی پاشکۆبوون و ڕەخنەکان:**

ڕێبازی پاشکۆبوون لە دەیەی ١٩٧٠ بەملاوە لە ڕووبەرەکانی وەکو مێتۆدۆلۆژی، چەمکی پاشکۆبوون و پلانە سیاسییەکان ڕووبەڕووی ڕەخنەگەلی زۆر بۆتەوە. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی هەرکام لەم ڕەخنانە کەوا ڕووبەڕووی ئەم ڕێبازە بۆتەوە شی بکەینەوە.

**ڕەخنە لە مێتۆدۆلۆژی ڕێبازی پاشکۆبوون:**

تیۆرییداڕێژانی ڕێبازی پاشکۆبوون لەسەر ئەم باوەڕە بوون کەوا خوێندنەوەکانی پێشوو لەبابەت گەشەسەندن لە لایەن ڕوانگەی نوێسازی، ڕوونکردنەوەیەکی ئایدیۆلۆژیکی بۆ چەوساندنەوەی جیهانی سێیەم یا کەمەرە لە لایەن وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، دروست دەکەن. تیۆرییداڕێژانی ڕوانگەی نوێسازی لە بەرانبەر ئەم بۆچوونە و لە تۆڵەی ئەو هێرشە هزرییە لە وڵامی ڕەخنەی پێشوودا، ڕوانگەی پاشکۆبوون وەکو، بەشی پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆژییەکانی شۆڕشی مارکسیزم پێناسە دەکەن. بە ڕای ئەوان

خوێندنەوەکانی پێشوو لە لایەن ڕێبازی پاشکۆبوون زۆرجار وەکو ڕاهێنانی نامیلکە و ووتار نووسین وایە تاکوو کارێکی زانستی و ئاکادێمیک. ئەوان هەروەها لەسەر ئەم باوەڕەن کە ڕێبازی پاشکۆبوون بە دابەزین تا ئاستی زۆرویێژی و دروشمدان، پێگە و متمانەی زانستی خۆیان لە دەست داوە.

جگە لەوە واتایی بوونی ڕوانگەی پاشکۆبوون تۆمەتێکی دیکەیە کە خراوەتە پاڵ ئەم ڕێبازە. دەگوترێ کە ڕێبازی پاشکۆبوون لە هەوڵ بۆ پلان داڕێژی یەک نموونەی گشتی لە سەرجەم وڵاتانی جیهانی سێیەم یان کەمەرەکان، تووشی ئەم هەڵە بنەڕەتییە بووە کە هەموو ناوچە کەمەرەکان وەکو یەک، هاوشێوە و لە یەک فۆڕمدا گریمانە دەکات. تیۆرییداڕێژانی ئەم ڕوانگەیە بە کەڵک وەرگرتن لە یەک ستراتیجی قیاسی لە خوێندنەوە بابەتی و نەتەوەییەکاندا، ئەوان لەگەڵ ئەو شتەی کە بە شێوەی لۆژیکی بەپێی شێوازی پاشکۆبوون چاوەڕوان دەکرێ، بەراورد دەکەن. بۆیە بە دەگمەن دەتوانین لە خوێندنەوەکانی ڕوانگەی پاشکۆبووندا هەوڵی شیلگیرانە و بنەڕەتی بۆ پشکنین لە بابەت گەشەی وڵاتە تایبەتەکانی جیهان سێیەم یا کەمەرەکان لە قۆناغ یا خولێکی دیاریکراوی مێژووییدا بدۆزینەوە.

## ڕەخنە لەبابەت چەمکی پاشکۆبوون:

لە ڕوانگەی ئەم ڕێبازە پاشکۆبوون بە هۆی کۆمەڵە ڕەوشێکی بیانی کە بەسەر وڵاتانی جیهانی سێیەم دادەسەپێ، سەری هەڵداوە. لەم ڕووەوە ڕەخنەگرانی مارکسیست ڕەخنە لە ڕوانگەی پاشکۆبوونی کلاسیک یا نەریتی دەگرن کە بە جەختی زۆر لەسەر هۆکارە بیانییەکان، ڕۆڵی وزە بزوێنەرە نێوخۆکانی وەکو؛شەڕە چینایەتییەکان و دەوڵەت لەبەرچاو ناگرن. بۆ وێنە «پێتراس» لەم کەسانەیە کە زۆر لەو بابەتەوە ناڕازییە، چونکە باوەڕی وایە کە »شیکردنەوەی کێشەکانی جیهانی سێیەم لەسەر حیسابی چەمکی پاشکۆبوون. . . . بە مانای لەنێوچوونی وردبینی و قووڵ ڕوانین سەبارەت بە دەست نیشانکەرترین پرۆسەکانی دروست بوونی چین و پێوەندییە

کۆمەڵایەتییەکانە کەوا دەبێتە گۆڕانی کۆمەڵگەکان». لە سەر ئەم بنەڕەتە ڕەخنەگرانی مارکسیست لێکدانەوە لە بابەت جێگۆرکێی زێدە لە کەمەرە بە گرینگتر دەزانن و پێشنیار دەکەن کە لێکۆڵەرانی پاشکۆبوون ڕۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکان، دەوڵەت و ململانێ سیاسییەکانیش لە شیکردنەوەکانی خۆیان لەبەرچاو بگرن تاکوو بتوانن وڵامی پرسە بنەڕەتییەکان لە بابەت چەندی و چۆنی ڕادەی جێگۆڕکێی زێدە بدەنەوە.

تۆمەتێکی تر کە خراوەتە پاڵ ڕوانگەی پاشکۆبوون ئەوەیە کە بە هۆی ئەو چاوپۆشینە کەوا لە هێزە بزوێنەرە نێوخۆکان و ململانە سیاسییەکان کراوە، ئەو ڕاونگەیە تەنیا وێنەیەکی ناڕوون لە کەمەرە دەست و پێ بەسراوەکان نیشان دەدات کە »ڕادەی ئازادی» ئەوان زۆر کەمە. بە واتایەکی تر گشت وزە بزوێنەرەکانی سیستەم لە نێوەند سەرچاوە دەگرن و کەمەرە، سا لە ئەورووپای سەردەمی سەرەتایی و سا لە وڵاتانی جیهان سێیەم، ئەمڕۆ قوربانی دەست و پێ بەسراوی سەرمایەداری بیانین. ڕەخنەگرانی ڕوانگەی پاشکۆبوون هەروەها دەڵێن جگە لەوەیکە دەسەڵاتدارێتی نێوەند تا چ ڕادەیەک بەهێز بێت، ئەم هێژێمۆنی و زاڵبوونە، دەرفەتگەلێکی بۆ جێگۆڕکێی باوەڕەکان، دەزگاکان و تەکنیکەکان پێکهێناوە کە وڵاتە کەمەرەکان دەتوانن لەوان بۆ گۆڕانکاری خۆیان کەڵک وەرگرن.

## ڕەخنە لە ستراتێجییە سیاسییەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون:

ڕێبازی پاشکۆبوون سەرنجی تایبەت بە کاریگەرییە وێرانکەرەکانی کۆلۆنیالیزم و دابەشکاری کاری نایەکسانی نێونەتەوەیی دەدات. ئەم ڕێبازە باوەڕی وایە کە تا ئەو کاتەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕی نایەکسانی ئێستا بەردەوام بێت، دیاردەکانی وەکو، چاولێکەری لە دەرەوە، پەرەسەندنی شێرپەنجەیی، پاشکۆبوونی تەکنیکی، گەشەنەسەندوویی و بابەتی تر لە وڵاتانی جیهان سێیەم یان کەمەرەکان دەبینین. کەوایە زۆر لە تیۆرییدارێژەکانی ڕوانگەی پاشکۆبوون، ستراتێجی بنەڕەتی شۆڕشی سۆسیالیستی بە مەبەستی بن

بڕکردنی بارودۆخی پاشکۆبوون – کە لە دەرەوە دادەسەپێ – پێشنیار دەکەن. وێڕای ئەوەش، تاقمێک لە ڕەخنەگرانی ڕێبازی پاشکۆبوون لە سەر ئەم باوەڕەن کە پاشکۆبوون بە ناچار گەشەنەسەندوویی دروست ناکات و یا بە واتایەکی تر پاشکۆبوون و گەشە دەتوانن لەگەڵ یەکتر هاوژینییان بێت. بۆ وێنە دوو وڵاتی کۆریای باشوور و تایوان کە سەردەمێک کۆلۆنی ژاپۆن بوون، لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانی بەولاوە گەشەی ئابووری خێرایان بە دەست هێناوە.

ڕوانگەی پاشکۆبوون چۆن وڵامی ڕەخنە باسکراوەکانی سەرەوە دەداتەوە؟

بە پێشکەشکردنی پلانی «خوێندنەوە پاشکۆبوونە نوێیەکان» لە بۆچوونەکانی تیۆرییداڕێژانێکی وەکو « هێنریکۆ فێرناندۆ کاردۆزۆ »، « گیلر مۆ ئۆدانێل » و « پیتەر ئیوانس» دەبینین کە چۆن ئەم ڕوانگە نوێیە بە کەڵک وەرگرتن لە مێتۆدی مێژوویی – بنەمایی، هەوڵی شیکردنەوەی ڕۆڵی ململانە سیاسییەکان نێوخۆ لە گەیشتن بە ڕادەیەکی دیاریکراو لە گەشەی وڵاتانی جیهان سێیەم دەدات.

## بنەما سەرەکییەکان، چەمکەکان و ڕوانگە تیۆرییەکانی تیۆرییە پاشکۆبوونە نوێیەکان

### فێرناندۆ هێنریکۆ کاردۆزۆ و تیۆرییداڕشتن لە بابەت پاشکۆبوونی نوێ

«کاردۆزۆ» وەکو یەکێک لە بەناوبانگترین تیۆرییداڕێژانی ڕووبەری پاشکۆبوونی نوێ دەناسرێت. شوێنەوار و چالاکییە زانستییەکانی ئەو ڕێنوێنییەکی لێکۆڵەرانە – شیکەرانەی بۆ لێکۆڵەرە لاوەکان پێک هێناوە. لەم بەشەدا سەرەتا خەریکی شیکردنەوەی تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی خوێندنەوەکانی کاردۆزۆ لە مەڕ پاشکۆبوون دەبین:

یەکەم ئەوەی کە، بە پێچەوانەی شیکردنەوە گشتی و هەمەکییەکانی ڕێبازی نەریتی پاشکۆبوون یا پاشکۆبوونی کلاسیک، کاردۆزۆ شێوازی «مێژوویی – بنەمایی» لە خوێندنەوەکانی خۆی بە کار دێنێ. ئامانجی ئەو

ئەمەیە کە مێژووی ڕابردوو لە خوێندنەوە پاشکۆکان بخاتە بەر چاو. بۆیە بەجێی ئەوەی کە وشەی «پاشکۆبوون» وەکو تیۆرییەک بۆ بەگشتی کردنی نموونەی گشتی گەشەنەسەندوویی بە کار بێنێ، وەکو شێوەیەک بۆ شیکردنەوەی بارودۆخە دیاریکراوەکانی گەشە لە جیهانی سێیەم یا کەمەرە نیشانی دەدات. بۆیە پرسیارە سەرەکییەکانی پشکنینەکانی ئەو بەم چەشنەیە:
١- چۆن دەتوانین تایبەتمەندییە بێ هاوتاکانی یەک دۆخی پاشکۆبوون لە بەستێنی مێژوویی خۆیدا دیاری بکەین؟ ٢- یەک دۆخی تایبەتی پاشکۆبوون چ جیاوازیگەلێکی لەگەڵ بارودۆخی پێش خۆی هەیە؟ ٣- بەستێنی مێژوویی یەک دۆخی پاشکۆبوون چیە و لە چ کاتێک و چۆن ئەم بارودۆخە دەگۆڕدرێ؟ ٤ – چۆن بنەما هەبووە پاشکۆکان، خۆیان کەرەسەکانی گۆڕانکاری پێکدێنن؟ ٥ – گۆڕان لە چەشنی پاشکۆبون چ کاریگەرییەک لەسەر گەشەی مێژوویی یەک وڵاتی جیهان سێیەم یا کەمەرە دادەنێت؟

دووەم ئەوەی کە، کاردۆزۆ بە پێچەوانەی پشکێنەرەکانی پاشکۆبوونی کلاسیک کە تەنیا سەرنجی خۆیان لەسەر بارودۆخی بیانی پاشکۆبوون دادەنا، زۆرتر لەسەر بنەما نێوخۆیەکانی پاشکۆبوون جەخت دەکات؛

سێیەم ئەوەی کە، کاردۆزۆ بە جێی ئەوەی کە سەرنج بداتە سەر ژێرخانی ئابووری پاشکۆبوون بایەخ بە شیکردنەوەی لایەنە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی پاشکۆبوون و بە تایبەت بە شەڕە چینایەتییەکان، مشت و مڕی گرووپەکان و بزووتنەوە سیاسییەکان دەدات.

هەڵبەت لەگەڵ ئەوەی کە کاردۆزۆ ڕۆڵی مشت و مڕ و شەڕە سیاسییە نێوخۆکان لە ڕەوشی پاشکۆبوون دەخاتە بەر لێکۆڵینەوەی دووبارە، بەڵام ئاشکرایە کە پێوەندیی نێوان وزە بیانی و نێوخۆیەکان وەکو هەمەکییەکی تێکچنراو چاو لێدەکات کە بازنە دروست کراوەکانی ئەو. . . . گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینە دەسەڵاتدارە نێوخۆیی و نێونەتەوەییەکانن و لە لایەکی ترەوە چین و گرووپە ژێرچەپۆکە نێوخۆیەکان دەخاتە ژێر هەڕەشە و گوشارەوە.

چوارەم ئەوەی کە، کاردۆزۆ پاشکۆبوون وەکو، پرۆسەیەکی سەرئاواڵە و نادیار دادەنێ و ئەوە بە پێچەوانەی بۆچوونی تیۆرییدارێژانی ڕێبازی نەریتی پاشکۆبوونە کە باوەڕیان بە دیار و ئاشکرابوونی بنەماکانی پاشکۆبوونە.

پێنجەم ئەوەی کە، بە پێچەاونەی ڕوانگەی ڕێبازی نەریتی پاشکۆبوون کە پرۆسەی گەشەنەسەندوویی وڵاتانی جیهان سێیەم یان کەمەرەکان یەک لایەنە دەڕوانێ، کاردۆزۆ باوەری وایە کە ئەو ئەگەرە هەیە کە گەشەی پاشکۆ، یانی هەم گەشە و هەم پاشکۆبوون هەر دوو لە لای یەکتر هەبێت و پاشکۆبوون فۆرمگەلی کاراتری سەبارەت بە ئابووری دوورگەیی یا ڕەوشەکانی هاوشێوەی کۆلۆنی (شبه استعماری) هەیە.

بەگشتی، زۆر لە گریمانە سەرەکییەکانی خوێندنەوە نەریتییەکانی (کلاسیک) پاشکۆبوون – وەکو پاشکۆبوونی ئابووری جەخت لەسەر ڕۆڵی هۆکارە بیانییەکان و گەسەنەسەندوویی بنەمایی – لە نووسینەکانی کاردۆزۆ کەم کرانەوە. ئەم گۆڕانکارییانە کە بە ڕوونی لە خشتەی ژمارە دوو نیشان دراوە، بەستێن و ڕووبەریکی نوێی لە لێکدانەوەکانی پاشکۆبوون بەرەوڕووی لێکۆڵەران کردۆتەوە.

**خشتەی ٢- بەراوردکردنی خوێندنەوە نەریتییە پاشکۆبوونەکان و خوێندنەوە پاشکۆبوونە نوێیەکان**

| | خوێندنەوە نەریتییە پاشکۆبوونەکان | خوێندنەوە پاشکۆبوونە نوێیەکان |
|---|---|---|
| **لە یەک چووەکان** | | |
| نێوەندی چەقبەستوی پشکنینەکان | گەشەی جیهانی سێیەم | هەمان |
| ئاستی شیکردنەوە | ئاستی نەتەوەیی | هەمان |
| چەمک و وشە سەرەکییەکان | پاشکۆبوون، نێوەند، کەمەرە | هەمان |
| پێویستی و داواکارییە سیاسەتگۆزارییەکان | پاشکۆبوون وەکو هۆکاری زیاناوی لە ڕێگەی گەشەدا | هەمان |
| **جیاوازییەکان** | | |
| مێتۆدی پشکنین | پلەی بەرزی مانایی؛ جەخت لەسەر شێوازی گشتی لە پاشکۆبوون | بنەمایی – مێژوویی؛ جەخت لەسەر ڕەوشی تایبەتی پاشکۆبوون |
| دانەرە سەرەکییەکان | جەخت لەسەر دانەرە دەرەکییەکان: ئاڵوگۆڕی نایەکسان لە ئاستی نێونەتەوەیی، | جەخت لەسەر دانەرە نێوخۆیەکان: شەڕی چینایەتی، دەوڵەت |

| | | |
|---|---|---|
| | کۆلۆنیالیزم | |
| شوناسی پاشکۆبوون | زۆرجار دیاردەیەکی ئابووری | زۆرجار دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی |
| پاشکۆبوون و گەشە | جیاوازی بەرامبەر : ڕێگەی یەک لایەنە بەرەو گەشەنەسەندوویی | توانایی هاوژینی: گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون |

**کاردۆزۆ و شێوازی گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون یا گەشەی پاشکۆ:**

کاردۆزۆ بە ئەنقەست لە دەربڕینی گەشەی پاشکۆ یا گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون کەڵک وەردەگرێ، چونکە دوو چەمکی جیا لە یەک و ناکۆک لەخۆ دەگرێ. تیۆرییە نوێسازییەکان تەنیا ئاماژە بە گەشە و نوێسازی دەکەن و تیۆرییە نەریتییە پاشکۆ و ئیمپریالیزمەکان هەروەها جەخت لەسەر پێوەندیی چەوسانەوە و بەهرەکێشی نێوان وڵاتی دایک و وڵاتی پاشکۆ دەکەن. بەڵام بانگەشەی کاردۆزۆ ئەوەیە کەوا، لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان، هاتنی سەرمایەی پیشەسازی بۆ وڵاتە کەمەرەکان و دروست بوونی دابەشکاری کاری نوێی نێونەتەوەیی، قۆناغێکی نوێ سەری هەڵداوە. بەپێی بەڵگە هێنانەوەی کاردۆزۆ لەم دۆخەدا بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیا بیانییەکان تا ڕادەیەک پێشکەوتنی نێوخۆیی وڵاتە پاشکۆکانی لە دوایە و بەو مانایە ئەوان خۆیان یارمەتی بە پێشخستنی گەشەی وڵاتە کەمەرەکان دەکەن. بە واتایەکی تر چونکە ئامانجی کۆمپانیا بیانییەکان بەرهەمهێنانی کەلوپەلە مەسرەفییەکان و فرۆشی ئەو لە بازاڕە نێوخۆیەکانە، بەرژەوەندی ئەوان لە پێناو گەشەی ئابووری (لانیکەم لە بەشە سەرەکییەکان) وڵاتە کەمەرەکان دایە. بەم چەشنە گەشە لە کەمەرە، لەخۆگری پێوەندیی و پاشکۆبوونی ئاشکرا لەگەڵ پێوەندییە تەکنیکی،

دارایی، بازاڕ و ڕێکخراوەکانە کە تەنیا کۆمپانیا فرەنەتەوەکان توانا بە دابین کردنی ئەون.

جگـە لـە بابەتـەکانی سـەرەوە، «کـاردۆزۆ» ئامـاژە بـە سـنووربەندییە ڕاستەقینەکانی ئەم چەشنە لە گەشەی پاشکۆ دەکات، چونکە گەشـەی پاشکۆ بـە هـۆی نـەبوونی «تـەکنۆلۆجی سـەربەخۆی نەتـەوەیی» بـە ناتـەواوی و کەموکوڕی ماوەتـەوە. بۆیـە ئـەم شـێوازە لـە گەشـە، ناچـار بـە هـاوردەکردنی تەکنۆلۆجییـە و دەبێ گشـت ئەنجامـەکانی تـەکنۆلۆجی سـەمایەبەر وەرگـرێ. هەروەها لاوازی سەرمایە نەتەوەیی و خۆولاتییەکان پێویستی ولاتی پاشکۆ بـە سـەرمایە ماڵییـە نێونەتەوەیـەکان زۆر دەکـات. لەبـەر ئـەوە ولاتـەکان لـە چوارچێوەی گەشـەی پاشکۆ ناچارن خۆیـان لـە سـەرمایەداری نێونەتـەوەیی بتوێننەوە.

کەوایـە کـاردۆزۆ لـە لایـەنی پەسـەندکردنی تێچـوو و سـنووربەندییە بنەمایـەکانی گەشـەی پاشـکۆ، وەکـو پێشـوو لـەنێو سـنوورەکانی ڕێبـازی پاشکۆبوون دایە. لە ڕاستیدا ئامانجی ئەو پشکنینی پاشکۆبوون و گەشـە یـا هەروەها زاڵبوونی بیانی و وزە سیاسییەکانی نێوخۆ لە لای یەکتر دایە، تـا بەم شێوەیە نیشان بدات کە چۆن هەڵسوکەوتی دیاریکراو لـە نێوان ئـەم وزە و ئەکتەرانـە لـە قۆناغگـەلی دیـاریکراوی مێژوویـی، هـۆی دروسـت بـوونی گەشەیەکی کارامە لەنێو سنوورە بنەماییەکانی پاشکۆبوون ساز دەکات. بۆیـە پێویستە بزانین کە ئەم وزە جۆراوجۆرە سیاسییانە لـە شـێوازی کاردۆزۆدا کامانەن؟

لـە شـێوازی گەشـەی هاوکـات لەگـەڵ پاشـکۆبوون یـا گەشـەی پاشـکۆی کاردۆزۆ سێ چەشنە ئەکتەری سیاسی بوونی هەیە کە بریتین لـە : دەوڵـەتی ئۆتۆریتـەی (میلیتـاری) بیرۆکراتیـک، کۆمپانیـا فرەنەتـەوەکان و بـۆرژوازی خۆولاتی؛ بە باوەڕی ئەو ئەم گرووپە لە بەرازیل لە ساڵی ١٩٦٤ بۆ گەیشتن بە گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون لەگـەڵ یـەکتر هاوپـەیمانی سیاسییان دروست کردووە.

**کاردۆزۆ و شێوازی گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون یا گەشەی پاشکۆ لە بەرازیل:**

لە ساڵە ١٩٦٤ لە پاش ڕووخانی ڕژیمی پۆپۆلیستی لە بەرازیل، ڕژیمێکی میلیتاری (سەربازی)بە جێی ئەو هاتە سەر کار. هەر لەو ساڵە ئاڵۆز و پڕتەنگەژەدا، زۆرترین باس و خوێندنەوەکان لە وێژەی گەشەدا بە دەوری شوناسی ئەم ڕژیمە نوێ میلیتاریە کۆ بووەتەوە.

تیۆرییدارێژانی ڕێبازی پاشکۆبوونی نەریتی یا کلاسیک وەکو، «فۆڕتادۆ» ئەم ڕژیمەیان بە دەوڵەتێکی میلیتاری دەزانی کە ئامانجی سەرەکی خۆی دابین کردنی سەقامگیری و ئاسایشی کۆمەڵایەتی دەزانیێ. بە ڕای فۆڕتادۆ مۆدێلی ئابووری کە لەگەڵ ئەم ڕەوشە سیاسییە دەمانتوانی بەراوردی بکەین بریتی بوو لە کەم بوونەوەی سەرمایەگوزارییە پیشەسازییە شارییەکان بە قازانجی بەرهەمهێنانە کشتوکاڵییەکانی ئۆلیگارشییە خاوەن زەوییەکان. کەوایە لە ڕوانگەی پاشکۆبوونی نەریتی یا کلاسیک، دەوڵەتی نوێ میلیتاری لە بەرازیل، جگە لە بەرژەوەندی سەندیکایی میلیتارەکان (سەربازەکان)، تەنیا ئامێری دەستی ئۆلیگارشییە خاوەن زەوییەکان بوو.

«کاردۆزۆ» شیکردنەوەی «فۆرتادو»ی لە بابەت ڕژیمی نوێی میلیتاری بەرازیل، پەسەند نەکرد. ئەو ئەم پرسیارە پێشکەش دەکات کە ئەم شیکردنەوە عەینی و ڕاستەوخۆیە چەندە لە ڕاستییە هەبووەکان نێزیکە و چەندە دەتوانێ وەکو، شێوازێکی سەلیقەیی و دەستووری و لە ڕووی حەز و ئارەزو بێت؟ بە ڕای کاردۆزۆ شیکردنەوە و خوێندنەوەکانی پێشو لەمەڕ ڕژیمی میلیتاری بەرازیل، چالاکییە نوێ ئەنجام دراوەکان لە لایەن ئەو ڕژیمە ناخاتە بەرچاو و بۆیە توانا بە دیاری کردنی ئەم بابەتە نەبوو کە ڕژیمی باسکراو شێوازێکی نوێ لە «گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون یا گەشەی پاشکۆ» لە بەرازیل پەیڕەو دەکات. کاردۆزۆ بە بەراوردکردنی

شێوازی نوێی گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون کارە نوێیەکانی خوارەوە دەخاتە پاڵ ڕژیمی میلیتاری بەرازیل.

١ - سەرمایەداری نێونەتەوەیی حەزێکی زۆری لە سەمایەگوزاری ڕاستەوخۆ لە بەشی پیشەسازی ئەمریکای لاتین لەوانە بەرازیل، لە بوارەکانی وەکو؛ دانانی کارخانە و یەکە بەرهەمهێنەکان هەیە؛ بۆ وێنە قەبارەی ئەم سەرمایەگوزارییانە لە بەرازیل تا ڕادەیەک زۆر بوو کەوا بەشی دەوڵەتی و خاوەنکارە نەتەوەییەکان ڕۆڵی زاڵی خۆیان لە بەشی پیشەسازی لە دەست دا. لە ساڵی ١٩٦٧، کۆمپانیاکانی فۆلێکس واگۆن، ژیلێت، فۆرد، نەستەلە، کۆکاکۆلا و شێل گەورەترین کۆمپانیا پڕوپاگەندەکانی بەرازیل بوون و بەم چەشنە کاریگەری زۆریان لەسەر ئامێرە ڕاگەیاندنە گشتییەکانی وەکو ڕۆژنامە، گۆڤار و تەلەفزیۆنەکان هەبوو.

٢ - لەگەڵ سەرهەڵدانی پڕۆسەی ئابووریی نوێ، بەشی دژە پۆپۆلیستی سوپا و تەکنۆکراسی کە لە کاتی دەسەڵاتداریێتی دەوڵەتی دیمۆکڕات هێز و توانای کاریگەریان نەبوو، بە جارێک هێز و کاریگەری بەرچاویان هەم لە لایەنی سەرکوتی سیاسی و هەم لە ڕۆڵی نوێسازی ئابووری و سیستەمی ئیداری بە دەست هێنا.

٣ - لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییانەدا، بەشی سەر بە جەماوەر هێزی خۆی لە دەست دا. کاردۆزۆ دیتی کەوا ڕێبەرانی سەندیکا کرێکارەکان کە لە سەردەمی پێشوودا لە نێوان وزەی کار و دەوڵەت ناوبژیوانیان دەکرد، لە کاتی دەسەڵاتداریێتی میلیتارەکان، بە هۆی سەرکوتی سیاسی بە یەکجاری لە ساحەی سیاسی سڕایەوە.

٤ - هەروەها ئەو بەشانەی کە لە ڕابردوودا ڕۆڵی زاڵیان هەبوو، هێزی خۆیان بە شێوەی ڕێژەیی لە دەست دا. نە تەنیا بەشی کشتوکاڵی نەریتی، بەڵکو تەنانەت ڕووبەرەکانی بەرژەوەندییە بازرگانی و پیشەسازییەکان کە لەگەڵ پڕۆسەی ئابووری نوێ خۆیان ڕێک نەخستووە، لە لایەنی سیاسی خۆیان لەم ڕژیمە نوێیەدا لاواز دیتەوە.

٥ – بورژوازی بەرازیل هەروەها لەگەڵ ئەرک پێدان بە میلیتارەکان (سەربازەکان) بۆ لەنێوبردنی هێز و کاریگەری کرێکارەکان، بە شێوەی نائاگایانە لە چالاکی گەلێک پشتیوانیان کرد کە ئەگەری دەربڕینی بوونی سیاسی خۆشیان (لە ڕێگەی هەڵبژاردن، حزبەکان، ئازادی ڕادەربڕین و هتد ) لەنێو دەبا.

لەم ڕووەوە کاردۆزۆ لە شیکردنەوەی چالاکییە نوێیەکانی ڕژیمی میلیتاری، سەبارەت بە تووش بوون بە شێوازی ڕێبازی نەریتی پاشکۆبوون ئاگاداریان دەکاتەوە کە بەم پێیە، زاڵبوونی بیانی هیچ دەرفەتێکی بۆ گەشەی نەتەوەیی نەهێشتۆتەوە. بە پێچەوانە بە ڕای ئەو، لێکۆڵەران دەبێ لەمەڕ تایبەتمەندییە تایبەتییەکانی ئەم چالاکییانە ورد ببنەوە و شێوازێکی نوێ پێشکەش بکەن کە هاندەر و بزوێنەرەکانی ئەو لەخۆ بگرێ. ئەو لەم بابەتەوە سەرقاڵی پێشکەشکردنی شێوازی گەشەی هاوکات لەگەڵ پاشکۆبوون یا گەشەی پاشکۆ دەبێ.

هەوڵدانی زانستی کاردۆزۆ، ڕێگەی خوێندنەوە ئەزموونییەکانی لە ڕێبازی پاشکۆبوون دیاری کرد و پشکنین و لێکۆڵینەوەگەلێکی لە بابەت دەوڵەتی ئۆتۆریتەی بیرۆکراتیک، هاوپەیمانی سێ قۆڵی نێوان دەوڵەت، کۆمپانیا فرەنەتەوەکان و بورژوازی خۆولاتی و هەروەها گەشەی پاشکۆ لە جیهانی سێیەم هەڵگیرساند. کاریگەری لێکۆڵینەوەکانی ئەو دەتوانین لە خوێندنەوە پاشکۆبوونە نوێیەکان کە لە باسی دووایی هاتووە، بە باشی چاو لێبکەین.

## گیلێرمۆ ئۆدانێل و تیۆریی دەوڵەتی ئۆتۆریتەی بیرۆکراتیک:

گیلێرمۆ ئۆدانێل لە سەرەتای باسی زانستی و تیۆرییدارشتنی خۆی وەبیرمان دێنێتەوە کە چەمکی پاشکۆبوون تا ڕادەیەک کامڵ و تەواوە کە پرسیار لەمەڕ چۆنێتی پێوەندیی ئەو لەگەڵ هۆکارگەلێک کە دینامیسمی ئەوان جگە لە دەنگدانەوەیەک لە پاشکۆبوون نییە، پرسیارێکی بێ مانایە.

«ئۆدانیل» کە تیۆریی نەریتی پاشکۆبوون بۆ خۆی پەسەند ناکات، لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لێکۆڵەران دەبێ بۆ شیکردنەوەی پێوەندیی بەرامبەر نێوان سەرمایەداری و شێوازی زاڵبوونی سیاسی ئەو بە درێژایی کات، لە ستراتیجی مێژوویی – بنەمایی کاردۆزۆ کەڵک وەرگرن. ئۆدانیل بە پێشکەشکردنی تایبەتمەندییەکان، سەرهەڵدان، تەشەنەکردن و داڕمانی جۆرێکی تایبەت لە زاڵبوونی سیاسی، کە بە دەوڵەتی ئۆتۆریتەی بیرۆکراتیک ناوی دەبا، وێژەی پاشکۆبوون زیاتر دەوڵەمەند دەکات.

گیلرمۆ ئۆدانێل باسی خۆی لەمەڕ تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتەکانی جیهان سێیەم بە پێی ئەزموونی ئەو دەستە لە وڵاتانی جیهان سێیەم کە بە توونـدی تووشـی کێشـەکانی سـەرهەڵداو لـە گەشـەی ئـابووری بـوون، دەردەبڕێ. بەتایبەت سەرنجی ئەو لەسەر ئەزموونی وڵاتانی ئەمریکای لاتین بوو.

بە ڕای ئۆدانێل بە درێژایی دەیەی ١٩٦٠ لە هەندێک وڵاتی ئەمریکای لاتین وەکو بەرازیل، ئارژانتین، شیلی و ئۆرۆگوە شێوەیەکی تایبەت لە دەوڵەت دروست بوو کە ئۆدانێل ئەوی دەوڵەتی ئۆتۆریتەی بیرۆکراتیک ناو نا. ئۆدانێل تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەو چەشنە دەوڵەتانەی بە گوێرەی خوارەوە شرۆڤە کرد:

**١- دەسەڵاتدارێتی بیرۆکراتەکان:**

لەم چەشنە دەوڵەتانە کەسانێک کە پلەوپایە سیاسییەکان و جێگە بەرزەکانی دەوڵەت دەگرنەوە، زۆرجار ئەزموون و کارامەبوونی سەرکەوتووانە لە ئاستە بەرزەکانی ڕێکخراوە بیرۆکراتیکەکان وەکو هێزە چەکدارەکان، دایرە دەوڵەتییەکان و کۆمپانیا گەورە تایبەتەکانیان پێشتر بووە.

**٢- پاوەنی سیاسی:**

ئەم چەشنە دەوڵەتانە سا لە ڕێگەی سەرکوت و سا لە ڕێگەی بەکارهێنانی کۆنترۆڵ لەسەر ئەنجوومەنە پیشەییەکان و سەندیکا کرێکارەکان، ڕێگەکانی گەیشتن بە حکوومەت و بنەمای دەسەلات دەبەستن.

### ٣- پاوەنی ئابووری:

ئەم چەشنە دەوڵەتانە لە پانتایی ئابووریش هەوڵ دەدەن تا داواکارییە بێ سنوورەکانی بەشی گشتی کەم بکەنەوە یا بە داهاتوویەکی دوورتری بسپێرن.

### ٤- سیاسەت سڕینەوە:

ئەم چەشنە دەوڵەتانە هەوڵ دەدەن کێشە کۆمەڵایەتییەکان تا پلەی کێشە تەکنیکییەکان کەم کەنەوە و لەسەر ئەم بنەڕەتە پلان داڕشتن بۆ چارەسەری ئەو کێشانە دەخەنە دەست بیرۆکراتە دەوڵەتییەکان و بە گشتی لە بەشداری گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی دەوڵەت و بەتایبەت کۆمەڵانی خەڵک لە سیاسەت بەرگری دەکەن.

### ٥- قووڵبوونەوەی سەرمایەداری پاشکۆ:

دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتیکەکان دەبێ سەرمایەداری پاشکۆ لە کۆمەڵگە ژێردەستەکانی خۆیان بڵاو و پتەو کەنەوە و لە ڕاستیدا سەرهەڵدانی ئەوان پێویستی بەم بڵاوکردن و پتەوکردنە هەیە.

## سەرهەڵدانی دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتیکەکان لە جیهانی سێیەم : بەستێن و هۆکارەکان:

بەپێی وتەی ئۆدانێل لە ساڵەکانی پاش شەڕی دووەمی جیهانی دەوڵەتە ئاماژە پێکراوەکان، دژکردەوەیەک بوون لە بەرامبەر قەیرانە ئابووری و سیاسییەکانی سەرمایەداری پاشکۆ لە ئەمریکای لاتین. لە درێژەی دەیەکانی ١٩٥٠ زۆر لە دەوڵەتانی ئەمریکای لاتین سیاسەتی چوونە جێگەی هاوردەیان گرتە بەر. بەپێی ئەو سیاسەتە، بەڵێن وا بوو کە بە جێی هاوردەکردنی کەلوپەلە مەسرەفییەکان لە دەرەوە، ئەوان لە نێوخۆ بەرهەم بێنن. ئەو سیاسەتە لە سەرەتادا، فرەوانبوونی سەرمایەداری خۆماڵی و فرەوانبوونی ئاسۆیی چالاکییە پیشەسازییەکانی لەو کۆمەڵگەیانە دروست کرد؛ بەڵام زۆرخایەن نەبوو و زۆر زوو کێشەگەلی وەکو، داشکانی باڵانسی

دانـــەوەی قـــەرزەکان، ئاوســـاوی، قووڵبوونـــەوەی کەلێنـــە ســـامانەکان، هاتنـــــەخوارێی بەرهـــــەمهێنانی ناڕاســـــتەوخۆی نەتـــــەوەیی و نرخـــــە سەرمایەگوزارییەکان و هـەڵاتنی سـەرمایە سـەری هەڵدا. ئـەو کێشـانە لەگـەڵ زۆربــوونی گوشــارە سیاســییەکان لــە لایــەن چینــە لاوازەکــان و بەشــە جەماوەرییەکان هاوکات بوو. هـەروەها ئـەو گوشـارە سیاسییانە بە شـێوەی داخوازیگەلێکی وەکو؛ زۆربوونی مووچەکان، شەڕ دژی ئاوساوی، پێشکەش کردنـی زیـاتری خزمـەتگوزاری دەوڵـەتی و کـۆنترۆڵ لەسـەر کۆمپانیـا فـرە نەتـەوەیی و بیانییـەکان سـەریان هەڵـدەدا. قووڵبوونـەوەی ئـەم گوشـارانە جەمسەربەندی کۆمەڵگە و قووڵبوونەوەی کێشە سیاسییەکانی (چینایـەتی) لـە پاش بوو. وەها بارودۆخێک ڕەوش و بەرژەوەندییەکانی چینە باڵادەستەکان و سەرمایەی بیانی خستبۆ مەترسیەوە، بۆیە یەکگرتوویی زیاتری لەنێو چینە باڵادەستەکان دروست کرد. ئەو چینانـە بە کەڵک وەرگـرتن لـە بیرۆکراسـی، سوپا و گرووپە توندڕەوەکان لە هەوڵی هێورکردنەوە یا سەرکوتی گرووپ و چینـە مامنێوەنـدی و خوارەوەکانـدا بـوون. لەسـەر ئـەو بنەڕەتـە دەتـوانرێ بانگەشە بکرێ کە دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتەکان لـە بەسـتێنی وەهـا قـەیران و گۆڕانکارییــەک ســەریان هەڵــداوە. لــە ڕاســتیدا ئــەو دەوڵەتانــە بەرهــەمی هاوپـــەیمانی ســـەرمایەی بیـــانی، بـــورژوازی نەتـــەوەیـــی، میلیتارەکـــان و بیرۆکراتــەکان بــەدژ قەیرانــە ئابوورییــەکان و بــەدژ بزووتنــەوەکانی چینــە مامنێوەندی و خوارەوەکانی کۆمەڵگە بوون.

## هەڵوێســت وەرگرتنــی دەوڵەتــە ئۆتۆریتــە بیرۆکراتیکــەکان و چــۆنێتی پرۆسەی پتەوبوونی ئەو دەوڵەتانە:

بـە ڕای ئۆدانێل پێشـەنگە میلیتـارە بیرۆکراتیکـەکان بـە هـۆی ئـەوەی کـە فرەوانبـــوونی کەلوپەلـــە پیشەســـازییە مەســـرەفییەکان لـــە کۆمەڵگـــەی ژێـــر دەسەڵاتداری ئەوان بە ئەو پـەڕی خـۆی گەیشـتووە، لـە هـەوڵی بـەڕێوەبردنی ستراتێجییەکی ئابووری نوێ بەناوی «قووڵبوونـەوەی پیشەسـازی» بـوون و

مەبەستی ئەوان ڕۆیشتن بەرەو بەرهەمهێنانی کەلوپەلەنێوەنجی و سەرمایەکان بوو. لە ڕاستیدا ئامانج لەو پرۆگرامە چوونە ژوورەوە بۆ بازاڕی هەناردەی پیشەسازی بوو. بەکارهێنانی ئەم جۆرە سیاسەتە ئابوورییانە پێویستی بە سەرمایەگوزاری زۆر گەورە و درێژخایەن لە لایەن سەرمایەگوزارە بیانی و نێوخۆکان هەبوو؛ بەڵام هاندەر بۆ وەها سەرمایەگوزارییەک تەنیا بە دابین کردنی ئاسایش و ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتیی سەقامگیر ئەگەری هەبوو. بە واتایەکی تر، پێشەنگە میلیتاری و بیرۆکراتیکەکان لە ئەمریکای لاتین بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی ئابووری کۆمەڵگە ناچار بوون سەرەتا قەیرانی سیاسی لە ڕێگەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئۆتۆریتە چارەسەر بکەن. ئەو پێشەنگانە دەبوایە مەترسییە سیاسییەکانی سەرهەڵداو لە چالاک بوونەوەی بەشی جەماوەریان لابردبایە. بەم چەشنە بە لەنێوبردنی ڕێبەرانی بەشی جەماوەری، گۆڕینی ڕێکخراوە کرێکارییەکان لە ئاستی کارخانەکان بە باڵێکی دەوڵەت، قەدەغەکردنی مانگرتنەکان، وەستاندنی خولەکانی هەڵبژاردن و شتی لەم چەشنە، سروشتی ئۆتۆریتەی دەوڵەت، ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر خۆی دەنواند. بە ڕای ئۆدانێل، لابردنی بەشی جەماوەری لە گۆڕەپانی سیاسەت، وێڕای دابین کردنی ئاسایش و دۆخی پێویست بۆ جێگیر بوونی پێوەندییە زاڵەکان، گارانتییەکی زیاتر بۆ سەرمایەگوزاری قازانج هێنەر و هاندەری نوێ بۆ قووڵبوونەوەی بنەمای بەرهەمهێنان پێکدێنێ. بە پێچەوانە ئەگەر دەوڵەت توانای خۆی بۆ کۆنترۆڵ کردنی تەواوی کۆمەڵگەی شارستانی لە ڕێگەی دەست بردن بۆ سەرکووتی سیاسی زیاد نەکردبایە، پرۆسەی قووڵبوونەوە هیچکات ئەگەری جێبەجێ کردنی نەدەبوو.

دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتەکان لەگەڵ ناکۆکی و کێشەگەلی زۆر ڕووبەڕوو بوونەوە. ئەو دەوڵەتانە بۆ ڕاکێشانی هەرچی زیاتری سەرمایە ناچار لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هاوپەیمانە نێوخۆیەکانی خۆیان (بورژوازی نێوخۆ و چینە مامنێوەند و خوارەوەکان) بوون؛ بۆ وێنە

سیاسـەتی لابردنـی سوبسـیتەکان و کـەم کردنـەوەی تاریفـە گومروکیـەکان (هـاوردەیی) لـە لایـەن دەولـەت، کـە لـە پێنـاو بەرژەوەندیـەکانی سـەرمایە بیانییـەکان و بـە مەبەسـتی ڕاکێشـانی ئـەو سـەرمایانە بـوو، بـۆ بـورژوازی نەتـەوەیی و چینـە مامنیۆەنـد و خوارەوەکـانی کۆمەڵگـە نـاخۆش و زیانـاوی بوو. بە ڕای ئۆدانێل دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتیکەکان لە قۆناغی سـەرەتایی پیشەسـازیدا پێویسـتی یەکجار زۆریـان بە یارمـەتی دارایی و تەکنیکییـەکانی بیـانی هەیـە، بۆیـە چارەیـەکیـان جگـە لـە پاشـکۆبوون بـە هۆکـار و سـەرمایە بیانییـەکان نییـە. بـەڵام لـە قۆنـاغی دوواییـی کـە سیاسـەتی قووڵبوونـەوەی پیشەسـازی پتـەو دەبـێ و ڕادەی پێشـکەوتنی ئـابووری دەچێتـە سـەرێ، دەوڵەتـە ئامـاژە پێکراوەکـان ئۆتۆنـۆمی زیاتریـان لـە بەرامبـەر هۆکـار و سـەرمایە بیانییـەکان هەیـە و دەتـوانن بۆشـاییەکی زیـاتر بـۆ چـالاکی و بەرژەوەندییەکانی سـەرمایەی نێوخۆ پێک بێنن. لـەم قۆناغەیە کەوا یـەکێتی سێ گۆشە لە نێوان دەوڵەت، سەرمایەی بیانی و سەرمایەی نێوخۆ دروست دەبـێ. هـەروەها لـەو قۆناغـەدا دەوڵـەت بانگەشـەی نوێنەرایـەتی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی دەکات و ئاهەنگی هێز و گەورەیی نەتـەوەیی لـێ دەدا. لـە وەهـا بارودۆخێک دەوڵـەت بـۆ پتـەوکردنی ڕەوایـی خـۆی لەوانەیـە پلەبەپلـە بـەرەو بەشـە جـەماوەری و چـین و گرووپـە سـەرکوت بووەکـان هەنگاو هەڵێنێ و ئەوان بۆ بەشداری کردن لە ڕێگەی ئامانجە دیاریکراوەکان (گەیشتن بە هێزی نەتەوەیی) بانگهێشت بکاتەوە. هەڵبەت ڕاکێشانی ئەو چین و گرووپانە پێویستی بەوەیە کە دەوڵـەت سنوورگەلێک بۆ سـەرمایەی بیانی دانێ و لـە بەرامبـەردا لـە بەرژەوەندییـەکانی سـەرمایە نێوخۆکان و گرووپـە جەماوەرییەکان پشتیوانی زیاتر بکات. لە وەها بارودۆخێک سەرمایەی بیانی (کۆمپانیا فرەنەتەوەکان) ئەو سنوورانە وەکو ئامێرێک بۆ پاراستنی ئاسـایش و بەرژەوەنـدی درێژخایـەنی خـۆی دادەنـێ و پەسـەندی دەکـا. بـە تایبـەت دەوڵەتـە ئۆتۆریتـە بیرۆکراتیکـەکان هیچکـات بەرژەوەندییـە درێژخایەنـەکانی

ئـەوان ناخەنـە ژێـر مەترسـییەوە، چونکـە هێشـتاش پێویسـتی جـددیان بـە سەرمایە و تەکنۆلۆجی بیانی هەیە.

**تێکچوون یا داڕوخانی دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتەکان:**

ئۆدانێـل دوو ئەگـەری بـۆ تێکچـوون یـا داڕوخـانی دەوڵەتـە ئۆتۆریتـە بیرۆکراتیکـەکان پێشـکەش کـرد. ئەگـەری یەکـەم ئەوەیـە کـەوا هەنـدێک لـەم دەوڵەتانە تەنیا قۆناغی یەکەمی پیشەسازی تێپەڕ دەکەن. واتـە پێش ئـەوەی کە بچنە ناو قۆناغی «پتەو بوونەوە« تێکدەشکێن و بە چەشنێکی دیکە لـە دەوڵەتەکان دەگۆڕێن. بۆ وێنـە لـە ئارژانتین لـە سـاڵی ١٩٦٦ ئامادەکاری بۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئۆتۆریتـەی بیرۆکراتیـک جێبـەجێ کـرا. لـەو سـاڵەدا میلیتارەکان لە ئەنجامی کودەتایەک دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت. دوو ساڵ پـاش کودەتـا واتـە لـە سـاڵی ١٩٦٨، سـەرمایەداری نێونەتـەوەیی، بەرەبـەرە چووە ناو ئابووری ئارژانتین. لە هەمان کاتدا بۆرژوازی نەتەوەیی ئارژانتین و بەشـە مامنێوەندییـەکان ڕوویـان لـە بەشـی جـەماوەری و دەرکەوتـە نیشـتمانپەروەرە جەماوەرییـەکان واتـە »پرۆنیسـم» کردبـوو. تـا نێوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٦٩ لەگـەڵ پەرەسـەندنی نائارامییـە گشـتییەکان، ئاشـکرا بـوو کـە دەوڵەتی ئارژانتین ڕۆڵی خۆی وەکو گارانتی کەری ئاسودەیی کۆمەڵایـەتی و سەقامگیری ئابووری بە باشی بەڕێوە نەبردبوو و تێیدا سەرکەوتوو نـەبووە. لـە ئەنجامـدا، سـەرمایەگوزاری بیـانی ڕووبـەڕووی وەسـتان بـۆوە، پـارە نەقدەکان (ڕوت)لـە وڵات چـووە دەرێ، زەخیـرە نێونەتەوەییـەکانی ئارژانتین کـەم بـووە، سـەرمایەگوزارییە تایبەتـەکان لـە ئامێر و کەرەسـە تەکنیکییـەکان کەم بۆوە. ئەوانە و کێشەگەلی لەم چەشنە، بە گشـتی بـوو بـە هـۆی شکست هێنـانی پلانـی «قـووڵ بوونـەوە« و کۆتـایی هـاتنی ڕێگـەی هاوبـەش و کـەم ماوەی دەوڵـەتی ئۆتۆریتـەی بیرۆکراتیـک و سـەرمایەداری نێونەتـەوەیی. لـەم ڕووەوە، دەتوانین بڵێین بابەتی ئارژانتین یـەکێک لـەم بابەتـە نەریتییانەیە کە لەوێدا کۆمەڵگـەی شارسـتانی توانی هێرش بکاتـە سـەر دەوڵـەت و ناچـاری

بکـــات هەســـتیاری و بەرپرســـیاریتییەکی زیـــاتر ســـەبارەت بـــە کێشـــە کۆمەڵایەتییـەکان و بـەکارهێنانی سنوربەندی بـۆ سـەرمایە نێونەتەوەییـەکان بگرێتە ئەستۆ و بەم جۆرە تایبەتمەندییە بیرۆکراتیک و ئۆتۆریتـەکانی خـۆی کـەم بکاتـەوە. ئۆدانێـل ئـەم بابەتـە وەبیـر دێنێتـەوە کـە ئەگـەرچی چینـە دەسەڵاتدارەکان لە لایەنی سیاسییەوە تووشی شکست هاتن، بەڵام هێشتاش خاوەن هێزن و لـە لایـەن هێزە چەکدارەکان پشتیوانی دەکرێن. لـە ئەنجامدا چینـە دەسـەڵاتدارەکان ڕوانگەیـەکی بەرگریکەرانـەیان هـەڵبژارد، بـە چەشـنێک کەوا لە پاشماوەی هێزی دەوڵەت وەکو نوێڵێکی کاریگەر بۆ گارانتی کردنی بەرژەوەندییە ڕێکخراوەیی و چینایەتییەکانی خۆیان کەڵکیان وەرگرت.

ئەگـەری دووەم کـەوا گیلرمـۆ ئۆدانێـل بـۆ دارمـانی دەوڵەتـە ئۆتۆریتـە بیرۆکراتـەکان باسـی دەکـات، ئەوەیـە کـەوا ئـەم دەوڵەتانـە پـاش پتـەوکردنی ڕەوشی خۆیان و سەرکەوتن لە پرۆگرامـی «قووڵ بوونـەوەی پیشەسـازی» پلەبەپلە بـەرەو سیاسـەتە نەتەوەگـەراکان هـەنگاو دەنێن و لـە سـەرمایەداری بیـــانی دوور دەکەونـــەوە. لـــەم دۆخـــەدا ئـــەم دەوڵەتانـــە ڕەنگـــە بـــۆ دیمۆکراتیزەکردنی سیاسـەتیش هەوڵ بدەن. هەڵبەت ئـەم کـارە ئاسـان نییـە و بە هۆی بوونی گرووپە جیاواز و بەهێزەکانی نێوخۆیی کە هەر کام بیروڕای جیاوازیـان لـە بابـەت پێویسـتی و دیمـۆکراتیزەکردنی دەوڵـەت هەیـە، ئـەم پرۆسەیە زۆر بە زەحمەت دەڕواتە پێشەوە.

**پیتر ئیوانس و تیۆریی قەیران لە دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتیکەکان:**

چارەنووسـی هەنـدێک لـە دەوڵەتـە ئۆتۆریتـە بڕۆکراتیکـەکانی ئـەمریکای لاتین جیاواز بوو لـەو دوو ئەگـەرەی کـەوا «ئۆدانێل» پێشبینی کردبوو. بە بۆچـــوونی ئۆدانێـــل بـــەرازیل لـــە دەیـــەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ یـــەکێک لـــە سـەرکەوتووترین وڵاتەکان بۆ بـەرەوپێش بردنـی پرۆگرامـی «قووڵبوونـەوەی پیشەسازی»بوو. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە بەرازیل لە دەیەی ١٩٦٠ و نیوەی یەکـەمی دەیـەی ١٩٧٠، ١٠ لـە سـەدی پەرەسـەندنی سـاڵانەی بەرهـەمهێنانی

ناڕاستەوخۆی نەتەوەیی، ٢٠ لە سەدی پەرەسەندنی ساڵانەی بەرهەمە پیشەییەکان و ٣٠ لە سەدی پەرەسەندنی ساڵانەی هەناردە پیشەییەکانی بە دەست هێنابوو و ئەوە ڕەوڕەوەی ئابووری ئەم وڵاتەی وەکو موعجزەیەک لێکردبوو. بەڵام ئەم وڵاتە لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ ڕووبەڕووی قەیرانی ئابووری و سیاسی هەمەلایەنە بووە: کەم بوونەوەی ڕادەی پێشکەوتنی ئابووری، خەسارگەیاندن و تەنانەت لەنێوچوونی هەندێک لە کۆمپانیاکان و ڕوودانی شۆڕشە کرێکاری و جەماوەرییەکان لە نمونەکانی ئەم قەیرانانە بوون.

«پیتر ئیوانس» کە ئەم گۆڕانکارییانەی لە نێزیکەوە چاو پێ کەوتبوو، لە هەوڵی شیکردنەوەی هۆیەکانی ئەم قەیرانانە لە دەوڵەتە ئۆتۆریتە بیرۆکراتەکاندا بوو. بە رای «ئیوانس» ڕیشەی ئەم قەیران و کێشە و کۆسپانە دەگەڕێتەوە سەر دۆخی گەشەی پاشکۆ لە بەرازیل. ئیوانس کەوا کەڵکی لە مۆدێلی «یەکێتی سێ لایەنی ئۆدانێل» وەرگرتبوو و لەم باوەڕەدا بوو کە پەرپێدان بە گەشەی پاشکۆ لە بەرازیل بە هۆی یەکێتی نێوان سەرمایەی بیانی، سەرمایەی خۆوڵاتی و دامودەزگا دەوڵەتییەکان ساز بووە، دەیگوت کەوا ئەم یەکێتییە هاوکات لەگەڵ دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی ئەم سێ لایەنە، هەروەها مەترسی گەلێکی بۆ ئەوان ساز کردووە. بۆرژوازی دەوڵەتی و سەرمایە خۆوڵاتییەکان ترسی زۆربوونی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان و بەتایبەت جێگۆڕکێی دەسکەوتە دارایی یەکانی کۆمپانیاکان بۆ دەرەوەی بەرازیلیان هەبوو. سەرمایەدارە خۆوڵاتییەکان هەروەها لە دەستدرێژی دەوڵەت بە سەر سەرمایە تایبەتییەکان نیگەران بوون. کۆمپانیا فرەنەتەوەکان نیگەرانی چارەنووسی ماڵ و داراییەکانی خۆیان، لە کاتی سەرهەڵدانی هەر چەشنە شۆڕش و هەستانێکی نەتەوەیی بوون. «پیتەر ئێوانس» بە هۆی ئەم کێشە و قەیران و مەترسییانە لەنێو «یەکێتی سێ قۆڵی»، ئەو یەکێتییە بە یەکێتییەکی لەرزۆک و پڕکێشە ناو دەبا. جگە لەوە بە بۆچوونی ئیوانس کێشەکانی دیکە وەکو بەرزبوونەوەی شەلەیی نێونەتەوەیی،

سەرەوخواربوونەوەی قەرزە بیانییەکان بەرەو بەرازیل و ئەگەری سەپاندنی بارودۆخی دژواری پێوەندییدار بە گەشەی ئابووری بەسەر چینە لاوازەکانی بەرازیل هەروەها لە هۆکارە ڕێخۆشکەرەکانی «گەشەی ئابووری» ئەم وڵاتە بووە.

کەوایە بە بۆچوونی ئێوانس دوو هۆکار بۆتە هۆی ڕوودانی قەیران لە وڵاتی بەرازیل. یەکەم، گۆڕانی بارودۆخ و ڕەوشی نێونەتەوەیی و دووەم ناکۆکییە نێوخۆکان لە بەرازیل. ئیوانس لەسەر ئەم باوەڕە بوو، گرینگترین گۆڕان کەوا لە کۆتایی دەیەی ۱۹۷۰ لە دۆخی نێونەتەوەیی ڕوویدا و کاریگەری لەسەر ئابووری بەرازیل دانا پێچەوانە بوونەوەی ڕەوتی سەرمایەی نێونەتەوەیی بوو کەوا چوونە دەرەوەی خێرا و زۆری سەرمایەی لە بەرازیل لە پاش بوو. چوونە دەرەوەی سەرمایە لە ڕێگەی چوونە دەرەوەی قازانجی کۆمپانیاکان و دانەوەی قەرزەکان ڕووی دا. ئەم کێشە و گرفتانە توانای دەوڵەت بۆ چەنەلێدان لەگەڵ شەریکەکانی (کۆمپانیا بیانییەکان و سەرمایەی خۆوڵاتی) کەم کردەوە. هەروەها گوشارێکی زۆری خستە سەر دەوڵەت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خۆپیشاندانە جەماوەرییەکان. دەوڵەت بۆ هەڵاتن لە قەیران، بەردەوام یارمەتی لە سەرمایەی بیانی وەردەگرت و خەڵاتی جیاجیای بەوان دەدا؛ بۆیە بە توندی کەوتە ژێر گوشاری بورژوازی نێوخۆ، بە هۆی ئەوەی کە بورژوازی نێوخۆ لە هەوڵی کاریگەری دانان لە سەر بڕیارە دەوڵەتییەکان و دیمۆکراتیزەکردنی دەوڵەت بوو.

بە ڕای ئیوانس لە وەها حاڵەتێک دەوڵەت کەوتبووە ڕوەشێکی هەستیار، نەیدەتوانی سیاسەتی نەتەوەپەروەرانە بگرێتە پێش (بە هۆی ئەوەی کە ئەم سیاسەتە مەترسی بۆ بەرژەوەندییەکانی سەرمایەی بیانی دروست دەکرد) و نەیدەتوانی بە تەواوی دەست لە پشتیوانی کردن لە سەرمایەی نەتەوەیی و بورژوازی خۆوڵاتی هەڵگرێ (بە هۆی ئەوەی کە پاراستنی متمانە و ڕەوایی نێوخۆیی دەوڵەت پێوەندیی بە پشتیوانی کردن لەم سەرمایە هەبوو).

ڕاکێشانی پشتیوانی ئەم دووانە لە یەک کاتدا ئەگەر نامومکین نەبێ، لانیکەم زۆر دژوار و پڕ تێچووە. جگە لەوە دەوڵەت ڕووبەڕووی دژکردەوە و نارەزایەتی کرێکاران و چینە لاوازەکان لە بەرامبەر گوشارە ئابوورییەکان بۆوە. بە ڕای ئێوانس سەرجەم ئەم هۆکار و بارودۆخانە بوونە هۆی ئەوەی کە بەرازیل لە دەیەی ١٩٨٠ ڕووبەڕووی ناسەقامگیری سیاسی و نەبوونی متمانەی ئابووری بێتەوە.

**تیۆریی پاشکۆبوون و پێوەندیی باکوور ـ باشوور:**

تیۆرییدارێژانی «پاشکۆبوون» پێشبینییە گەشبینەکەی تیۆریی «نوێسازی» کە دەڵێ وڵاتانی جیهانی سێیەم دەتوانن بە ڕەچاوکردنی ڕوانگە کولتوورییەکان، ڕێکخراوەکان و سیاسەتە باکوورییەکان بە گەشە بگەن، پەسەند ناکەن. (٥٤) ئەم تیۆرییدارێژانە لەسەر ئەم باوەڕەن کە ئەم چوارچێوە نەتەوەییە کەوا ئێستا «وڵاتە لە حاڵی گەشەکان» لەگەڵی ڕووبەڕوون جیاوازی لەگەڵ چوارچێوەیەک هەیە کە وڵاتە پێشکەوتووەکان» پێشتر ڕووبەڕووی بوونەوە. سەرمایەداری بە شێوەی خۆڕسک لە ئەورووپا گەشەی سەند و لە یەکەم شەپۆلی پیشەسازیدا وڵاتە ئەورووپییەکان ڕووبەڕووی وڵاتە گەشەسەندووەکان نەبوونەوە. جگە لەوە، پرۆسەی«بە پیشەسازی بوون»لە ئەورووپا بە هۆی دەست بەسەرداگرتنی ئەوان بە ماددە خاوەکان و وزەی کاری هەرزان لە کۆلۆنییەکان ئاسان بۆوە.

ئەمرۆکە وڵاتە »لە حاڵی گەشەکان» ڕووبەڕووی ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگری نێونەتەوەیی بوونەوە. وڵاتانی جیهانی سێیەم بۆ «بە پیشەسازی کردنی» خۆیان دەبێ ڕووبەڕووی توانا بەرهەمهێنانە پێشکەوتووەکانی وڵاتە باکوورییەکان و ڕکەبەری لەگەڵ ئەوان ببنەوە و ئەم ڕکەبەرییە بۆ ئەوان زۆر زەحمەتە. هەروەها بۆ پتەوکردنی ژێرخانەکانی خۆیان پێویستیان بە نوێ کاری تەکنۆلۆجی و زانستی هەیە و ئەم

کەرەسانەش بە ڕادەیەکی زۆر لە باکوور بوونیان هەیە. بە گشتی، سەرمایەداری بۆ وڵاتە باشوورییەکان لەگەڵ وشەگەلی وەکو دەوڵەتە باکوورییەکان، بازرگانەکان و سەرمایەگوزارەکان پێناسە کرابوو. ئابووری وڵاتە باشوورییەکان پێوەندییەکی یەکجار زۆری بە بازرگانی بیانی لەگەڵ باکوور و کۆمپانیا فرەنەتەوەکان بوو و ئەم پێوەندییە حاڵەتێکی پاشکۆبوونی بە ئابووری ئەوان دابوو.

تیۆرییدارێژانی پاشکۆبوون لەسەر ئەم باوەڕەن کە جیاوازییە هەبووەکان (و کێشەکانی تر) لە نێوان وڵاتە گەشەسەندووەکانی پێشتر و دواتر بەو واتایەیە کەوا ئەزمونی گەشەی باکوور جیاوازی زۆری لەگەڵ ئەزموونی ئێستای باشوور هەیە. ئەم جیاوازییە گرینگییەکی زۆری هەیە؛ لە ڕاستیدا، تیۆریی پاشکۆبوون بەربەستە سەرەکییەکان بۆ گەشەی جیهانی سێیەم دەبەستێتەوە بە سیستەمی جیهانی و کەمتر گرینگی بە دۆخی کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسی نێوخۆی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەدا. بە واتایەکی تر، سیستەمی نێونەتەوەیی وەکو بەستێنێکی باش بۆ لێکدانەوەی پاشکەوتوویی جیهانی سێیەم پێناسە دەکات.

بە ڕای تیۆرییدارێژانی پاشکۆبوون گرینگترین تایبەتمەندی سیستەمی نێونەتەوەیی سەردەم، سەرمایەدارییە. سەرمایەداری کۆبەندێکی دیاریکراو لە پێوەندییە ئابوورییەکانە و تایبەتمەندییەکانی ئەو بریتین لە:خاوەندارێتی تایبەتی دارایی یەکان، مووچەی وزەی کار و ئاڵوگۆڕەکانی بازاڕ. تیۆرییدارێژانی پاشکۆبوون لەسەر ئەم باوەڕەن سیستەمی جیهانی سەرمایەداری لە سەدەی شانزدەوە بوونی بووە. ئەم سیستەمە لەخۆگری دوو چەشنە پێوەندیی چەوسێنەرانەیە.[٥٥] یەکەم، خاوەن سەرمایەکان لە کۆمپانیا تایبەتییەکان لە ڕێگەی قازانجوەرگرتن لە وزەی کاری کرێکاران، ئەوان دەچەوسێننەوە. دووەم پێوەندیی چەوسێنەرانە کەوا بە بۆچوونی ئێمە نێزیکە، پێوەندیی نێوان دەوڵەتە نێوەند و کەمەرەکان لە ئابووری جیهانییە. سەرمایەداری بە شێوەی ڕێکوپێک گەشە ناکات، بەڵکو حەزی لە گەشە لە

هەندێک ناوچەی تایبەت هەیە کە پێی دەڵێن «نێوەند» و لایەنە دیاریکراوەکانی ئەو بریتین لە : بە پیشەسازی بوونی پێشکەوتوو، گەشەی تەکنیکی خێرا، نرخە بەرزەکانی مووچە و ستانداردە باشەکانی ژیان. تایبەتمەندی ناوچە کەمەرەکان کەوا لە ڕووی جوگرافیایی بەشی هەرە زۆر لە ئابووری جیهان پێکدێنن، بریتییە لە: بە پیشەسازی بوونی سنووردار، داهێنانە تەکنیکییە بچووکەکان و مووچە و ستانداردە نزمەکانی ژیان.

گەشەی وڵاتە نێوەندەکان پێوەندیی بە گەشەنەسەندوویی وڵاتە کەمەرەکان هەیە. سیستەمی سەرمایەداری جیهانی دەیهەوێ نایەکسانی لە نێوان وڵاتەکان بەهێز و هەتاهەتایی بکات. زۆربەی لایەنگرانی لێهاتووی پاشکۆبوون لەبابەت پێوەندیی نێوان وڵاتە گەشەنەسەندووەکان و «لە حاڵی گەشەکاندا» ڕاوبۆچوونێکی هاشێوەیان هەیە. ئەوان دەڵێن : گەشەنەسەندوویی و گەشەسەندوویی دوو لایەنی دیاردەیەکی یەکسانن، هەر دوویان لە لایەنی مێژوویی هاوکاتن و لە لایەنی کارکردەوە پێوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە و بۆیە، پێوەندیی و کاریگەری بەرامبەریان لە سەر یەکتر هەیە. (٥٦)

لەگەڵ پەرەسەندنی بازرگانی و سەرمایەگوازری ئەورووپا، وڵاتانی جیهانی سێیەم لە ڕێگەی کۆلۆنیالیزم کێشرانە ناو ئابووری و سەرمایەداری جیهانییەوە. وڵاتە ئەورووپییەکان کەڵکیان لە دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بۆ دابەشکاری جیهانی کار وەرگرت و چالاکترین بەشەکانی ئابووری جیهانیان بەخۆیان تەرخان دا. تەوەرەی سەرەکی بازرگانی باکوور – باشوور جێگۆڕکێی کەلوپەلە سازکراوەکانی باکوور بۆ باشوور و جێگۆڕکێی کەلوپەلە سەرەکییەکانی وەکو مادده کانزاکان، مادده خاوەکان و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی باشوور بۆ باکوور بوو. جگە لەوە لە کاتێکدا وڵاتە باکوورەکان بە شێوەی بەربڵاو لەگەڵ یەکتر و هەروەها لەگەڵ وڵاتانی دیکە خەریکی بازرگانی بوون، وڵاتە باشوورەکان تەنیا لەگەڵ باکوور پێوەندیی بازرگانیان هەبوو. کۆلۆنیالیزم بوو بە هۆی ئەوە، کەوا ئابووری وڵاتە

باشوورەکان زیاتر لەوەیکە سەرقاڵی پێداویستییەکانی خۆی بێ سەرنج بە بازاڕە باکوورەکان بدات. ئەم پێوەندییە ئابوورییانە کە نووسەرانی پاشکۆبوون جەختی لەسەر دەکەن، پاشماوەکانی کۆلۆنیالیزمە.

«دۆس سانتۆس» دۆخی ملکەچ بوون و پاشکۆبوونی وڵاتە باشوورەکان بە باکوور، بە باشی لێکدەداتەوە و دەڵێ:

پاشکۆبوون دۆخێکە کەوا لەوێدا تاقمێکی تایبەت لە ئابووری وڵاتەکان، پشتبەستوو بە گەشە و پەرەسەندنی تاقمێکی دیکەیە. پێوەندیی «پاشکۆبوونی بەرامبەر» لە نێوان دوو یا چەند وڵات یا لە نێوان ئەم وڵاتانە و سیستەمی بازرگانی جیهانی کاتێک بۆ «پێوەندیی پاشکۆبوون» دەگۆڕێ کەوا هەندێک لە وڵاتەکان بتوانن لە ڕێگەی هاندەرە نێوخۆیەکان پەرە بسێنن، لە حاڵێکدا ئەوانی دیکە، کە لە دۆخی پاشکۆبوون دان، تەنیا بتوانن وەکو دەنگدانەوەی گەشەی وڵاتە زاڵەکان پەرەبسێنن. ئەوە لەوانەیە کاریگەری ئەرێنی یا نەرێنی لەسەر گەشەی خێرای ئەوان دابنێ. (٥٧)

تیۆرییداڕێژانی پاشکۆبوون ژمارەیەک لەو میکانیزمانە کە دەبنە هۆی پاشکۆبوونی وڵاتە باشوورەکان دیاری کردووە. ئەم میکانیزمانە لە ڕاستیدا وەکو؛ کۆسپ و بەربەستی سەرەکی بۆ گەشەی باشوور دەژمێردرێن. هەندێک دەڵێن؛ « ***ئاڵوگۆڕە نایەکسانەکان*** » ئامێرە سەرەکییەکانی وڵاتە باکوورەکان بۆ دەرکێشانی سامانی زێدەی وڵاتە باشوورەکانە. نرخی کەلوپەلە سەرەکییەکان کە لە باشوورەوە هەناردە دەکرێ بەرەبەرە بەبەراورد لەگەڵ کەلوپەلە سازکراوەکانی باکوور کە بۆ باشوور هەناردەیان دەکات، دێتە خوارێ. ئەو وڵاتەی بە ڕادەی هەناردەکانی خۆی ناتوانێ هاوردە وەربگرێ، دەکەوێتە دۆخێکی دژوارەوە و بە کەم بوونەوەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ تووشی تەنگەژە دەبێت.

« ***کۆمپانیا فرەنەتەوەکانی*** » باکوور ئامێرێکی تر بۆ چەوساندنەوەی وڵاتە باشوورەکانن. ئەم کۆمپانیانە بە هێنانەکایەی تەکنۆلۆجی خراپ و خۆبواردن لە باج و یاساکان، کۆمپانیا خۆوڵاتییەکانیان لەنێو دەبرد. هەروەها

ئـەم کۆمپانیانـە دەوڵەتـەکانی باشـوور دەخەنـە ژێـر کاریگـەری خۆیـان و هەوڵێک بۆ پەروەردەکردن و دامەزراندنی بەڕێوەبەرە پلەبەرزەکانی وڵاتـە باشـوورەکان نـادەن. بۆیـە قـازانج و بەرژەوەندییـەکانی بەدەسـت هـاتوو لـە وڵاتـە باشـوورەکان بـە جـێ ی ئـەوەی کـە لـەم ناوچانـە سـەرمایەگوازری بکرێت، بۆ وڵاتـە باکوورەکـان دەگەڕێتـەوە. تیـۆریی پاشـکۆبوون بانگەشـەی ئەوە دەکات کـەوا ئـەم فۆڕمـە لـە چەوسانەوە لەگـەڵ هەنـدێک مێتـۆدی دیکـە وەکـو یارمـەتی بیـانی، قـەرزی بانکـە بازرگانییـەکان و کاریگـەری کۆمپانیـا قـەرزدەرەکانی بـاکوور دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە گەشـە و «بەپیشەسـازی بـوون» لــە باشــوور دوا کــەوێ. تیۆرییــداڕێژانی پاشــکۆبوون بیــروڕای جیاوازیـان لـە بابـەت توندی و گـەورەبوونی ئـەو سنوورانە کـە پاشـکۆبوون دەیخاتـە بـەر گەشەسـەندنی جیهانی سـێیەم هەیـە. هەنـدێک لـە نووسـەرەکان لەسـەر ئـەم بـاوەڕەن کـەوا پاشـکۆبوون کەشـێکی کـەم بـۆ گەشـە پێکدێنێ و بـەردەوام بـوونی ئـەو دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە هـەژاری لـە زۆربـەی وڵاتـە باشوورەکان زۆر بێت. ئەو کەسانەی کـەوا قـازانج لـە پاشـکۆبوونی باشـوور وەردەگـرن چینـی «کۆمپرادۆر»ە. ئـەم چینـە بـریتین لـە گرووپـە سیاسـی و ئابوورییەکان و کەسانێک کەوا وەکو نوێنەرانی خۆوڵاتی ئیمپریالیزم چالاکی دەکەن.

دەســتەیەکی تــر لــە نووســەرانی پاشــکۆبوون لەســەر ئــەم بــاوەڕەن پاشـکۆبوون لەگـەڵ پەرەسـەندن و گەشـەی ئـابووری دژ نییـە و تەنانـەت دەتوانێ تـا ڕادەیـەک یارمـەتی بـە پیشەسـازی بگەیـەنێ. جگـە لـەوە، هەنـدێک وڵات زیـاتر لـە وڵاتـانی تـر پێشـکەوتن بـە دەسـت دێـنن. وێـڕای ئـەوەش، ئـەم نووسـەرانە وەکـو، پێشـو پاشـکۆبوون بـە بەربەسـتی گەشـەی زۆر لـە وڵاتـە باشوورەکان دەزانن و پەرەسەندن و «بە پیشەسازی بوونی» ئەم وڵاتانە لە ئاسـتێکی نزمـدا دەبینـێ. بـە گشـتی ئـەوان دەڵـێن بـارودۆخی ڕێژەیـی وڵاتـە کەمەرەکان بە بەراورد لەگەڵ نێوەند باشتر بووە، تەنانەت لەو جێگانەی کەوا بەرژەوەندی تەواویش بەدەست دێت.

دەســتەی ســێیەم لــەو نووســەرانە لەســەر ئــەم بــاوەڕەن کــەوا بــە پێچەوانــەوەی ئــەوە کــە پاشــکۆبوون هەنــدێک جــار دەبێتــە پەرەســەندنی ئابووری، بەڵام لەگەڵ ئەوەش، لاڕێیی نەخوازراو ساز دەکات کە تایبەت بە کۆمەڵگە و ئابووری باشوورە. هەندێک لەم بابەتە نەخوازراوانە بریتین لە : پەرەســەندنی نایەکســان لــە مووچــەکان، خــەرج کردنــی بــێ ســەرەوبەرە، لاوازبــوونی کولتــووری و ســەرکوتی سیاســی. نیگــەرانی ســەرەکی ئــەم نووسەرانە جێبەجێ کردنی گەشە نییە، بەڵکو چەشنی گەشەیە کەوا لە ژێر دۆخی پاشکۆبووندا ساز دەبێ. (گەشەی پاشکۆ)

تیۆرییدارێژانی پاشکۆبون بیروڕای جیاوازیان لەبابەت چارەسەرکردنی کێشەکانی وڵاتە پاشکۆکانی جیهانی سێیەم هەیە. دەستەیەک ستراتێجی «گەشەی ڕاستەوخۆ»، پێشنیار دەکات کە جەختی لەسەر بەرهەمهێنان بۆ بازاڕە ناخۆکانە. ئەم ستراتێجییە بریتییە لە : کەم بوونەوەی پێوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ باکوور لە ڕێگەی دانانی بەربەستە گۆمرکییەکان بە مەبەســتی بــەهێزکردنی پیشەســازی نێوخــۆ و یاســادانانی دژوار بــۆ سەرمایەگوازری بیانی. دەستەیەکی تر لە ستراتێجی «چەنەلێدانی تێکڕایی» پشتیوانی دەکەن. بەپێی ئەم ستراتێجییە وڵاتە باشوورەکان دەبێ بە پشت بەستن بە یەکتر و کۆکردنەوەی سەرچاوە ئابووری و سیاسییەکانیان گوشار بخەنە سەر باکوور و ناچاری بکەن چاکسازیی لە سیستەمی ئابووری نێونەتەوەیی بە مەبەستی برگری لە چەوساندنەوەی کرێکاران لە لایەن سەرمایەدارەکان بکەن. ئەم حاڵەتە لە ڕێگەی کارتلە گرینگەکانی وەکو « ئۆپێک » جێبەجێ دەبێ کە مەبەست لە دامەزراندنی ئەو گەراندنەوە و وەرچەرخاندنی بالانسی پێوەندیی ئالوگۆڕ بە قازانجی باشوورە. هەروەها دامەزراندنی پەیمان و یەکێتییە بەربڵاوەکان کە بتوانێ ڕیفۆڕمگەلی تایبەتی وەکو: کەم کردنەوەی بەربەستە گۆمرکییەکانی باکوور بۆ کەلوپەلە بەرهەمهاتووەکانی باشوور، گەڵاڵەکانی سەقامگیری کەلوپەل و یاساگەلێک بە مەبەستی ڕێنوێنی و شێوەی چالاکی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان، ساز بکات.

کەسانێک کە لەم ستراتێجییە پشتیوانی دەکەن جەختیان لەسەر گرینگی باشکردنی پێوەندییە ئابوورییەکان هەیە کەوا بریتییە لە گەشەی بازاڕە هاوبەشە ناوچەییەکان لە نێوان وڵاتە باشوورەکان کە دەتوانێ پاشکۆبوونی باشوور بە باکوور کەم بکاتەوە.

و پاشان، دەستەیەکی تر لە تیۆرییداڕێژانی پاشکۆبوون تەنیا ڕێگەی ڕزگاربوون لە پاشکۆبوون بە سیستەمی سەرمایەداری جیهانی، ڕێگەی شۆڕشی سۆسیالیستی و پێداچوونەوە بە بنەمای خۆیان دەزانێ. ئەم ستراتێجییە بریتییە لە لابردنی سەرمایە تایبەتییەکان و گەشەی پێوەندیی ناچەوسێنەرانە لەگەڵ ئەو وڵاتانەیە کە ئاوا بۆچوونێکیان هەیە.

بە کورتی، تیۆریی «نوێسازی» بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێوەندییە ئابوورییەکانی باشوور لەگەڵ باکوور باش و بەکەڵکە، بە هۆی ئەوەی کە تەکنۆلۆجی و کارزانی پێویست دەچێتە ناو باشوورەوە و بەربەستە کولتووری و نەریتییەکانی گەشە لەنێو دەبا. لە لایەکی ترەوە تیۆریی «پاشکۆبوون» لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئابووری باکوور و کاریگەری سیاسی ئەو دەبێتە هۆی چەوساندنەوەی باشوور و گوێستنەوەی سەرچاوەکان لە وڵاتە هەژارەکان بۆ وڵاتە دەوڵەمەندەکان.

بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی تیۆریی پاشکۆبوون دەبێ لە نێوان دوو مێتۆدی بەڵگەهێنانەوە جیاوازی دابنێین؛ ئەم دوو مێتۆدە بە شێوەی هاوکات یا جیا لە لایەن نووسەرە جیاجیاکان پێشکەش کراوە. یەکەم بابەتی سەرەکی و گرینگ لە تیۆریی پاشکۆبووندا، «ئابوورییە« کەوا لەوێدا شێوەی پەیوەست بوون و تێکەڵاوی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە سیستەمی جیهانی سەرمایەداری گرینگی هەیە و ئەم تێکەڵ بوونە کاریگەری زۆری لەسەر گەشەی وڵاتانی جیهانی سێیەم داناوە. مێتۆدی دووەم جەختی لەسەر «سیاسەتەکان» هەیە. ئەم لایەنەی تیۆریی پاشکۆبوون بە دوای نەبوونی هاوسەنگی لە دەسەڵات و پاشکۆبوونی بەرامبەرە و چەنەلێدان لە نێوان باکوور و باشوور بۆ دەستنیشانکردنی یاساکانی سیستەمی ئابووریی

نێونەتەوەیی دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەگەرچی هەر دوو لایەنی ئابووری و سیاسیی تیۆریی پاشکۆبوون لە هزرێکی یەکە سەرچاوەیان گرتووە، بەڵام هەر کام بە شێوەی جیاواز هەوڵ دەدات خاڵە لاواز و بەهێزەکانی ڕوانگەی پاشکۆبوون بۆ گەشەی جیهانی سێیەم و پێوەندیی باکوور – باشوور هەڵسەنگێنێ، (٥٨)

ڕەهەندی ئابووری پاشکۆبوون دەڵێ: سەرمایەداری پاشکۆ کەوا لە ڕێگەی کۆلۆنیالیزمی بازرگانی و سەرمایەگوزاری باکوور لە باشوور پێناسە دەکرێ، لەگەڵ ئەو جۆرە سەرمایەدارییە پاشکۆیانە کەوا لە باشوور پەرەی سەندووە، جیاوازی هەیە. پاشکۆبوونی ئابووری جیهانی سێیەم بە بازرگانی و سەرمایەگوزاری باکوور و هەروەها دۆخی لاوەکی ئەوان لە دابەشکاری نێونەتەوەیی کار، گەشەی جیهانی سێیەمی سنووردار کردووە و بۆتە هۆی نەبوونی ڕێکوپێکی و هاوسەنگی لە باشوور.

ڕەخنەگرانی تیۆریی پاشکۆبوون لەسەر ئەم باوەڕەن کەوا ئەم جۆرە بانگەشانە کێشەی فیکری و کردەیی ساز دەکەن. (٥٩) یەک نموونە لەم کێشانە کە پێوەندیی بە پاشکۆبوون هەیە کاریگەری کۆمپانیا فرەنەتەوەکان و متمانەی زیادە لە ڕادە، بە تەکنۆلۆژی و بازرگانی بیانییە کە هەمیشە وڵاتانی جیهانی سێیەم لە وڵاتە گەشەسەندووەکان جیا دەکاتەوە. بۆ وێنە، کانادا زیاتر لە هێند پشتبەستوو بە سەرمایەگوزاری ڕاستەوخۆی بیانییە. جگەلەوە، بە خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانەی کە لە بابەت پاشکۆبوون نووسراوە دەتوانین نایەکسانییە گەورەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە بۆ زۆربەی وڵاتە «لە حاڵی گەشەکاندا» دێتە گۆڕێ و ئازاریان دەدا، پێشبینی بکەین، کارێک کە بۆ وڵاتە ئەورووپییەکان ١٥٠ ساڵ لەمەوبەر ئاشکرا بووە. بە گشتی ئەم کێشەیە دەربڕی ئەوەیە کەوا ئەو نایەکسانی و لاڕێیانە کە هۆیەکی بۆ پاشکۆبوونی بیانی دەگەڕێننەوە لە تایبەتمەندییەکانی قۆناغە سەرەتاییەکانی گەشەی سەرمایەدارییە.

نووسـەرانی پاشـکۆبوون ڕەنگـە وڵام بدەنـەوە کـە بازرگـانی بـاکوور – باکوور لەگەڵ بازرگانی باکوور – باشـوور جیاوازی هەیە. بازرگـانی وڵاتـە باکوورەکـان لەگـەڵ یـەکتر کەلوپەلـە سـازکراوەکان لـە خـۆدەگرێ، بـەڵام بازرگـانی بـاکوور – باشـوور بـە پێچەوانـە، ئـاڵوگۆڕی مـاددە سـەرەتاییەکان لەگەڵ کەلوپەلـە سـازکراوەکان لـەخۆدەگرێ و ئـەم بابەتـە بۆشـاییەکی قـووڵ ساز دەکات. بە پێی ئەم بانگەشەیە دابەشکاری جیهانی کـار کـە ئێسـتا هەیـە خەساری زۆر بە ئابووری وڵاتە باشوورەکان دەگەیەنێ.

ئەگەرچی لەم ساڵانەی دووایی شاهیدی خراپتر بوونی پێوەندیی ئاڵوگۆڕ لــە نێــوان باشــوور و بــاکوور بــوین، بــەڵام خوێندنــەوەکانی دیکــە کــەوا مەودایـەکی زەمـەنی درێژتریـان لەبـەر چـاو گرتـووە نایەکسـانی ئاڵوگۆڕ لـە نێـوان بـاکوور و باشـوور کـەمتر پشـت ڕاسـت دەکەنـەوە. نرخـی کەلوپەلـە سەرەتاییەکان لە بەراورد لەگەڵ کەلوپەلە سازکراوەکان، بەرزبوونەوە و نزم بوونـەوەی زیـاتری بـە خۆیـەوە دیتـووە؛ ئـەوە شـێوازێکە کـە هەنـدێک جـار بەرەکـەت و هەنـدێک جـار قـات و قـڕی دێنـێ بـۆ ئـەو وڵاتانـەی کـە تـەنیا هــــەناردەی ســــەرەکی ئــــەوان مــــاددە ســــەرەتاییەکانە. بــــەڵام شــــاهیدە ئەزموونییەکان بە ئێمە ناڵێن لە سەدەی بیستەم نرخـی مـاددە سـەرەتاییەکان لـە چـاو نرخـی کەلوپەلـە سـازکراوەکان کـەم بۆتـەوە. تەنانـەت ئەگـەر ڕەوتـە پێوەندییـەکانی ئـاڵوگۆڕ بـە قـازانجی کەلوپەلـە سـازکراوەکان بـێ، کاریگـەری ئەم دۆخە ئاڵۆزتر دەبێتەوە؛ بە هۆی ئەوەی کە هەندێک لە وڵاتـە نێوەندەکان وەکو ئەمریکا پشتبەستوو بـە کەلوپەلـە سـەرەتاییەکان وەکـو بەشـی بنـەڕەتی هـەناردەی خۆیـانن، لـە حاڵێکـدا هەنـدێک لـە وڵاتـە »لـە حـاڵی گەشـەکان» بـە تایبـەت لــە ئاسـیای ڕۆژهــەڵات وەکـو هەناردەکــەری ســەرەکی کەلوپەلــە سازکراوەکانیان لێهاتووە.

ڕەنگـە گـەورەترین کێشـەی تیـۆریی پاشـکۆبوون ئـەوە بـێ کـە نـاتوانێ ئەزمونە زۆر جیاوازەکانی گەشەی جیهانی سێیەم بە باشی شـی بکاتـەوە. لـە کاتێک کەوا زۆر لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بە دەست هەژارییەوە دەناڵێن و

کەلێنی ئەوان لەگەڵ وڵاتە باکوورەکان ڕوو لە زیادبوونە، گرووپێکی تر لە وڵاتە بەرەو گەشەکان، ئابوورییەکی چالاکیان هەیە. ئەو وڵاتانە لە ئاسیای ڕۆژهەڵات دان و بە وڵاتە نوێ پیشەسازییەکان ناسراون. ئەم وڵاتانە بە سیستەمێکی ئابووری جیاواز گەشەیان کردووە و بە ڕادەیەکی بەرچاو لەسەر بەرهەمهێنان و بازرگانی کەلوپەلە سازکراوەکان دامەزراون و تەنانەت هەندێک لەوان وەکو دامەزرێنەرانی تەکنۆلۆجی نوێ ناوبانگیان دەرکردووە.

جگە لەوە، وڵاتانی ناوبراو زیاتر لەوەیکە پشتبەستووو بە یارمەتی زیادە لە ڕادەی باکوور بن، بە یەکگرتوویی نێوخۆی خۆیان پشتبەستووون و لە ڕێگەی تێکەڵ بوون بە سیستەمی ئابووری نێونەتەوەیی گەشەیان کردووە، ئەوە لە حاڵێکدایە کە ستراتیجی ئەم وڵاتانە بە مانای سەرکەوتووبوونی وڵاتانی جیهانی سێیەمی دیکە نییە. لەوە دەچێت جەوهەری سیستەمی ئابووری نێونەتەوەیی ئەگەری گەشە بۆ هەندێک وڵاتی جیهان سێیەم دیڵێتەوە. لە ڕاستیدا، ئەو سنورە بیانییانەی کە بۆ وڵاتە »نوێ پیشەبووەکان » دانرابوو هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ سنوورە بیانییەکانی وڵاتانی تر نەبوو. دۆخی سەرکەوتووی سەرەوە دەبێ سەرنجی ئێمە بەرەو لایەنە نێوخۆیەکانی گەشە ڕابکێشێ.

بۆچوونێکی تری تیۆریی پاشکۆبوون جەخت لەسەر ئەم بابەتە دەکات کەوا دەسەڵاتی سیاسی باکوور و باشوور جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە. باکوور خاوەن هێزێکی میلیتاری یەکجار بەهێزتر لە باشوورە. ناکۆکییە ئابوورییەکان پێشتر بە شێوەی زۆرەملیانە چارەسەر دەکرا؛بەو هۆیەوە چەنەلێدانی باکوور – باشوور بە شێوەی ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری فۆڕمەکانی دیکەی دەسەڵات دایە.

باکوور لە ڕێگەی «پێوەندیی ناهاوشێوەی پاشکۆبوونی ئابووری» گوشار دەخاتە سەر باشوور. ئەم پاشکۆبوونە بریتی لە: بازرگانی، سەرمایەگوزاری و پێوەندییە بەرامبەرە ئابوورییەکانی دیکە لە نێوان ئەو

دوو وڵاتــە دەبــێ، بــەڵام یــەکێک لــەو وڵاتانــە پێویســتییەکی زیــاتری بــەم پێوەندییيانە هەیە. ئەگەر ئەم پێوەندییيانە بە هەر هۆیەک بپچڕێ، ئەو وڵاتەی کـەوا پێویسـتییەکی زیـاتری بـەم پێوەندییيانـە هەیـە زیـاتر لـەو وڵاتـە کـەوا پێویســتی کــەمتری هەیــە، تووشــی خەســار دەبــێ. ئــەو وڵاتــەی کــەوا پاشکۆبوونێکی کەمتری هەیە دەتوانێ گوشار بخاتە سەر لاوازی ئەو وڵاتە کەوا پاشکۆبوونی زیاتری هەیە و لەو هۆکارە وەکو سەرچاوەی دەسەڵات و یا کاریگەری دانان کەڵک وەرگرێ. (٦٠)

نموونەیەکی گریمانـەیی دەتـوانێ یارمـەتی بە ڕوونکردنـەوەی ئەم خاڵـە بکـات. واگریمانــە دەکــەین دوو وڵاتــی «A» و «B» پێوەنـدیی بازرگانییــان هەیـە. بەشـێکی بچـووک لـە سـەرجەم بازرگـانی وڵاتـی «A» لەگـەڵ وڵاتـی «B»یە و لە ڕاستیدا بەشـێکی زۆر کـەم لـە داهـاتی نەتـەوەیی وڵاتـی «A» لەخۆ دەگرێ. ئەگەر بازرگانی نێوان «A» و «B» کـەم بێتـەوە، وڵاتـی «A» زۆر کــەم تووشــی خەســار دەبــێ و شــەریکی نــوێ دەگــەڕێ. وڵاتــی «B» بەشێکی زۆر لە بازرگانی خۆی لەگەڵ وڵاتی « A » جێبەجێ دەکات و ئـەو بەشە بەشێکی زۆر لـە داهـاتی نەتـەوەیی پێکدێنێ. کـەم بوونـەوەی بازرگـانی لەگـەڵ وڵاتـی « A » دەبێتـە هـۆی لـەنێوچوونی ئـابووری وڵاتـی «B ». ئـەم حاڵەتــە لــە فــۆڕمی گــەورەکراوی خۆیـدا هــەمان «پێوەنـدیی ناهاوشـێوەی پاشـکۆبوونی ئـابووری»یـە. لاوازبـوونی وڵاتـی «B» و تێکشـکانی ئـەو لـە بازرگانی دەبێتە هۆی سازبوونی سەرچاوەی دەسەڵات بۆ وڵاتی «A» و بە کــەڵکوەرگرتن لــەم فــاکتۆرە، وڵاتــی «B» دەخاتــە ژێــر گووشــارەوە و بۆچوونەکانی خۆی دەسەپێنێ.

تیۆرییـداڕێژانی پاشـکۆبوون لەســەر ئـەم بـاوەڕەن کـەوا ئـەو بابەتـە گریمانەیە، دەتوانێ بە ڕوونی پێوەندییە ئابورییەکانی نێوان زۆر لە وڵاتە باکوورییـەکان لەگـەڵ باشـوور نیشـان بـدات. لـە ئەنجامـدا دەبـێ بگـوترێ لـە چەنەلێدان لـە نێـوان دوو لایـەنی بەرامبـەر بەرژەوەنـدی بـاکوور بـە سـەر باشوردا زاڵە.

**پەراوەێزەکان:**

١- ر. ک: رایان روکس، برو، ***نظریه هاي توسعه نیافتگي***، ترجمه علي هاشمي گیلاني؛ تهران : سفیر، ١٣٦٩.

٢- ***تئوری های توسعه نیافتگي***، ترجمه مصطفي ازکیا، تهران : نشر توسعه، ١٣٧٠، ص ٨٣.

3- ***Kopitalismus und unterenwicklung***, Frankfurt, 1968, S. 29.

4- آلوین. ي. سو، ***تغییر اجتماعي و توسعه***، ترجمه محمود حبیبي مظاهري، تهران : انتشارات پژوهشکده مطالعات راهبردي، 1378، ص 117.

5- کارل دویچ و رابرت کوهن و جوزف ناي، ***نظریه هاي روابط بین الملل***، ترجمه و تدوین وحید بزرگي، جلد اول؛ تهران : نشر ماجد، 1375، ص 358.

6- «ستراتیجی گەشەی نێوخۆ» (inword looking development)، شێوازێکە لە گەشەسەندن کەوا بنەما، سەرچاوە و هەڵوێستی نێوخۆیی هەیە. بە واتایەکی تر لەم شێوازەدا سەرچاوە و دۆخی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کولتووریی وڵاتی لەحاڵی گەشە مەبەستە. بە پێی ئەم شێوازە لە پرۆسەی گەشەسەندن هەوڵ دەدرێ لە لاساییکردنەوەی تەنیا و پاشکۆبوون بە دەرەوە خۆ بپارێزرێ و هەوڵەکان بۆ جێگیرکردنی گەشەیەکی ڕێکوپێک و بەردەوام لە کۆمەڵگەی لە حاڵی گەشەدا چڕ کرێتەوە.

7- مصطفي ازکیا، ***جامعه شناسي توسعه***؛ چاپ سوم؛ تهران : نشر کلمه، 1380، ص 131.

8- جرالد ام مایر و سیرز، دادلي، ***پیشگامان توسعه***، ترجمه سید علي اصغر هدایتي و علي یاسري، تهران: انتشارات سمت، 1368، ص 241.

٩- شێوازی گەشەی دەرەکی (outword looking development) کە بە شێوازی گەشەسەندنی ڕۆژئاوایی ناوبانگی دەرکردووە، جۆرە شێوازێکە لە گەشەسەندن کەوا لە پاش شەڕی جیهانی دووەم زۆربەی وڵاتە

گەشەنەسەندووەکان وەکو بەرازیل، کوریای باشوور، ئارژانتین و کێنیا تاقیان کردەوە. ئەو خاڵانەی کەوا لەم شێوازەدا دەکەونە بەرچاو بریتین لە:

١) ئەم شێوازە لە گەشەسەندن، سەرچاوە و هەڵوێست گرتنی ڕوو بە دەرەوەیە.

٢) شێوازێکە کەوا بە پێی ئەزموونەکانی وڵاتە ڕۆژئاوییەکان کار دەکا.

٣) پڕۆگرامە چاکسازییەکان لەم شێوازەدا پشت بە سەرمایە بیانییەکان و ڕێنوێنی دەوڵەت دەبەستێ.

10-See to:Ronald. H chilcote, ***Theories of comparative politics; The search for a parodiym***. (Boulder, Colorado: westview press, 1981).

11- کارل دویچ و ڕابێرت کوهێن و جۆزێف نای، ***سەرچاوەی پێشوو***؛ لا ٣٦٠-٣٦١.

12- رونالد چیلکوت، ***نظریه هاي توسعه و توسعه نیافتگي*** : درآمدي بر مسائل اقتصادي و سیاسي كشورهاي جهان سوم، ترجمه و تلخیص احمد ساعي، تهران: نشر علوم نوین، 1375، ص33.

13-R. Perbisch, ***Une strategie developpment economique*** , pariss, 1962.

14- درباره ***« مبادله نابرابر»*** به ویژه رجوع شود به : پربیش، امانوئل، سمیر امین، پالوا در ***سنگهاوس*** و صفحات 98-77.

١٥-***هەمان سەرچاوە***، لا ١٠٢.

16-Werner Sombart , ***Der Moderne kapitalismus*** , Bd. 36 Munchenl deipzig 1928. 162.

17-Werner Sombart. ***Ebd.*** S. 165.

١٨-هەڵبەت پرسیاری گرینگ ئەوەیە کەوا پێش هاتنی سەرمایەی بیانی و لە ڕاستیدا پێش «سەرهەڵدانی پێوەندییە سەرمایەدارییەکان»لە کۆمەڵگە کەمەرەکان، ئەو کۆمەڵگەیانە تا چ ڕادەیەک ئەگەری گەشەی نێوخۆیان هەبووە. ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەی جددی و هەمەلایەنەی پێویستە.

19-احمد ساعي، ***مسئل سیاسي – اقتصادي جهان سوم***، چاپ ششم، تهران، انتشارات سمت، 1382، ص29.

٢٠- چیلکۆت، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٤١.

٢١- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٤٣.

22-احمد ساعي، ***درآمدي بر شناخت مسائل سياسي و اقتصادي جهان سوم، قدرت و نابرابري***، چاپ پنجم، انتشارات قومس، ص 100.

٢٣- ***هەمان سەرچاوە***، لا ١٠١.

24- Diana arendt , ***Tradition und Neu zeit in klassiker politischen denkens***, B. d. 11 Munchen , 1968.

25- ***Ebd***. S. 193-194.

26- W. Lenin , 1 : ***Staat und Revolution*** , Berlin , Ditzrerlag,1970.

27- Antonio Gramasci , ***Philosophie der Prazis*** , Frankfurt Fischer , 1967.

28- Gransci , ***Ebd***. S. 151.

29-ر. ک: تي دوس سانتوس، ***« بحران نظريه توسعه و مسايل وابستگي در آمريکاي لاتين »***، ترجمه گيتي اعتماد و ***«توسعه و توسعه نيافتگي»***، « مجموعه مقالات» گردآوري شده توسط گروه تحقيقات و مطالعات شهري و منطقه اي، نشر ميزان، 1358، ص 52.

30-R. Perbisch,***Versa une Strategie glahale developpment Nationsunies*** , 1968.

31-ر. ک: کتاب ***عقب ماندگي اقتصادي در آمريکاي لاتين و برخي از مسايل اساسي آن***، 1962 ف ص 24-1، فوتاردو، «توسعه و توسعه نيافتگي »، ترجمه گيتي اعتماد، انتشارات دانشگاه ملي، فصل پنجم.

32-C,Furtado , ***Developpment et saus developpment*** ,paris, 1964.

33-A. C. Hirschmann , ***Strategie du developpment economique*** , Paris, 1964.

34-M. Santos,***la Specificite de lespace en pays sous - developpes***, 1969.

35-D. Senghaus , (Hrsg) ***imperialismus and strukturelle gewalt analis*** uber ***Abhangige Reproduktion***, Frankfurt , Suhr kamp , 1972.

36-Ders: ***Weltwirtschaft , und Entwichlungs politik*** , Frankfurt suhr kamp, 1977.

37-Ders;Ulrich Menzel (Hrsg), ***Multinationale konzerne und die Drittewelt***, wisbaden , 1976, s. 301.

٣٨- احمد ساعي، ***درآمدي بر شناخت مسايل اقتصادي – سياسي جهان سوم***، ص ١٠٥.

39 -Paul Baran , ***Politische okonomie des witschaft wachstum Neu wied*** , Berlin, 1971.

40- Furtado. C. ***Ebd***. p. 319.

٤١- گئـــوركی پلخـــانۆف (١٩١٨-١٨٥٦)يـــەكێك لـــە دامەزرێنـــەرانی ماركســـيزمی روســـی بـــوو و كاريگـــەری لەســـەر لێنـــين هـــەبوو. ئـــەو سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئێسكيرا بوو.

42- Perbisch. R. ***Ebd***,. s. 200.

43- دايانا هانت، ***نظريه هاي اقتصادي توسعه***، تحليل الگوهاي رقيب، ترجمه غلامرضا آزاد ارمكي، چاپ تهران، نشر ني، 1376، ص 227.

44-F. Cardoso , ***Abhangigkeit and Entwicklung in Lateinamerika in diter*** , senghaas Frankfurt. M. 1977, S. 101.

45-Poul. A. Baran and Paul sweuzy , ***Monopol Kapital Ein Essay uber die Amerikanishe wirtschafts und gesefschafts ordnung*** , Frankfurt. a. M. 1973. S. 92.

٤٦- چيلكۆت، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٦٢ – ٥٤.

٤٧- ***هەمان سەرچاوە***، لا ١٠٨.

48- John Neill, ***introduction : Marxism and the Sociological imagination***, p. xxiii.

٤٩- هانت، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٧٨.

50- A. Frank , ***kapitalismus und unter Entwicklung in Lateinamerika*** , Frankfurt , 1968, S. 42-48

51- Frank. A. ***Ebd*** , S. 62.

52- A. Frank , ***Kapitalismus und unterentwicklung in L. A. Geschichte chile und Bresil***. 1967.

٥٣- چيلكۆت، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١١٩.

54- حسين سيف زاده، ***نظريه پردازي در روابط بين الملل***، تهران، انتشارات سمت، 1376، ص 108.

55- آندره گوندر فرانك، «مصاحبه با فصلنامه فرهنگ»، سال دوم، شماره 3، بهار 1371، ص 33؛ فرانك، ***منبع پيشين***.

56- فرانك، آندره گوندر فرانك، مصاحبه، ***فصلنامه راهبرد***، سال دوم، شماره 2، زمستان 1372، ص 172.

57- Samir Amin , ***Zu Theorie von Akumulation und Entwicklung in der gegenwar tigen Welt geselschaft*** , in : Senghaas , Frankfurt , Main, 1972, s. 41.
58- Smair Amin , ***Die Ungleiche Entwicklung*** ,Hambung , 1973 , s. 205.
59- ر. ک: گیلرمو اودانل، علوي، ***هامیلتون در زونتاک***، صص 231-211.
60- M. Santos , ***Lespecificite de lespace pays. saus – developpesm*** , 1969. P. 318.

# ڕێبازی سیستەمی جیهانی

«تیۆریی سیستەمی جیهانی» یەکێک لەو تیۆرانەیە کەوا لە دەیەی ١٩٧٠ تا ئەمڕۆ توشی ئاڵوگۆڕی زۆر هاتووە. لە دەیەی ١٩٧٠ زۆربەی چەپەکان، شۆڕشییەکان و ناڕازییە سیاسییەکانی وڵاتە جۆراوجۆرەکان لایەنگریان لەم تیۆرییە دەکرد.

بە هۆی ئەوەی کە تیۆریی «پاشکۆبوون» جەختی یەکجار زۆری لەسەر هۆکاری بیانی، وەکو بەربەستی سەرەکی گەشەسەندنی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەکرد، ئەو بیرمەندانەی کەوا بە پێی زانیارییە نوێیەکانی کۆمەڵناسی گەشە، بە دوای هۆکارە نێوخۆکانی گەشەنەسەندوویی دەگەڕان، بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانییە »تیۆریی سیستەمی جیهانی».

لە تیۆریی نەریتی پاشکۆبووندا، وڵاتە نێوەندە پیشەسازییەکان وەکو سەرچاوە و هۆکاری سەرەکی هەژاری و دواکەوتوویی جیهانی سێیەم دەژمێردران. بەپێی بۆچوونی ئەم تیۆرییە تەنیا بوونی پێوەندیی لە نێوان نێوەند و کەمەرە و چوونە دەرەوەی زێدە و توانا ئابوورییەکان لە وڵاتە کەمەرەکان دەبێتە هۆی دواکەوتوویی کەمەرە.

بەڵام سەرکەوتنی شێوازە نوێیەکانی گەشەی ئابووری کە لەسەر بنەڕەتی پێوەندیی لەگەڵ نێوەند بوو، دادوەری لایەنگرانی تیۆریی پاشکۆبوونی توشی قەیران کرد. هەر بەم هۆیەوە لە دەیەی ١٩٧٠ و لە ژێر کاریگەری هەندێک بابەتی تر وەکو، سەرهەڵدانی کۆمەڵگە نوێ پیشەبووەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات، قەیرانی دەوڵەتە سوسیالیستەکان و داڕمانی ئابوری جیهانی سەرمایەداری، «تیۆریی سیستەمی جیهانی» کە سەرچاوەی لە ڕوانگەی پاشکۆبوون وەرگرتبوو، پێشکەش کرا. ئەم تیۆرییە

جگـە لەوەیکـە »ئـابووری جیهـانی» وەکـو تـەوەرەی سـەرەکی و «یەکـەی شـیکردنەوە« دانـابوو، هـەروەها سیسـتەمی مێژوویـی لەسـەر بنـەڕەتی سـێ تـوێژ و جەمسـەری «نێوەنـدی»، «نیوەکەمـەرە« و «کەمـەرە« خسـتە بـەر بـاس و لێکۆڵینـەوە. بـەپێی ئـەم تیۆرییـە سـەرجەم ڕووداوە کۆمەڵایەتیـەکان دەبێ لـەنێو دەقـی یـەک سیسـتەمی جیهـانی شـیکرێنەوە. هـەروەها سـەرجەم تایبەتمەندییەکانی ناو یەک سیستەم پێوەندییان بە یەکترەوە هەیە و هەروەها سـەرجەم ڕووداوەکـانی نـاو سیسـتەم دەتـوانین لـە ڕێگـەی هۆکـارە نێوخۆکانەوە شرۆڤە بکەین. بە پێی ئەم شیکارییە، سیستەمی نوێی جیهانی خاوەن تایبەتمەندییە کاتی و جێگەیەکانە. تایبەتمەندی جێگەیی (دابەشکاری جوگرافیایی و ژێئۆپۆلیتیکی)، سیستەمی جیهانی بە نێوەند، نیوەکەمەرە و کەمـەرە پێناسـە دەکـات و هـەر کـام لەوانـە ڕۆڵ و کاریگـەری ئـابووری جیاوازیان هەیە و لەوێدا پێوەندیی چەوسێنەرانە لە نێوان ناوچە دەوڵەمەند و هەژارەکان شرۆڤە دەکرێ. تایبەتمەندی کاتی سیستەمی جیهانی بریتییە لە سەردەمەکان، پرۆسەکان، ناکۆکییەکان و قەیرانەکان کەوا ڕەوشە کراوە و بەسراوەکانی جیهان نیشان دەدا.

هەڵبـەت هـەر وەکـو لـە بەشـەکانی داهـاتوودا باسـی دەکـەین، تیـۆریی «سیستەمی جیهانی» تەنیا بە دوای شیکردنەوەی چەمک و جێگەی گەشە لە ئاستی نێونەتەوەییدا نییە، بەڵکو دەیهەوێ لەگەڵ ناسینی سیستەمی جیهانی، لایەنەکانی جۆراوجۆری ژیانی مرۆڤ هەروەها بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ستراتیژی نوێی ئەم تیۆرییداڕێژانە بە پێچەوانەی بوونی هەندێک بنەمای هاوبەش لەگەڵ تیۆریی پاشکۆبون، ڕەهەندە تازەکان و مێژووی سیستەمی جیهانی لەخۆ دەگرێ. لایەنگرە جیاجیاکانی ئەم تیۆرییە ئەگەرچی لەمەڕ ئەم ڕەهەندانە بیروڕا و لێدوانی جیاجیان هەیە، بەڵام هەروەها خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە.

لـەم بەشـەدا پـێش سـەرقاڵ بـوون بـە پۆلێنبەنـدی پرەنسـیپ و بنـەما تیۆرییەکانی سیستەمی جیهانی بە پێی بۆچوونی بیرمەندی سەرەکی ئەم

ڕێبــازە واتــە »ئێمانۆیــل والڕشــتاین»، بــە کــورتی لایەنــە هاوشــێوە و ناهاوشـێوەکانی ڕوانگـەکانی ڕێبـازی »نوێسـازی» و «پاشـکۆبوون» لەگـەڵ ڕێبازی «سیستەمی جیهانی» دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

**بەراورد کردنی تیۆریی سیستەمی جیهانی لەگەڵ ڕوانگەکانی نوێسازی و پاشکۆبوون**

بــە ڕای «ئیمانۆیــل والڕشــتاین» ڕوانگــەی «سیســتەمی جیهــانی» دوو جیاوازی سەرەکی لەگەڵ تیۆرییەکانی ڕێبازی نوێسازی هەیە؛ یەکەم ئەوەی کە شێوە بیرکردنەوەی ڕێبازی سیستەمی جیهانی «دیالکتیکی»یە، لە حاڵێکدا لایەنگرانی ڕێبازی نوێسازی شێوە بیرکردنەوەیەکی «میکانیکی»یان هەیە؛ دووەم ئـەوەی کـە ڕێبـازی سیسـتەمی جیهـانی بـە پێچەوانـەی تیۆرییـەکانی ڕێبـازی نوێسـازی کـە تـەنیا نموونـەی ئـەورووپا بـۆ گەشـە پێناسـە دەکـات، سەرنجی لە سەر نمونە جیاجیاکانی گەشە هەیە. [(١)]

جگە لە جیاوازییەکانی نێوان ڕوانگەکانی سیستەمی جیهانی و نوێسازی، ناکۆکی و جیاوزی بنەڕەتی هەروەها لـە نێوان ئـەم ڕوانگەیە لەگـەڵ ڕێبـازی پاشـکۆبووندا هـەیـە. لێرەدا بـە یارمـەتی وەرگـرتن لـە شـێوازی « ئـالوین. ی. سو» لە کتێبی « گۆڕانی کۆمەڵایەتی و گەشە « هەوڵ دەدەین بە کورتی و لە خشتەیەکدا ئەم ناکۆکی و جیاوازیە لێکبدەینەوە. [(٢)]

| ڕێبازی سیستەمی جیهانی | ڕێبازی پاشکۆبوون | |
|---|---|---|
| سیستەمی جیهانی | دەوڵەت - وڵات | یەکەی شیکردنەوە |
| پشـکنینە مێژووییـەکانی سیسـتەمی جیهـانی: سیسـتەمی خولـەکی و پرۆسە درێژخایەنەکان | بنەمایی – مێژوویی: گەشە و وەسـتانی دەوڵـەت – نەتەوەکان | مێتۆدۆلۆژی |
| شـێوازی سـێیانە: (نێوەند | شێوازی دووانە: (نێوەند – | بنەمای هزری |

| | | |
|---|---|---|
| | کەمەرە) | – نیوەکەمەرە – کەمەرە) |
| تەوەرەی پشکنینەکان | کەمەرە | نێوەند– نیوەکەمەرە – کەمەرە و هەروەها ئابووری جیهانی |
| لایەن و ڕێگەی گەشە | دەستنیشانکەر: پاشکۆبوون بە گشتی دەبێتە هۆی خەسارگەیاندن | ئەگەری جوولەی ستونی (ڕوو لە سەرێ «گەشەسەندن» و ڕوو لە خوارێ «وەستان») لە ئابووری جیهانی |

بە پێچەوانەی ڕێبازی پاشکۆبوون کە »یەکەی شیکردنەوە»ی خۆی لەسەر بنەڕەتی دەوڵەت – نەتەوەکان دادەنێ، ڕوانگەی سیستەمی جیهانی، سیستەمی نێونەتەوەیی وەکو؛ «یەکەی شیکردنەوە«ی خۆی پێناسە دەکات. پێش گریمانەی سەرەکی ڕوانگەی سیستەمی جیهانی ئەوەیە، کەوا جیهانی نوێ لە یەک ئابووری جیهانی سەرمایەداری پێکهاتووە و دەوڵەت – نەتەوەکان وەکو، بەشەکانی ئەو سیستەمە گشتییەن. بۆیە بۆ تێگەیشتن لە ناکۆکییە چینایەتییەکانی نێوخۆ و تێکهەڵچوونە سیاسییەکانی یەک دەوڵەتی تایبەت دەبێ ئابووری جیهانی بناسین. «والرشتاین» لەم بارەیەوە دەڵێ:

***بەو پێیە کەوا «سیستەمی جیهانی» بە جیات وڵات، نەتەوە یا جەماوەر وەکو یەکەی شیکردنەوەی خۆمان پەسەند بکەین، دەبێ گۆڕانکاری زۆر لە ئەنجامی پشکنینەکانی خۆمان چاوەڕوان بکەین. ئاشکراتر لە هەموو شتێک ئەوەیە کەوا سەرنجی ئێمە بە جێی تایبەتمەندییە وەسفییەکانی دەوڵەتەکان، دەچێتە سەر تایبەتمەندییە پێوەندییەکانی ئەوان. هەروەها، بە جێی ئەوەی کە چین و گرووپەکان وەکو، گرووپە نێوخۆکانی یەک وڵات چاو لێبکەین، ئەوان وەکو گرووپەکانی ناو ئابووری جیهان چاو لێدەکەین.***(٣)

به پێچەوانەی ڕێبازی پاشکۆبوون کەوا لە بنەڕەتدا سەرنجی خۆی خستە سەر گەشە و وەستانی دەوڵەت – نەتەوەکان، ڕێبازی سیستەمی جیهانی، پشکنینە ئابوورییە جیهانییەکانی بە درێژایی مێژوو خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە. «والرشتاین» وەبیرمان دێنێتەوە کە کامڵ بوونی ئابووری جیهانی سەرمایەداری بە هۆی ئەو پرۆسە دوور و درێژانەی ***ئاوێتەبوون، بە بازرگانی کردنی کشتو کاڵی، گەشەی پیشەسازی و گۆڕانی وزەی کار بە کرێکارە مووچەخۆرە پیشەسازییەکان***، پێک هاتووە. ئابووری جیهانی سەرمایەداری لە لای ئەم پرۆسە درێژخایەنە، هەموو کات بە هۆی نەبوونی هاوسەنگی و هاودەنگی نێوان داواکاری جیهانی و پێشکەشکردنی جیهانی کەلوپەلەکان، ملکەچی یەک سیستەمی خولەکی بووە کەوا لە دوو دۆخی گەشە و وەستان پێک هاتووە. هەرکات ڕادەی پێشکەشکردنی جیهانی کەلوپەلەکان زۆرتر لە ڕادەی داواکارییە جیهانییەکان بێ، یان هەرکات کەلوپەلی زۆر لە بازاڕ هەبێت بەڵام کڕیاری پێویستی بۆ کڕین نەبێ، لە ئەنجامدا کارخانەکان دادەخرێن و کرێکارەکانیان بێکار دەبن. لە دۆخێکی وەهادا، ئابوری جیهانی تووشی وەستان دەبێ. لە وەها قۆناغگەلێک نێوەند کۆنترۆڵی لەسەر کەمەرە کەم دەبێتەوە و بەم جۆرە کەمەرە دەتوانێ بە گەشەی سەربەخۆ بگات و بەرەو هاوسەنگی لەگەڵ نێوەند هەنگاو بنێ. کەوایە ئەم قۆناغە دابەزینە وەکو، دیسان دابەشکاری زێدەی جیهانی لە نێوەندەوە بۆ کەمەرە وایە. لەگەڵ ئەوەش، لە پاش سەردەمێکی تا ڕادەیەک درێژماوەی وەستان، بەرهەمهێنان لە نێوەند لە ئەنجامی پێشکەوتنە تەکنیکییەکان و زۆربوونی داواکاری لە لایەن وڵاتە کەمەرەکان، دیسان دەبووژێتەوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ڕادەی داواکاری جیهانی لە ڕادەی پێشکەشکردنی جیهانی پێش دەکەوێ، دیسان گەشەی ئابووری بەڕادەیەکی زۆر دەست پێدەکات. لە درێژەی خولە ئابوورییە گەشەکان، نێوەند هەوڵ دەدا هێز و دەسەڵاتی خۆی دووبارە بە دەست بێنێتەوە و کەوایە بە

مەبەستی زاڵبوون بە سەر بازاڕە جیهانییەکان، کۆنترۆڵی خۆی بەسەر کەمەرەدا زیاتر دەکات. [٤]

لەگەڵ ئەوەش، گەشەی ئابووری بۆ هەمیشە بەردەوام نابێ و لە پاشان زۆربوونی بەرهەمهێنانی بە دواوە دەبێت. لە هەر کام لەم خولە دابەزین و بەرزبوونەوانەی ئابووری جیهان، دەرفەتی زۆر بۆ پێشکەوتن، زیادکردن و گەشە لە کەمەرە و ئەگەری زۆر بۆ دواکەوتوویی نێوەند ساز دەبێ. بەو پێیە شێوازی ناوبراو، شێوازێکی چالاکە، بە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت – نەتەوەکان هەمیشە تاقی دەکرێنەوە و لە هەر قۆناغێکی ئەم « گەشە خولەکییە « لەوانەیە بەرەو نێوەند بەرز ببنەوە و یان بەرەو کەمەرە تووشی دابەزین بن.

سێیەم جیاوازی ئەو دوو ڕێبازە، لەو ڕاستییە دایە، کە ڕوانگەی «سیستەمی جیهانی» بە پێچەوانەی ڕێبازی پاشکۆبوون، «بنەمایەکی فیکری» تایبەت بە خۆی هەیە. لە ڕاستیدا ئابووری جیهانی سەرمایەداری کەوا «والرشتاین» ئاماژەی پێدەکات بە جێی شێوازی دووانە و ساکاری نێوەند – کەمەرە، لە سێ بەشی «نێوەند»، «نیوە کەمەرە« و «کەمەرە« پێکهاتووە بە جۆرێک کەوا بەشی «نیوە کەمەرە« بە جێگیر بوون لە نێوان دوو بەشی دیکە واتە نێوەند و کەمەرە تایبەتمەندییەکانی هەر دووی ئەوانی هەیە.

بە ڕای «والڕشتاین» شیمانەی جمووجۆڵ لەو سێ ئاستە بوونی هەیە؛ بۆ وینە ڕەنگە وڵاتێک کەوا لە ئاستی کەمەرە دایە بۆ ئاستی نیوەکەمەرە بەرز بێتەوە و یان وڵاتێک کەوا لە ئاستی نێوەند دایە بۆ ئاستی نیوە کەمەرە دابەزێ. [٥] بە واتایەکی تر پێشکەشکردنی شێوازی سێ بەشی، دەتوانی لەو لایەنەوە یارمەتی بە »والڕشتاین» بدات کەوا ئەگەری بەرزبوونەوە (گۆڕانی بارودۆخ لە ئاستی کەمەرەیی بۆ نیوەکەمەرەیی، یا نیوەکەمەرەیی بۆ ئاستی نێوەند) و هەروەها دابەزین (گۆڕانی بارودۆخ لە ئاستی نێوەند بۆ نیوەکەمەرە یا نیوەکەمەرە بۆ کەمەرە) لە شێوازی خۆیدا بگونجێنێ.

چـوارەمین جیـاوازی ڕوانگـەی سیسـتەمی جیهـانی لـە پێوەنـدیی لەگـەڵ ڕێبـازی پاشـکۆبوون دەگەڕێتـەوە سـەر دەستنیشـانکردنی ڕێگـەی گەشـە لـە لایەن ئەم دوو ڕێبـازەوە. ڕوانگەی سیستەمی جیهانی «والرشـتاین» ناچێتە ژێر قورسایی هەڵوێستەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون کەوا بە پێی ئەو، کەمەرە بـە هـۆی چەوسـاندنەوە لـە لایـەن نێوەنـد، بـۆ هەمیشـە مـەحکوم بـە گەشەنەسەندن یا گەشەی پاشکۆیە. لایەنگرانی ڕوانگەی سیسـتەمی جیهانی لەسـەر ئـەم بـاوەڕەن کـەوا تاقمێـک لـە وڵاتـانی ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا وەکـو؛ سـەنگاپوور، مـالزی، کوریـای باشـوور، تـایوان و هۆنـگ کۆنـگ توانیویانـە لـە کۆتایی سەدەی بیستەم دۆخی کەمەرەیی خۆیان بە جێ بێڵن.

خاڵی کۆتایی لەم بابەتەوە ئەوەیە کـەوا، ڕوانگـەی سیسـتەمی جیهـانی بـە پێچەوانـەوی ڕێبـازی پاشـکۆبوون کـە تـەنیا سـەرنجی خـۆی دەخسـتە سـەر دۆخی وڵاتە کەمەرەکان، هەروەها سەرنج دەداتە سەر دەوڵەتە سوسیالیستە نوێیەکان، نێوەندە پێشکەوتووەکان و قۆناغەکانی سەرهەڵدان، گەشە (پرۆسـە درێژخایەنـەکان و سیسـتەمە خولەکییـەکان) و دارمـانی ئـابووری جیهـانی سەرمایەداری لە داهاتوودا. (٦)

### ئیمانۆیل والڕشتان و ڕوانگەی سیستەمی جیهانی:

بە وتەی زۆرکەس «ئیمانۆیـل والڕشـتاین» سـەرەکی تـرین و گرینگتـرین بیرمەندی ڕوانگەی سیسـتەمی جیهانییە. ئـەو لـە سـاڵی ١٩٣٠ لـە ئـەمریکا لـە دایک بوو؛ دوکتواری خۆی لە کۆمەڵناسی لە » زانکۆ کۆلۆمبیا » وەرگرت و لـە زانکۆکـانی «کۆلۆمبیـا»، «مـەک گیـل»و «زانکـۆ دەوڵـەتی نیۆیـۆرک» خـەریکی وانـە گوتنـەوە بـوو. سـەرەتا بـە هـۆی پشـکنینەکانی لەمـەڕ ئـەفریقا ناوبانگی دەرکرد (٧) و پاشان سەرنجی خۆی بە شیکاری مێژووی سـازبوون و گەشەی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری دا. والڕشتاین لە کـاتی نووسـینی ڕوانگـەی سیسـتەمی جیهـانی، بـە توونـدی لـە ژێـر کاریگـەری وێـژەی نـوێ مارکسیستی لە بابەت گەشـەدا بـوو. بۆ وێنە، ئەو وێڕای نـاوبردنی زۆر لـە

چەمکەکانی ڕێبازی پاشکۆبوون وەکو؛ ئالوگۆڕی نایەکسان، پێوەندیی کۆلۆنییانە – چەوسێنەرانەی نێوەند و کەمەرە و بازاڕی جیهانی، لە ڕوانگەی سیستەمی جیهانی خۆیدا زۆر لە پرنسیپ و باوەڕەکانی ڕێبازی پاشکۆبوونی پەسەند دەکرد. لەوانە ئەم بۆچوونە کەوا دەڵێ «فۆرمە فیئۆدالییەکانی بەرهەمهێنان وەکو لایەنی جیاکەرەوەی بەشی سەرەکی مێژووی ئەمریکا، بەرهەمی بەردەوام بوونی سەردەمی ڕابردوو نەبوو، بەڵکو زیاتر بە هۆی پێوەندیی ئامریکای لاتین لەگەڵ جیهانی نێوەند لە قۆناغە تایبەتە مێژووییەکان بووە. لە ڕاستیدا والڕشتاین چەمکە سازکراوەکانی «ئاندرێ گوندر فرانک»، «دوس سانتۆس »و «سەمیر ئەمین» لەو لایەنەوە کەوا هەموویان خاوەن یەک هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی دووانە، هەم سەبارەت بە ڕێبازی نوێسازی و هەم سەبارەت بە ڕوانگەی گەشەخوازی مارکسیستین، وەکو بەشێک لە ڕوانگەی سیستەمی جیهانی خۆی پەسەند کردووە. (٨)

وێڕای ئەوەش، وا دێتە بەر چاو کە والڕشتاین لە درێژەی قۆناغە دواترەکانی کاری خۆی، واتە لە کاتی نووسین و تۆکمەکردنی ڕوانگەی سیستەمی جیهانی، لە سنووری ڕێبازی نوێ مارکسیستی پاشکۆبوون تێپەڕیوە. ئەو لەم پڕۆسەیەدا، زۆرتر لە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی مێژوونووسی فەڕەنسی «فرناند برۆدل» و مێتۆدۆلۆژی ئەودا بوو. «برۆدل» لەگەڵ گۆڤاری فەڕەنسی «ئانالز» هاوکاری دەکرد و بە هۆی بڵاوبوونەوەی کتێبی«***شارستانییەتی ماددی، ئابووری سەرمایەداری***» کە لێدوانی لەسەر مێژووی جیهان لە سەدەی پانزدە تا نۆزدە دەکرد، ناوبانگێکی زۆری دەرکردبوو. لە بینگهامتون، «والرشتاین» نێوەندی «فرناند برۆدل»ی بە مەبەستی خوێندنەوە لەسەر سیستەمە ئابووری، مێژوویی و شارستانییەتەکان دامەزراند. هەروەها گۆڤاری «ڕیۆیۆ»ی لە ساڵی ١٩٧٧ بڵاو کردەوە و یەکێک لە ژمارە یەکەمەکانی ئەو گۆڤارەی بە لێکدانە لە سەر

کاریگەرییەکانی ڕێبازی فەڕانسی «ساڵنامە« لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان تەرخان کرد. [٩]

ڕێبازی «ساڵنامە« یا «ئانالز» وەکو دژ کردەوەیەکی ناڕازییانە لە بەرامبەر تایبەتیبوونەوەی لە ڕادەبەدەری زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕوبەرە ڕەسمییەکانی زانکۆ پێکهات. ئەم ڕێبازە بە هۆی کار و چالاکی ڕێبەری زانستی و سەرەکی خۆی واتە »فێرناند بڕودل»، باسەکانی خوارەوەی پێشکەش کرد:

ئامانجی «بڕودل» لە سەرەتا ئەوە بوو کە خەریکی نووسین، گەشەپێدان و چڕکردنەوەی مێژووی «تەواوکەر» یا بە واتایەکی ڕونتر مێژووی «جیهانگیر» بێ. [١٠] بە ڕای برۆدل، مێژوو خۆی وانەیەکی تەواو سەربەخۆ، چروپڕ و بەربڵاو بووە و نابێ ئەو وەکو وانەیەکی پاشکۆ یا پشتبەستوو بە وانە و زانستەکانی دیکە گریمانە بکەین. بە بۆچوونی برۆدل، پسپۆڕ و بیرمەندە مێژووییەکان دەبێ سەرجەم بیروڕاکان بۆ کۆی گشتی ڕووبەری وزەی کۆمەڵایەتی باس بکەن.

برۆدل پاشان لە دوای ئەوەیە کەوا لە ڕێگەی پێداگری لەسەر «خولە درێژخایەنەکان» نێوەندێک لە نێوان مێژوو و زانستە کۆمەڵایەتییەکان ساز بکات. بەم پێیە مێژوو لە حاڵەتی « ڕووداو و گۆڕانکارییە دەگمەن و تایبەتییەکان » (ڕووداونیگاری) دێتە دەرێ و زانستە کۆمەڵایەتییەکان هەروەها سووچێکی مێژوویی بە خۆیان تەرخان دەدەن کە زۆربەی تیۆرییداڕێژە ئەوپەڕ مێژووییەکان لەو بێ بەش بوون. «خولی درێژخایەن» پڕۆسەیەکی مێژووییە و لەوێدا ڕەوتی گۆڕانکارییەکان بە هێوری و ئارامی ڕوو دەدات؛ مێژوویەک کەوا بە شێوەی بەردەوام دووپات بۆتەوە و تەنانەت لە فۆڕمی خولە دووپاتکراوەکاندا خۆی نیشان دەدات. تەنیا لە ڕێگەی خوێندنەوەی خولە درێژەماوەکاندا ڕاستییە گشتییەکان، شاراوەترین توێژ و بەشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، «مێژووی قووڵبین» و بنەما سەقامگیرە ڕاستییەکان بە درێژایی مێژوو ئاشکرا دەبن. [١١]

هـەروەها، «بـرۆدل» هـەوڵێکی زۆری دابـوو بـۆ ئـەوەی کـە نێوەنـدی قورسـایی وتـووێژە مێژووییـەکان لـە »مێـژووی خولـەکان» بـۆ «مێـژووی بابەتی»، یا مێژووی چەماوە بە چارەسەرکردنی کێشـەکان بگوێزێتـەوە. هـەر وەکـو «واڵرشـتاین» وەبیـر دێنێتـەوە، لایـەنی دیـاریکراوی کـاری بـرۆدل، «حەزی ئەو بۆ پێشکەشکردنی پرسیارەکانی «ئێکلا» بوو: پرسیاری وەکو، سەرمایەداری چیە؟ ئەورووپا چۆن توانی بە یەک هێزی سەرتری جیهانی بگۆڕدرێ و. . .»

هـەوڵ و چالاکییـە زانسـتییەکانی «فێرنانـدو بـرۆدل» لـە چوارچێـوەی ڕێبازی «ساڵنامە« بە مەبەستی بە دەستهێنانی «مێژووی گشت بین»، « خوله درێژماوەکان »و «پێشکەش کردنی پرسیارە گشتییەکان»، ژێرخانێکی باشی بۆ «والرشتاین» ساز کرد تا بتوانێ ڕوانگەی سیستەمی جیهانی خۆی لەسەر ئەو دابمەزرێنێ.

تیۆریی سیستەمی جیهانی «والرشتاین» هەروەها لە » تیۆریی گشتیی سیسـتەمەکان » کاریگـەری وەرگرتـووە بـە هـۆی ئـەوەی کـە وەکـو ئـەو، جیاکردنەوەی بوارە جۆراوجۆرە زانستییەکان و هەروەها تایبەتی کردنەوە و بچوک بوونەوەی لە ڕادەبەدەری زانستە نوێیەکان پەسەند ناکات و ئەم شتە وەکو هۆی بچووک بینی و بیرتەسکی زۆر لـە بابەتـەکان دەزانـێ. بـە ڕای «والرشـتاین» زانسـتە کۆمەڵایەتییەکان، بریتییـە لـە مرۆڤ ناسـی، ئابووری، جوگرافیا، زانستە سیاسییەکان و کۆمەڵناسی، کە بابەتگەلی جیا لە یەک نین و ئـەم جـۆرە دابەشـکارییە لـۆژیکی نییـە، بـە هـۆی ئـەوەی کـە جیاوازییـە نێوخۆکـانی (چۆنێتی) هـەرکام لـەو بابەتانـە زیاترە لـە جیاوازییـەکانی نێـوان ئەوان. (١٢)

هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێ کرد «والرشـتاین» کە لـەژێر کاریگـەری «فێرنانـد بـرۆدل» بـوو لەسـەر ئـەم باوەڕەیـە کـەوا مێـژوو و زانسـتە کۆمەڵایەتییەکان بابەتێکی یەکەن، واتە تەنیا زانستێک بوونی هەیە و ئەویش «زانسـتی کۆمەڵایـەتی مێژوویـی»یـە. بـاس لـە مێـژوو (واتـە یـەک زنجیـرە

ڕووداوی تایبەت) بە بێ کەڵک وەرگرتن لە چەمکەکان، ڕووداوەکان و گشتی کەرەکان (زانستە کۆمەڵایەتییەکان) شیمانەی نییە. لە لایەکی دیکە زانستە کۆمەڵایەتییەکان زنجیرەیەک ئیستیقرا لە مێژوو دان و چەمک و ڕووداوەکان لە دۆخی کاتی و جێگەی تایبەتدا، جێی متمانە و باوەڕەن. (١٣)

«والڕشتاین» وەکو « فێرناند بڕۆدل» لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە مەودای نێوان «زانستی کۆمەڵایەتی مێژوویی» و «سیاسەت» زۆر کەمە. بە ڕای «والرشتاین» زانستی کۆمەڵایەتیی مێژوویی بەری لە بەها ناتوانێ بوونی هەبێ. هەڵبژاردنی هەر چوارچێوەیەکی چەمکی، هەڵبژاردنێکی سیاسییە، هەر جۆرە سەلماندنی ڕاستی بە جۆرێک سەلماندنی بەهای ئەوانە؛جگە لەوە باوەڕەکان، تەنانەت چەمکە بەکارهاتووەکانی وەکو؛ چەمکی جیهانی سێیەم، دەنگدانەوەی دۆخی کۆمەڵایەتی لەحاڵی گۆڕانە. بە بۆچوونی ئەو زانستە کۆمەڵایەتییە مێژووییەکان لەگەڵ سیاسەت شتێک لە عەینییەت کەم ناکەنەوە، بە هۆی ئەوەی کە عەینییەت نواندنی گشت وزە کۆمەڵایەتییە جیهانییەکانە. بە ڕای «والرشتاین» مێتۆدۆلۆژی ئەم جۆرە زانستە جەختی یەک لایەنە لەسەر ناسینی ڕووداوە جیاجیاکان یا سازکردنی کەیسە دەرهەستییەکان نییە. ئەم زانستە بۆ ناسین و لێدوان لەسەر جیهانی ڕاستەقینە و دیاردە تایبەتییەکان، لە دەرهەست کەڵک وەردەگرێ. هەر دەرهەستێک بەشێک لە ڕاستی گشتی لەخۆ دەگرێ. پاشان بە کۆکردنەوەی ئەم دەرهەستانە دەتوانین بە وێنەیەکی ڕوون لە جیهانی ئەوپەڕ کات و شوێن بگەین. (١٤) بەگشتی دەتوانین بڵێین «والرشتاین» باوەڕی بە کەڵک وەرگرتن لە مێتۆدە «نێوان وانەییەکان» هەیە.

«والڕشتاین» لە سەرەتای کتێبی «سیستەمی نوێی جیهانی» (بەرگی یەکەم) باس لە کاریگەری وەرگرتنی خۆی لە »کارل مارکس»و «ماکس ڤێبر» دەکات. بە ڕای «والڕشتاین» هەم «کارڵ مارکس» و هەم «ماکس ڤێبر» لەسەر ئەو باوەڕەن کەوا یەک سیستەمی جیهانی سەرمایەداری یەکە بوونی هەیە و بۆیە ئەو ئەم چەمکە لەم دوو بیرمەندە بە قەرز وەردەگرێ.

ئەو چەمکەکانی سەرمایە، پێوەندییە بەرهەمهێنانەکان و کەڵەکەی سەرمایە لە تێپەڕبوونی مێژوو، لە مارکسیزم وەردەگرێ.

یەکێکی تر لەو بیرمەندانی کە والرشتاین بە چەشنێک کاریگەری لێ وەرگرتووە »کارێل پولانی»یە. ستراتیجی «والڕشتاین» لە زۆر بابەتدا وەکو، جیاوازی نێوان بازرگانی و بازاڕ کە دەبێتە هۆی بە ڕێکخراوەکردنی دابەشکاری کار، پێوەندییە تێکچنراوەکانی ناو دەوڵەتەکان و ڕێکخراوە سەرمایەدارییەکان، ئەنجامەکانی زاڵبوونی بازاڕ لەسەر شێوەکانی ژیان و لە کۆتاییدا خولی مێژوویی نێوان بازاڕی ئازاد و بەربەرەکانی لە بەرامبەر ئاکامە خراپەکانی ئەو، زۆر نێزیک بە شێوە بیرکردنەوەی «کارێل پولانی»یە. [١٥]

«والرشتاین» گرینگی زۆری دەدا بە کێشەی تێپەڕبوون لە قۆناغی دەرەبەگایەتی بۆ قۆناغی سەرمایەداری و پاش خوێندنەوەی ڕوانگە جیاجیاکان لەم بابەتەوە، پشتیوانی لە تیۆرییەکانی «ئاندرێ گوندر فرانک» و «پۆل سوئێزی»کرد؛ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەرچی ئەم دوو بیرمەندی بە لایەنگرانی ڕاستەقینەی مارکس دادەنا، بەڵام بە بۆچوونی ئەو «ئەم دوو بیرمەندە لەو شتەی کەوا بە ڕاستی ڕووی دابوو، تێگەیشتبوون».[١٦]

«برۆئێر» کە بۆچوونەکانی «والرشتاین» و «فرانک»ی بەراورد کردبوو، بیروڕای هاوبەشی زۆری لە نێوان بۆچوونەکانیان دۆزیبۆوە، لەوانە:

– هەر دوو بیرمەند، سیستەمی سەرمایەداری وەکو تۆڕێک لە پێوەندییە ئاڵوگۆڕەکان لە ئاستی جیهانی چاو لێدەکەن کە لە ڕێگەی ئەو زێدەی ئابووری لە کەمەرە بۆ نێوەند دەگوێسترێتەوە.

– هەر دوو بیرمەند، بە جێی جەخت لەسەر بنەمای نێوخۆیی و پاژە تایبەتییەکانی سیستەمی ئابووری جیهانی، ئەو وەکو هەمەکییەکی یەکە چاو لێدەکەن و گریمانە دەکەن کەوا سیستەمە بەرهەمهێنەکانی نەتەوەیی یا

خـۆوڵاتی بـە بـەراورد لەگـەڵ بەرهـەمهێنانی جیهـانی پێشـتریێتی لاوەکییـان (اولویت ثانویە) هەیە.

– هـــەر دوو بیرمەنـــد لەســـەر ئـــەم بـــاوەڕەن کـــەوا گـــەشـــە و گەشەنەسەندوویی لایەنە جیاجیاکانی دیاردەیەکی یەکە پێکدێنن و هەر کام دەبنە هۆی سازبوونی ئەوی تر.

بـە بۆچـوونی «برۆئێـر» ئەگـەرچی ئـەم نووسـەرانە ڕۆڵێکـی ئـەرێنی و لەبـەر چاویـان لـەو لایەنـەوە هەیـە کـەوا شـیکردنەوەیان لـە بابـەت گەشەنەسەندوویی بە پێی سیستەمی جیهانی پێشکەش کردووە، بەڵام کاری ئەوان بێ هەڵە نەبووە؛ بۆ وێنە »ناتوانین پێوەندییەکی زۆر لە نێوان چەمکە هەمـەکی و پڕ دەنگ و هـەراکانی ئـەوان و باسـەکانیان لەمـەڕ بابەتـە تایبەتـە مێژووییـەکان بدۆزینـەوە. ئـەوەی کـە لـەم باسـانەدا جێگـەی خاڵییـە، تیـۆریی حەقیقییـە. بـە بۆچـوونی «بروئێـر» ئـەو تیۆرییانـەی کـەوا لەسـەر بنـەڕەتی شـیکردنەوە مارکسیسـتییەکان و لـە پێوەنـدیی لەگـەڵ پێوەندییـەکانی بەرهەمهێنان دامەزراون، دەتوانن ئەم جێگە خاڵییە پڕ کەنەوە«.[١٧]

**بنەمای سیستەمی جیهانی و پرۆسەکانی ئەو:**

والرشـتاین لـە نامیلکـە سـەرەتاییەکانی خۆیـدا، ئـەو چەمکـە سـەرەکیانە پێشکەش دەکا کە لـە خوێندنـەوەی سیسـتەمی جیهـانی سـەرمایەداری کەڵکی لێ وەرگرتـوون. بە ڕای ئـەو سیسـتەمی جیهـانی بریتـی لـە »سیسـتەمێک کە لەوێدا دابەشکاری کاری یەکە و سیستەمە کولتوورییە جیاجیاکان بوونیان هەیە«. (١٨) بە واتایەکی تر سیستەمی جیهانی یەک سیستەمی کۆمەڵایەتییە کە سنوورەکان، بنەماکان و گرووپە ئەندامەکان، یاسای ڕەوایی تایبەت بە خۆیـان هەیـە و سـەرجەم ئـەم پاژانـە لـە ڕێگـەی دابەشـکاری کـار و بـە کەڵکوەرگرتن لە میکانیزمی بازاڕ بە چەشنێک بە یەکترەوە گرێ دراون.

بە بۆچوونی «والرشتاین» دوو چەشـنە سیسـتەمی جیهـانی دەتـوانین لـە درێژایـی مێـژوو پێناسـە بکـەین: ئێمپراتورییـە جیهانییـەکان یـا شارسـتانییەتە

گەورەکانی پێش سەردەمی نوێ وەکو شارستانییەتی چین، میسر و ڕووم و ئەوی دیکە سیستەمە ئابوورییە جیهانییەکانی پێکهاتوو لە وڵاتە نەتەوەییە دەسەڵاتدراەکان و تۆڕی کۆلۆنییەکانی ئەوان وەکو بریتانیای گەورە و فەڕانسە. (١٩)

«والڕشتاین» پاش خوێندنەوەی ئەزمونی مێژوویی ئەورووپا، سێ ڕووبەری جیاوازی لەوێدا پێناسە کرد: یەکەم ناوچەی نێوەندی لە باکووری ڕۆژئاوای ئەورووپا کەوا، لەوێدا بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی لە ڕێگەی وزەی کاری زۆر پسپۆڕ جێبەجێ دەکرا؛ پاشان ناوچەی کەمەرەیی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی کەوا، بە هەناردە کردنی دانەوێڵە، لۆکە، شەکر و. . . . لە ڕێگەی وزەی کاری زۆرەملیانە یا کۆیلەکان، لەناوچەکانی تر جیا دەبۆوە و لە ئاخردا ناوچەی نیوە کەمەرە لە ئەورووپای مەدیتەرانەیی کەوا، لە ڕێگەی سیستەمی مەزرا کشتوکاڵییەکان بەڕێوە دەچوو. بەم چەشنە "نێوەند"، "نیوە کەمەرە" و "کەمەرە" نیشاندەری سێ ڕێگەی جیاجیای گەشەی نەتەوەیی لە ئەورووپای سەدەی شانزدەیەم بوون.

لەم سیستەمەدا، هەندێک لەو ناوچانە پشتبەستوو بە ناوچەکانی تر بوون. بۆ وێنە وڵاتە نێوەندەکان بە هۆی بوونی سیستەمی پاشایەتی ڕەها و بیرۆکراسی باوکسالارانەی دەوڵەتی، بە دەسەڵات گەیشتبوون، لە حاڵێکدا لە کەمەرە لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکی بەهێز بوونی نەبوو. (٢٠)

«والڕشتاین» هەروەها هەوڵی دا سێ ئەندامی پێوەندییدار بە سازبوونی چینەکان لەنێو ئەم سێ ڕووبەرە بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەم ئەندامانە بریتین لە : »بازاڕی یەکە«، «بنەما دەوڵەتییەکان» کەوا دەبنە هۆی لادانی بازاڕی سەرمایەداری، و «داگیرکردنی کاری زێدە«. (٢١)

سەرجەم ئەم بابەتانە لە کتێبە چەند بەرگەکەی ئەو لەبابەت«***سیستەمی نوێی جیهانی***» باس کراوە.(٢٢) ئەم بەرهەمە سەرنجی خۆی خستە سەر بابەتگەلی وەکو، کشتوکاڵی سەرمایەداری و بەستێنە ئابوورییە ئەورووپییەکانی سەدەی شانزدە و پاشان خەریکی لێکدانەوەی مێرکانتیلیزم

و یەکگرتنی ئەورووپا لە سەدەی حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدە دەبێ. «والرشتاین» لەو بەرهەمەدا سەرقاڵی پشکنین لەسەر دارِمانی فیئۆدالیزم، سەرهەڵدانی بیرۆکراسی نێوەندگری دەوڵەتی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە کشتوکاڵییەکان بووە. بە بۆچوونی «والرشتاین»، قەیران لە فیئۆدالیزم بە هۆی پێکدادانی بۆچوونە سێکۆلارەکان، قەیرانی خێرای خولەکی و دابەزینی ڕەوشی ناوچەیی ڕووی داوە و لە ئەنجامدا ئابووری جیهانی سەرمایەداری وەکو، «شێوازی نوێی بە دەستەوەگرتنی زێدە»ی لێهات.[٢٣] پێداویستییەکانی ئەم گەشەیە بریتی بوو لە: بڵاوبوونەوە لە سنوورە جوگرافییە ئەورووپاییەکان، ڕێنوێنی و کۆنترۆڵی بەرهەمە جۆراوجۆرە بەرهەمهاتووەکان لەناوچە جیاجیاکان و هەروەها سازبوونی دەزگا دەوڵەتییە بەهێزەکان.

بەم جۆرە، «والرشتاین» باسەکانی خۆی بەگوێرەی خوارەوە کۆ دەکاتەوە و دەڵێ:

***لە ساڵی ١٤٥٠، هەلومەرج بۆ سازبوونی ئابووری جیهانی سەرمایەداری لە ئەورووپا پێکهات. ئەو سیستەمە لەسەر بنەڕەتی دوو ڕێکخراوی سەرەکی دامەزرابوو کە یەکیان دابەشکاری کار لە ئاستی جیهانی و ئەوی تریان بوونی دەزگا بیرۆکراسییە دەوڵەتییەکان لە هەندێک ناوچەی تایبەت بوو،***[٢٤]

بە ڕای «والرشتاین»سیستەمی جیهانی لە سەدەی شانزدەیەم لە ڕێگەی سەرهەڵدانی سەرمایەداری و پێوەندییە بەرهەمهێنانە تایبەتەکان پێکهاتبوو. پێکهاتنی سیستەمی بەرهەمهێنانی گشتی و چینی کرێکار و هەروەها کەڵەکەکردنی بەردەوامی سەرمایە لە ئەورووپا بوو بە هۆی ئەوەی کە، ئابووری ئەورووپا بەرەبەرە لە جیهان پەرە بگرێ. بازرگان، پیشەوەر و سەرمایەدارە ئەورووپییەکان بە هۆی زۆربوونی توانا و پێداویستییە ئابوورییەکانیان، پاشماوەی جیهانیان بە سیستەمی جیهانی خۆیان گرێ دا.[٢٥] ڕکەبەری نێوان ئەوان لەگەڵ کەڵەکەکردنی زیاتری سەرمایە، بازاڕی نێوخۆی پڕ کرد و لەو کاتەوە پێویستی بە پەرەپێدان و دۆزینەوەی بازاڕی

نـوێ لــه دەرەوه زۆر بــوو. ســازبوونی قەیرانــه جیاجیاكــان و زێــدەی بەرهەمهێنان له ئەوروویا، سەرمایەدارەكانی بەرەو جیهانی كردنی سەرمایه و ئابوورییــەكانیان هانـدا. ئـەم پڕۆسـەیه سـەرهەڵدانی «سیسـتەمی یەكـەی جیهانی» له پاش بوو كه لـه ڕاستیدا بەرهـەمی جیهانیبوونی سـەرمایەداری ئەورووپایه.

لەم سیستەمه یەكه جیهانییه سـەرجەم شـتەكان پێوەندییان بـه یـەكترەوه هەیــە. بــەو پێیــه ئیتــر نــاتوانین بــاس لــه بــوونی ئــابووری فیئــۆدالی یــا سوسیالیسـتی لـه جیهـانی ئـەمڕۆ بكـەین، بـه هـۆی ئـەوەی كـه تـەنیا یـەك سیســتەمی ســەرمایەداری لــه جیهــانی ئــەمڕۆدا دەســەڵاتداره. سیســتەمی جیهـانی، سیسـتەمێكی كۆمەڵایـەتی یەكەیـە و هـەر كۆمەڵگەیـەك بەشـێكه لـه بنەمایەكی گشتی. ئەم سیستەمه سـەرمایەدارییه لـەنێو خۆیدا بـه سـێ بەشـی جیا بەڵام هاوپەیوەند دابەش دەبێت. [٢٦]

١ ) ***كۆمەڵگه نێوەندەكان***، ئەو وڵاتانـه لـه خۆ دەگرێ كـه كاریگـەرترین شێوازی بەرهەمهێنانی ئەوان بەرهەمهێنانی كشت و كاڵی – پیشەسازیه و له لایـەنی چـالاكی ئابووریـەوه تێكچنراوتـرن و كەڵەكـەكردنی سـەرمایه لەواندا زیاتره. كەلوپەلێك كه ئەم دەسته له وڵاتـەكان بەرهـەمی دێنن پێویسـتی بـه كــەڵك وەرگــرتن لــه تــەكنۆلۆجی تێكچنــراو و شــێوازه میكــانیزه و «ســەرمایەبەر»ەكانـه. دەوڵەتـه نێوەنـدەكان، بـەهێزترین و ڕێكخراوەتـرین دەوڵەتــەكانن. بــه ڕای «والرشــتاین» لــه بەشــی هــەره زۆری مێــژووی سیستەمی جیهانی (واتـه تـا سـەدەی نۆزدەیـەم)، نێوەند تـاقمێكی بچووك لـه دەوڵەته ئەورووپیه ڕۆژئاوایەكان، له خۆ دەگرێ، بـەڵام لـه سـەدەی بیستەم سـەرەتا وڵاتـه یـەكگرتووەكانی ئـەمریكا و پاشـان ژاپـۆن چوونـه نـاو ڕیـزی دەوڵەته نێوەندەكان.

٢ ) ***كۆمەڵگه كەمەرەكان***، بریتییه لەو وڵاتانه كەوا چالاكییه ئابوورییەكان لەواندا سـادەتر و زۆرجـار «كاربـەر»ه. ئـەم وڵاتانـه بەرهەمهێنـەری مـاددە خاوەكـان و بەرهەمـه كشـتوكاڵییەكانن. دەوڵەتـەكانی ئـەم وڵاتانـه لـه لایـەنی

میلیتاری و ڕێکخراوەیی، لەژێر کاریگەری دەوڵەتە نێوەندەکانن. بەشی هەرە زۆری وڵاتانی ئاسیایی، ئەفریقایی و ئەمریکای لاتین لەنێو ئەم دەستەیەدان. گرینگترین تایبەتمەندییەکانی وڵاتە کەمەرەکان بریتین لە :

١- کشتوکاڵ و خزمەتگوزاری پشتبەستوو بە بەرهەمهێنانی ماددە خاو و کشتوکاڵییەکان؛

٢- نەبوونی سیستەمی بە هێزی پیشەسازی – بانکی؛

٣- نەبوونی سەرمایەی پێویست

٤- بوونی چینی سەرمایەداری لاواز لەگەڵ ژمارەی زۆری وەرزێران و کرێکارە هەژارە شارییەکان؛

٥- لاوازی دەوڵەت سا لە لایەنی بنەمای نێوخۆیی و سا لە لایەنی دەسەڵاتی بیانی؛

٦- کاریگەری وەرگرتن لە نێوەند. [٢٧]

٣) ***کۆمەڵگە نیوەکەمەرەکان،*** بریتین لەو وڵاتانەی کەوا بەشێک لە چالاکییە ئابوورییەکانی ئەوان هاوشێوەی چالاکییە ئابوورییەکانی نێوەندە و بەشێکی تر هاوشێوەی چالاکییە ئابوورییەکانی کەمەرەیە. دەزگا دەوڵەتییەکانی نیوەکەمەر لە بەرامبەر کاریگەری دەوڵەتە نێوەندەکان سەربەخۆیی زیاتریان لە چاو دەوڵەتە کەمەرەکان هەیە. ئەم دەستە لە وڵاتەکان وەکو نیوبژیوان لە نێوان نێوەند و کەمەرە، ڕۆڵێکی گرینگ تر لە سیستەمی جیهانیدا دەگێڕن. وڵاتانێک وەکو ئارژانتین و بەرازیل لەو دەستەیە دان.

بە ڕای «والرشتاین» کۆمەڵگە »نیوەکەمەرەکان» خاوەن ئاوێتەیەک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە نێوەند و کەمەرەکانن. ئەم کۆمەڵگەیانە لەژێر کاریگەی وڵاتە لەحاڵی گەشەکان یا وڵاتە پیشەییە لە حاڵی داڕمانەکانن کە لە سیستەمی بەرهەمهێنانی خۆیان هەم بەشی پیشەسازی و هەمیش بەشی کشتوکاڵیان هەیە؛بەڵام هیچ کام لەم دەوڵەتانە توانایی پیشەسازی و کشتوکاڵی نێوەندیان نییە و بێ تواناتر لەناوچە کەمەرەکانیش نین. چینی

سەرمایەداری نیوەکەمەرە وەکو؛ وڵاتە نێوەندەکان بەهێز نییە، بەڵام وەکو بۆرژوازی کۆمەڵگە کەمەرەکان تووشی لاوازی یەکجار زۆر و بنەمایی نەبووەتەوە. هەروەها لە لایەنی پێکهاتە و هێزی دەوڵەت و ڕادەی کاریگەری وەرگرتنی ئەم کۆمەڵگەیانە لە نێوەند هەر بەم شێوەیەی سەرەوەیە. لە ڕاستیدا ڕۆڵی کۆمەڵگە نیوەکەمەرەکان وەکو پردێکی پێوەندیی و هێورکەرەوەی سیستەمی جیهانییە و زۆرجار وەکو هۆکاری جێگۆڕکێی سەرمایە و کەلوپەل لە نێوان نێوەند و کەمەرە ئیش دەکەن، یا خەریکی بەرهەمهێنانی کەلوپەلێک دەبن کەوا پێداویستی سیستەمی جیهانییە بەڵام نابێتە هۆی کەڵەکەکردنی خێرای سەرمایە. بە گشتی ئەو جۆرە کۆمەڵگەیانە ڕۆڵی هێورکەرەوەی سیستەمی جیهانییان هەیە و لە بەرەنگاربوونەوەی ڕاستەوخۆی نێوەند و کەمەرە و دابەشکاری سیستەمی جیهانی بە دوو جەمسەری تەواو لاواز و بەهێز بەرگری دەکەن. (٢٨)

بە بۆچوونی «والرشتاین» پێوەندیی نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی دەبێتە هۆی گەشەسەندن و کەڵەکەکردنی سەرمایە لە نێوەندە و گەشەنەسەندن و سەرهەڵنەدانی سەرمایەی گەورە و سیستەمی بەرهەمهێنانی پێشکەوتوو لە کەمەرە. ئەم بەشانە بە تەواوی کاریگەری لەسەر یەکتر دادەنێن؛ هەڵبەت ئەم بابەتە بە مانای ئەوە نییە کەوا، هۆکاری بیانی وەکو هۆی گەشەنەسەندوویی کۆمەڵگە کەمەرەکان دابنێن.

لە تیۆریی «والرشتاین» ئەگەرچی سەرجەم کۆمەڵگەکان بە ناچاری کەوتونەتە ناو سیستەمی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی ئەورووپی و یا بە واتایەکی تر لە سیستەمی سەرمایەداری جێگیر بوون بەڵام چارەنوسی هاوشێوەیان نییە. هەرکام لەو کۆمەڵگەیانە (نێوەند، نیوەکەمەرە و کەمەرە) ڕەنگە تووشی گۆڕان لە لایەنی پێگەوجێگە بێن، هەڵبەت ئەم گۆڕانانە بە واتای گۆڕانی سیستەمی سەرمایەداری نییە. ئەم گۆڕانانە بە هۆی ڕکەبەرایەتی کۆمەڵگەکانی سەر بە سیستەمی جیهانی سەرمایەداری ساز دەبێ. هەڵبەت گۆڕانی جێگەوپێگە پێویستی بە دوو دەستە هۆکار هەیە:

یەکـــــەم ســــــەرچاوە زەخیرەکـــــان و دووەم ســــــتراتیژییە پێویســــــتەکانی وەدەســتهێنانی دەرفەتــە نوێیــە ئابوورییــەکان بـۆ بەرزبوونــەوە. دەوڵەتــەکان دەبێ بە دۆخێک بگەن کە بتوانن لـە گوشـاری ئابووری جیهـان تـا ڕادەیـەک ڕزگــار بــن. بــوونی پیشەســازی بــاش و هێــزی ســەرمایەگوزاری ڕۆڵــی هــەرەگرینگی لــە بەدەســتهێنانی ئــەم پێگەیــە هەیــە.[29] کەوایــە کۆمەڵگــە گەشەنەسەندووەکان دەتوانن بۆ گۆڕانی پێگەی خۆیـان هـەوڵ بـدەن. هەڵبـەت ئەم گۆڕانە لە تیۆریی سیستەمی جیهانیدا زۆر سنووردارە.

والرشتاین لە ووتارێکی دیکەدا ئاماژە بەوە دەکـات کـەوا، کێشـەیەک بـە ناو «گەشەی نەتەوەیی» لە سیستەمی جیهانیدا بوونی نییە و گەشەسـەندن تـەنیا لـە چوارچێـوەی سیسـتەمی جیهـانی مۆدێرنـدا مانـای هەیـە. ئـەو لـەم بارەیەوە دەڵێ: «بنـەڕەتی ترین هەڵـەی زانسـتە کۆمەڵایەتییە نامێژووییەکان ئەمەیەکــەوا، پــەنا دەبەنــە بــەر ســازکردن و پێکهێنــانی بەشــێکی بچــوک لــە سیســتەمی جیهــانی بــە نــاوی "یەکــە نەتەوەییــەکان" و پاشــان خــەریکی بـەراوردکرنی ئـەم بنـەما سـازکراوانە لەگـەڵ یـەکتر دەبـن». والرشـتاین بـە پێچەوانــە جــەخت لەســەر سیســتەمی جیهــانی ڕاســتەقینە دەکــات کــە «سیستەمێکی یەکە، وێڕای دابەشکاری کاری تاک (منفرد)، لەگەڵ سیستەمە کولتوورییە جۆرواجۆرەکانە«. [30]

بـــەپێی دەربڕینـــەکانی ســـەرەوە، «والرشـــتاین» بـــە ئاوێتـــەکردنی دۆزینـــەوەکانی مارکســـیزم لەگـــەڵ کارکردگـــەرایی بنـــەمایی، بـــە جـــۆرە دەربڕینێکی تایبەت لەمەڕ ڕووداوە نێونەتەوەییەکان دەگات. لەم دەربڕینەدا، والرشتاین لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئاڵوگۆڕەکانی بازاڕ پێوەندیی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان دەستنیشان دەکەن نەک بە پێچەوانەوە. بە بۆچوونی والرشتاین بنـەمای سیاسـی سیسـتەمی نێونەتـەوەیی بەرهـەمی ڕووخانێـک (روبنـا) لـە ڕکەبـەری نێوخـۆیی سیسـتەمی سـەرمایەدارییە. ئـەو پاشـان دەڵـێ دۆخـی بنــەمایی ئێســتا، بــۆ ســازبوون و بــەردەوام بــوونی مانــەوەی سیســتەمی ســـەرمایەداری پێویســـتە. کەوایـــە بـــوونی کۆمەڵگـــە ملکەچـــە سیاســـییە

جۆراوجۆرەکـان (نێوەنـد، کەمــەرە و نیوەکـەمرە) لـەنێو سیسـتەمی یەکـەی سـەرمایەداری جیهـانی، مانـەوەی ئـەم سیسـتەمە گـارانتی دەکـات. لـە لایـەکی دیکـەوە پێداویسـتییە کارکردییـەکانی سـەرمایەداری هــەروەها، یارمــەتی بـە مانەوەی ئەم بنەمایە دەکـەن؛ سـەرمایەدارەکان دەیانـەوێ دەوڵەتـەکان وەکو کەرەسەیەک بە کار بێنن بۆ ئەوەی کە هێزی ڕکەبەری خۆیان لە پانتایی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی ببەنە سەرەوە. (٣١)

ئاکامی ڕکەبەری نێوان سەرمایەدارەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا ئەمەیە کـەوا جیهـانی نـوێی کردووەتـە گۆڕەپـانی فـەرمانڕەوایی سـەرمایەداری لـە چوارچێوەی یەک سیستەمی جیهانیدا؛گەرچی بە هۆی تایبەتمەندییە جوگرافی و مێژووییــەکان و ســەرتربوونی یــەک وڵاتــی تایبــەت بەســەر وڵاتــانی تــر جاربـەجار ڕووداوگـەلی چـاوەڕوان نـەکراو لـە قۆناغـە گرینگـە مێژووییـەکان ڕوو دەدات؛ بۆ وێنە ڕێبەرایەتی سیستەمی سەرمایەداری لە یەک هێزی زاڵ (سـەرتر) بـە هێزێکـی زاڵـی نـوێ دەگوێسـترێتەوە. ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆی پتـەوبوون، قـوڵ بوونـەوە و ئۆرگـانیزەبوونی ئـەم جیاوازییانـە لـە نێـوان ئـەم دوو دەستە لە وڵاتەکان، زاڵبوونی سیستەمی سـەرمایەدارییە کە لـە کرداری پێوەندیی و دژکردەوەی نێوان وڵاتە نێوەند و کەمەرەکان لە بازاڕی جیهانیدا سـەری هەڵداوە. خـاڵی سـەرنج ڕاکێش لێرەدا ئەوەیەکـەوا، ئۆرگـانیزەبوونی جیاوازییـەکان تـا ڕادەیـەک قـووڵ دەبێتــەوە کــە لــە درێژماوەشــدا گــۆڕان وەرناگرێ. (٣٢)

بە ڕای «والرشتاین» نایەکسانی پرەنسیپی سەرەکی و وزەی بزوێنـەری سیستەمی جیهانییە. بە ڕای ئەو گەشەی هاوکاتی گشت دەوڵەتەکان تەنانـەت لە لایەنی هزریشەوە مسۆگەر نییە، بە هۆی ئەوەی کـە » کـەلێنی زیادبوو » میکــانیزمی هەمیشــەیی کــردەی ئــابووری جیهانییــە. هەڵبــەت هەنــدێک لــە وڵاتەکان گەشە دەکەن، بەڵام بە نرخی گەشەنەسەندنی وڵاتانی دیکە. (٣٣)

## ڕەخنەیەک لەسەر تیۆری سیستەمە جیهانییەکانی والڕشتاین:

«تیۆریی سیستەمە جیهانییەکانی» والرشتاین هاوکات لە دوو ڕوانگەی مارکسیستی و نامارکسیستی کەوتۆتە بەر ڕەخنەوە. ئەگەرچی والرشتاین هەوڵی داوە لە ڕێگەی چاکسازیی و دەستێوەردانی بچوک لە تیۆریی سیستەمە جیهانییەکان و گشتی کردنەوەی ئەو، وڵامێکی باش بەو ڕەخنانە بداتەوە، بەڵام ڕەخنەی کاریگەری دیکە هەروەها لەسەر بۆچوونی سەرەکی ئەو واتە »تیۆریی سیستەمە جیهانییەکان» هەیە. لە درێژەی ئەم باسەدا هەوڵ دەدەین، هەرچەند بە کورتی، هەندێک لە گرینگترین ڕەخنەکان بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

### ١- *کەمتەرخەمی ڕێژەیی تیۆریی سیستەمە جیهانییەکان بە بنەما چینایەتییەکان*:

جەختی تیۆریی سیستەمە جیهانییەکان زۆرجار لەسەر بنەما نێونەتەوەییەکان و نایەکسانی جیهانییە. ئەم کێشەیە بۆتە هۆی ئەویکە «والرشتاین» لەم تیۆرییەدا گرینگی لاوەکی بە بنەما کۆمەڵایەتی – ئابوورییەکانی نێوخۆ بدات.[٣٤] جگە لەوە، بە ڕای «زایتلین»، کاتێک والرشتاین لە چەمکی «چینەکان» کەڵک وەردەگرێ، مەبەستی لەو توێژانەیە کەوا بە هۆی دۆخی خۆیان لەنێو هیرارشی پیشە و کارە ئابوورییەکانی جیهانی سەرمایەداری دیاری دەکرێن. توێژە کۆمەڵایەتییەکان بەپێی ڕۆڵ و ئەرکێک کە لە پرۆسەی بەرهەمهێنان دەیگرنە ئەستۆ، خەڵاتی نایەکسان وەردەگرن. پێناسە و چەمکی سەرنجراکێش بۆ «والرشتاین»، چەمکی «چینی مارکسیستی» نییە بەڵکو ئەو شتەیە کەوا لە وێژەی کۆمەڵایەتی وەکو «توێژ» پێشکەش کراوە. بەم شێوەیە »زایتلین» بەو ئەنجامەی خوارەوە دەگات.

***ئەم شێوازە، بە شاردنەوەی شۆناسی ڕاستەقینەی پێوەندییە چینایەتییەکان و ڕازاوی نیشاندانی ریشە مێژووییەکانی ئەوان، پێوەندیی***

***ڕاستەقینەی نێوان دابەشکاری کاری ناوبراو و پێوەندییە چینایەتییەکان پێچەوانە نیشان دەدات. لەم شێوازە دەرهەستییە، هیچ نیشانەیەک لە پێوەندییەکانی دامەزراو لەسەر زۆر، گوشار و چەوساندنەوە یا پێوەندییەکانی نێوان خاوەن کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان و بەرهەمهێنەرەکان، زاڵمەکان و زوڵملێکراوەکان، یا چینە دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتەکان نادۆزرێتەوە؛کۆیلەکان، جووتیارەکان، وەرزێڕە کرێدەرەکان، خانەدانەکان، پیشەوەر و کرێکارەکان، سەرجەم وەکو «بابەتە پیشەییە تەکنیکییەکانیان»لێهاتووە.*** [٣٥]

نووسەرەکانی دیکەی وەکو «لۆیی»، «پێتراس»، «فیلیپس» هەر بەم شێوەیە ڕەخنەیان لە بۆچوونەکانی «والرشتاین» گرتووە. ئەوان تیۆریی سیستەمە جیهانییەکانیان بە بەرەنگاربوونەوەی خراپ لەگەڵ ڕەوتی دامەزراندنی چینایەتی و خەباتی چینایەتی تاوانبار کردووە. «لۆیی»کە ماوەیەک لەژێر کاریگەری ڕوانگەی سیستەمی جیهانی «فرانک» بوو، ئەم تیۆرییەی وەکو تیۆرییەکی دووپاتبوو، وەستاو، بێ توانا لە چارەسەرکردنی کێشەکان و بێ توانا لە پۆلینبەندی کێشەکانی پێوەندییدار بە ستراتیجی گەشە و بەری لە هەر چەشنە کاریگەری دانان لەسەر خەباتکاران و ڕەنگە خراپتر لە هەموان، توانا لە هاوکاری لەگەڵ گەشەخوازە بورژواکان پێناسە کرد. گرینگی نەدانی ڕێژەیی تیۆریی سیستەمە جیهانییەکان بە بنەما چینایەتییەکانی جیهانی سێیەم وێڕای کێشەی بێ ڕێزی بە بورژوازی جیهانی سێیەم، هاوڕێ بووە لەگەڵ ئەو بوارانەی کە زیاتر یارمەتی بە بەرژەوەندی سەرمایەداری نێونەتەوەیی دەدەن. بە بۆچوونی نووسەرە مارکسیستەکان بەهانەدان بە چینە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆڵی بورژوازی جیهانی سێیەم لە پێناو دابینکردنی بەرژەوەندییە سەرمایەدارییە نێونەتەوەییەکان، تایبەتمەندییەکی دەرهەستییانە و ناڕاستی بە تیۆریی سیستەمە جیهانییەکانی «والرشتاین» داوە.

***٢- گرینگی دانی یەکجار زۆر بە هۆکارە ئابوورییەکان:***

ڕوانگەی نامارکسیستی ئەم ڕەخنەیەی خستۆتە سەر «والرشتاین» کە ئەو سەرنجی تەنیا بە هۆکارە ئابوورییەکانی گەشەی سیستەمی جیهانی داوە و هۆکارەکانی تر وەکو تێبینی یە سیاسییەکان، شەڕ، هۆکارە کولتوورییەکان و هتد لەبەرچاو ناگرێ.

«ئانتۆنی گیدێنز»، لەسەر ئەم باوەڕەیە کەوا جەختی زۆر لەسەر ئەم هۆکارە دەبێتە هۆی گرینگی نەدان بە هۆکارەکانی تر.[٣٦] ئەو وەکو کۆمەڵناسێک، هەوڵی داوە هاوکات جەخت لەسەر ڕوانگەکانی «ڤێبری» و «مارکسی» بکات. هەروەها ئەو لە جێگەیەکی تریش دەڵێ، لە ڕاستیدا «ماکس ڤێبەر» هەوڵی دا بە پێشکەش کردنی بابەتی ئایین و ڕۆڵی ئەو لە سەرهەڵدانی سەرمایەداری، جەخت لەسەر هۆکارە نائابوورییەکان بکات.

***٣- پشت گوێ خستن و گرینگی نەدان بە یەکەی شیکردنەوەی دەوڵەت – نەتەوە:***

والرشتاین لە زۆربەی بەرهەمەکانی خۆیدا و بەتایبەت لە کتێبی «سیستەمی جیهانی نوێ» هەوڵی داوە »یەکەی شیکردنەوەی نوێ» جیا لە دەوڵەت – نەتەوە پێشکەش بکات. ئەو لە سەرەتای ئەم کتێبەدا، ئەم پرسیارە پێشکەش دەکات کە چ یەکەیەک بۆ خوێندنەوە، وەسف و دەربڕین باشە؟ پاشان بۆ وەڵامدانەوە بەم پرسیارە ئاماژە بەو شیکردنەوانە دەکات کەوا دەوڵەتی دەسەڵاتدار یا کۆمەڵگەی نەتەوەیی وەکو یەکەی شیکردنەوە دادەنێن، و ئەوان وەکو بۆچوونگەلێکی ناڕوون گریمانە دەکات کە ناتوانن وەکو سیستەمی جیهانی پەسەند بکرێن و قسە کردن لەبابەت گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەنێوەوەی ئەوان بێ کەڵکە. «والرشتاین» سیستەمی جیهانی بە جێگەی سیستەمە دەوڵەت – نەتەوەکان وەکو یەکەی شیکردنەوە بۆ شیکاری بابەتی گەشە دەستنیشان دەکات. ئەو گۆڕانکاری و پەرەسەندنی سیستەمی دەوڵەت – نەتەوەکان لە گۆڕانکاری و پەرەسەندی سیستەمی جیهانی لێکدەداتەوە. لەگەڵ ئەوەش، دەبێ بگوترێ کەوا ڕاستی مێژوویی لەبابەت گۆڕانکاری لە ڕۆژئاوا ئەوە نیشان دەدات کە سیستەمی جیهانی بە

پێچەوانـە، بەرهـەمی ئـەو گۆڕانکاریانەیـە کـە دەوڵـەت – نەتـەوەکان سـازیان کـردووە و نـاتوانین چاوپۆشـی لـە ڕۆڵـی ئـەوان بـۆ سـازکردنی سیسـتەمی جیهانی بکەین.

سیسـتەمی دەوڵـەت – نەتـەوە تەنانـەت لـەو کاتـەش کـەوا، پڕۆسـەی جیهـانیبوون سـەری هەڵـداوە و پـەرەی سـەندووە بـەردەوام ڕوو لـە زیادبووندایـە و هـەر وەکـو «ئـانتۆنی سـمیت» ئامـاژە دەکـات بیرکردنـەوە لەبابەت لابردن و لەنێوبردنی دەوڵەت – نەتەوە بابەتێکی باوەڕ پێنەکراوە.[٣٧] تەنانـەت «پۆسـت مۆدێرنـە« گەشـبینەکانیش لایـەنگری لـە سـڕینەوە و لەنێوبردنی دەوڵەت – نەتەوەکان ناکەن و لەسـەر ئەم باوەڕەن کە چەمکی کەلێن و درز هەڵگرتنی سنوورەکان لە سەدەی «پۆست مۆدێڕن» بە واتـای لەنێوچوونی سنورەکانی دەوڵەت – نەتەوەکان نییە، بەڵکو زۆرجار مەبەست لـەنێوچوونی سـنورە کولتوورییـەکانی نێـوان وڵاتـەکان بـە هـۆی فـرەوان بوونەوە و ڕاگەیاندنە گشتییەکانە. [٣٨]

***٤- پشت گوێ خستنی بابەتە تایبەتییەکانی گەشە لە درێژەی مێژوودا:***

یەکێکی تر لە ڕەخنە جددییەکان لەسـەر تیۆریی «والرشتاین»، گرینگی نەدان بە بابەتە تایبەتییەکانی گەشە لە درێژایی مێژوو دایە. بـەپێی دەربڕینی «زایتلین»، گرینگیدانی یەکجار زۆر بە گشتەکی (کلیت) سیستەم، بۆتـە هـۆی چاوپۆشینی ئەو لە پێوەندییە مێژووییە ئاشکراکانی ناو کۆمەڵگە تایبەتـەکان. بە ڕای «زایتلین»:

***ڕوانگەی سیستەمی جیهانی بە جەخت لەسەر ئەو خاڵە کە سیستەمی جیهانی تەنیا خۆی خاوەن ڕاستییە، نە تەنیا یارمەتی بە ناسینی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوخۆ ناکات کە ژێرخانەکەی بە واتایەک لەسەر بنەڕەتی «ئابووری جیهانی سەرمایەدارییە« و بووەتە هۆی تەکامول و گەشەی دیالکتیکی ئەو لە درێژایی مێژوودا، بەڵکو دەبێتە هۆی سەرگەردانی و ناڕوونییەکی زیاتریش.***

بە بۆچوونی «زایتلین» تیۆریی سیستەمە جیهانییەکانی «والرشتاین» ناتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، پرسیارگەلێکی وەکو:

چۆن چوارچێوبەندی تایبەتی پێوەندییە چینایەتییەکان لە مێژوویەکی دیاریکراو و لە بنەمایەکی کۆمەڵایەتی گریمانەیی، دەتوانێ گەشەی نێوخۆی ئەو بخاتە ژێر کاریگەرییەوە؟ ئەم ئاوێتە چینایەتییە لە لایەنی مێژووییەوە چۆن ساز بووە؟ بۆچی پێوەندییە چینایەتییەکان بەم فۆڕمە دیاریکراوە دەرهاتوون و چ ئەنجامگەلێک بۆ گەشە ساز دەکەن؟ بزوێنەرە تایبەتییە نێوخۆکانی ئەم پێوەندییە چینایەتییە بۆ کەڵەکەکردنی سەرمایە چییە؟ و ئەوان چۆن دەتوانن ڕۆڵی بازاڕی جیهانی لە گەشەی ئەو کۆمەڵگەیە دیاری بکەن؟ کاریگەرییە ڕێژەییەکانی بازاڕی جیهانی لەسەر شێوازی گەشە، بە بەراورد لەگەڵ جۆرە تایبەتییەکانی تەشەنەکردن و فرەوان بوونەوەی یەکە جیاجیاکانی سەرمایە کە خۆی لەژێر کاریگەری پێوەندییە نێوخۆکانیان لەگەڵ کار دان، چیە؟

تاقمێکی تر لە ڕەخنەگران لەسەر ئەم باوەڕەن کە گشتی کردنەوەکانی «والرشتاین» هەروەها جێی باسن. بۆ وێنە شیکردنەوەکەی «والرشتاین» لە بابەت ئێمپراتوریەکان بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی جیهانی هەنووکە پێشەکش دەکرێ. ئەو هەوڵی پشکنین لە بابەت دۆخی پێشەکەوتن، هۆی مانەوەی ئەم جۆرە پێکهاتە نەتەوەییە هەزار ساڵە و پێوەندیی ئەو لەگەڵ ئەو پاژانەی کەوا لە پاش داڕمانی ئێمپراتۆرییەکان دەمێننەوە، نادات.

### ***٥- چوونە جێگەی نابەجێی بازاڕ لە باتی بەرهەمهێنان:***

ڕەخنەیەکی تر کە خراوەتە پاڵ چەمکی سیستەمە جیهانییەکانی «والرشتاین» ئەوەیە کەوا «بەرهەمهێنان» کە یەکەی سەرەکی شیکردنەوەی مارکسیستییە پشت گوێ دەخات و لە جیاتی ئەو تەنیا جەخت لەسەر «بازاڕ» و پێوەندییە ئابوورییەکان دەکات. بە بۆچوونی «ڕۆناڵد چیلکۆت » ڕەخنەگەلێکی فرەوان لەسەر تیۆریی «والرشتاین» هەیە بە هۆی

ئەویکە لە جیاتی بەرهەمهێنان، بازاڕ دەکاتە بنەمای شیکردنەوەی پێوەندییە چیانییەتییەکان.

**٦- سست یا شکاوەبوون و بەشت بوونی چەمکی سیستەمی جیهانی:**

ئەم ڕەخنەیەش هەروەها لە لایەن «زایتلین» پێشکەش کراوە. ڕەخنەی ئەو لەسەر شکاوەبوون و سست بوونی چەمکی سیستەمە جیهانییەکانی «والرشتاین»ە. بە ڕای «زایتلین»

***والرشتاین شتێتی (شیئیت) داوە بە ئابووری جیهانی سەرمایەداری و «ڕەوتی ڕاستەقینەی مێژوویی» کە ئەم پێوەندییە جیهانیانەی تێدا دروست بووە، بە پێچەوانە نیشان داوە. ئابووری جیهانی، هەر وەکو باسمان کرد بەڕواڵەت «ڕۆڵە ئابوورییە نەتەوەییەکانی»لەنێو خۆیدا، بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکان گێڕاوە و لەو کاتەوە، ناوچە ناوبراوەکان بە شێوەی جۆراوجۆر خەریکی کۆنترۆلکردنی ووزی کار و بەڕێوەبردنی کاروباری دیکە بوون. بە داخەوە ئەوەی کە لێرەدا ڕووی داوە ئەوەیە کە بابەتە تێپەڕبووەکانی تیۆریی بە چەشنێکی هەست پێنەکراو «ژیانی تایبەت بە خۆیان» ساز کردووە و بمانەوێ یا نەمانەوێ لەسەر ڕاستی کۆمەڵایەتی کە بڕیار وایە بە هۆی ئەوان بناسێندرێ، داسەپیوە؛ کەوایە ئێستا ئەوە بابەتەکانن کە ڕاستی کۆمەڵایەتی لەگەڵ پرەنسیپە پەسەندکراوەکانی خۆیان دەگونجێنن.*** (٤١)

جگە لەوە بە ڕای زایتلین، والرشتاین لە کۆتاییدا بە چەشنێک پەنای بۆ سەرپەڕی (غایت گرایی) ناوشیارانەی مێژوویی بردووە. ئەو بەستێنەکانی سیستەمی جیهانی بە یارمەتی وەرگرتن لە ڕووداوە مێژووییەکان شیکردۆتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئەم ڕووداوە مێژووییانە دەبوایە ڕوویان بدایە، بە هۆی ئەوەی کە خۆیان داواکاری سیستەمی جیهانیبوون. والرشتاین وتبووی کە »ئابووری جیهانی ڕێک لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە ساز بووە کە سێ ناوچەی ناوبراو بە شێوەی

ڕاستەقینە لەوێدا بوونیان هەیە و هەروەها هەر کام لەو ناوچانە شێوەگەلی جیاوازیان بۆ کۆنترۆڵ کردنی وزەی کار هەیە. ئەگەر ئەم گریمانەیەمان پەسەند نەکردبایە چۆن دەمانتوانی بە دڵنیایی خەریکی پێشکەشکردنی ئەو ڕەوتە زێدەیە بین کەوا، بوون و بەردەوامی سیستەمی سەرمایەداری پشتی پێ بەستووە. (٤٢)

بە باوەڕی زایتلین پرسیاری باش ئەوەیە کەوا بڵێین: ئایا ئابووری جیهانی بە هۆی ئەنجامەکانی خۆی ساز بووە یان بەو هۆیە کەوا ئامانجی زاتی ئەو لەگەڵ لەدایک بوونی سەرمایەداری ساز بووە؟ ئەوانە پرسیارە بنەڕەتییەکانی بەرەوڕووی والرشتاینن کە ناچاری مێژوویی و هێڵەکی (جبرگرایی تاریخی و خطی) تیۆرییەکەی ئەو ناتوانێ بەوان وڵام بداتەوە.

## پەراوێزەکان:


1- Dialektisch

نووسراوە شیکارییەکانی والرشتاین لەسەر سایتی

(http//Fbc. binghamtonlcmpg. htm)

٢- کتاب مهم والرشتاين كه به زبان آلماني ترجمه شده است:

***Abstuiz oder sin kflung des Adlers ? der Niedergang der Amerikanischen Macht***. Ham burg , U. S. A. verlag , 2004.

3- Immanuel wallerstein, ***The Modern world system*** , New York , 1974, p. 374.

4-Siehe , Geovanni , arrighi in ,Amin , Frank , Wallerstein: ***legrand Tumulte*** , paris , la Decourete , 1997.

٥- آلوين. ي. سو، ***تغيرات اجتماعي و توسعه***، ترجمه محمود حبيبي مظاهري، تهران: انشارات پژوهشكده مطالعات راهبردي، چاپ اول، ١٣٧٨، صص ٢٣٨-٢٣٦.

٦- ئالوين. ی. سو، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٢٣٩-٢٣٨.

7-احمد ساعي، ***مسايل سياسي – اقتصادي جهان سوم***، چاپ دوم، تهران: انتشارات سمت، 1378، ص 37.

٨-ئالوين. ی. سو، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٢٤٠.

9-Immanual Wallerstein , "Africa , The politics of Independence:An Interpretation of Modern African History***", Africa: The politics of unity*** , an Analyiss of a contemporary social modement.

١٠- ئالوين. ی. سو. سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١١.

11- رونالد اچ. چليكوت، ***درآمدي بر مسايل اقتصادي كشورهاي جهان سوم*** : نظريه هاي توسعه و توسعه نيافتگي : ترجمه و تلخيص احمد ساعي، تهران : نشر علوم نوين، 1375، ص 130.

١٢- ئالوين ی. سو، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٢١١.

١٣- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢١٢.

14- حسين سليمي، « تأملي در نظريه نظام جهاني »، ***ماهنامه اطلاعات سياسي – اقتصادي***، شماره 108-107، 1375، ص 89-88.

15- ***هەمان سەرچاوە***، لا 89.

16-Immanuad Wallerstein, ***The Modern world system III***, NY, 1989, p. 18.

١٧- مصطفي ازكيا، ***جامعه شناسي توسعه***، چاپ سوم، تهران : مؤسسه نشر كلمه، ١٣٧٨، ص ١٥٨.

18- Immanuel Wallerstein, “The Rise and feuture Demise of the world capitalist system: Concepts for comparatire Analysis”. p. 393.

19- Brewer,"Marxist Theories of Imperialism", p. 181.

20- Wallerstein , ***op. cit***. p. 340.

٢١- چليكوت، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٠.

22- Immanuel Wallerstein,"***Three paths of National Development in sixteenth Century Europe",*** p. 96.

٢٣- چليكۆت، ***هەمان سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٣١.

24- Immanuel wallerstein , ***The Modern world system*** , vol. I,***"The Modern world – system*** , Vol. 2. "

25- Ibid, p. 37.

26- Ibid, p. 63.

٢٧- مستەفا ئەزكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٦١.

٢٨- حوسەين سەليمی، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٩٢.

٢٩- مستەفا ئەزكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ١٦١.

٣٠- حوسەين سەليمی، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٩٣.

31- Immanuel wallerstein,***The Modern world system***, II:Mercantilism and the Consolidation of the Europen world Econmy, 1600-1750;p. 380.

٣٢- حسين سيف زاده، ***نظريه پردازي در روابط بين الملل***، چاپ اول، تهران : انتشارات سمت، ١٣٧٦، ص ١٢٦.

33- Immanuel wallerstein,***The Capitaliss world Eeonony***,pp. 19-20.

34- مستەفا ازكيا، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا 163.

٣٥- ديويد هريسون، ***جامعه شناسي نوسازي و توسعه***، ترجمه عليرضا كلدي، تهران، انتشارات علوم بهزيستي و توان بخشي، چاپ اول، اسفند ١٣٧٦، ص ١١٤.

36- به نقل از : آلوين. ي. سو، ***تغيير اجتماعي و توسعه***، صص 7-266.

37- آنتوني دي. اسميت، ***ناسيوناليسم***، ترجمه منصور انصاري، تهران : انتشارات مطالعات ملي و تمدن ايراني، تهران، 1383، فصل آخر.

38- آنتوني گيدنز، ***جامعه شناسي***، ترجمه منصور صبوري، تهران : نشر ني، 1374، ص 573.

39- نگاه كنيد به : گينبيز و ريمر، ***سياست پست مدرنيته***، ترجمه منصور انصاري، تهران : گام نو، 1381.

40- ئالفرێد سووی، ***سەرچاوەی پێشوو***، س 267.

٤١- رونالد چيلكوت، ***نظريه هاي سياست مقايسه اي***، ترجمه وحيد بزرگي و عليرضا طيب، تهران : مؤسسه خدمات فرهنگي رسا، ١٣٧٧، ص ٥١٣.

42- ئالفرێد سووی، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا 266.

٤٣- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٢٤٧.

# گەشە لە ڕەوشی جیهانیبوون

**واتای جیهانیبوون:**

جیهـانیبوون بـێ شـک کاریگـەری لەسـەر گەشـەش دانـاوە. زۆر شـت لـە سـەردەمی جیهـانیبوون گۆڕاوە، بۆ وێنـە هەنـدێک لـە کێشـەکانی گەشـە. هەڵبـەت جیهـانیبوون نـە ئایدیالۆژییـە (هەرچەنـد تاقمێـک هـەوڵ دەدەن وەکـو ئایدیالۆژییـەک ناوی بـەرن) و نـە سـتراتیژییە. کەوایـە باسـی ئـەم نەسکە ڕەنگە جیاوازی هـەبێت لەگـەڵ نـەسـکەکانی پێشـتر کـە لەسـەر تـەوەرەی سـتراتیژییەکان و چوارچێـوە سەرەکییەکانی گەشە لێدوانی دەکرد. جیهانیبوون تەنانـەت هـۆی دیاردەکان نییە. ڕێک بە پێچەوانە، جیهانیبوون خۆی هۆکردی هۆکارەکانی دیکەیە. وێڕای ئـەوەش ئـەو دۆخـەی کـەوا لەگـەڵ جیهـانیبوون سـەری هەڵـداوە لەسـەر بابـەتی گەشـە و کێشـەی گەشەنەسـەندوویی کاریگـەری هەیـە و پێویسـتە خوێندنەوەیـەکمان لـەو بابەتـەوە هـەبێ تـا بتـوانین باسـە پێشـترەکانمان پۆخـت کەینـەوە. کەوایـە لێـرەدا سەرەتا لە بابەت چەمکی جیهانیبوون بـەو دەربڕینـەی کـە خۆمـان هەمانـە هەنـدێک لێدوان دەدەین و پاشان لەو کێشـەیە دەکۆڵینـەوە کـەوا دۆخـە نوێیـەکانی گۆڕەپـانی ئـابووری و سیاسـی جیهـان، چـۆن دەتـوانن لەسـەر ڕەوشـی گەشـە کاریگـەری دابنێن.

جیهـانیبوون واتاگـەلی جۆربـەجۆری هەیـە و لێکدانـەوەی جۆربـەجۆر لەسـەر شـوناس و سـەرچاوەی ئـەو پێشـکەش کـراوە. وشـەی «جیهـانیبوون» لـە نیـوەی دەیـەی ١٩٧٠ چۆتـە نـاو وێـژەی سیاسـییەوە، بـەڵام جیهـانیبوون پرۆسـەیەکە کـە پێشـینەی دوور و درێـژی هەیـە. لـە نیـوەی دەیـەی ١٩٧٠ وشـەی جیهـانیبوون، بـۆ ئاماژەکردن بە هەندێک لـە دیـاردە گرینگـەکانی ڕووداوە جیهانییـەکان لـە گۆڕەپـانی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، ئابووری نێونەتـەوەیی و کێشـە کولتوورییـەکان کەوتـە نـاو باسـەکانەوە. جیهـانیبوون لـە چـەمکی هەنووکەییـدا زۆرتـر بـۆ ئامـاژە بـەو

ڕووداوانه کەڵکی لێ وەردەگیرێ کەوا لە درێژایی ئەودا، پێوەندییە ئابوورییەکان لە ئاستی جیهان، لە کۆنترۆڵی دەوڵەت نەتەوەکان دێتە دەرێ و ملکەچی بازاڕی جیهانی دەبێ. هەڵبەت جیهانیبوون بۆ دیاردەگەلی کەم بەهاتریش کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. بۆ وێنە جیهانیبوونی خواردنی کوکاکولا، یا مەک دونالّد یا نواندنە تەلەفزیۆنەکانی تایبەت. جگە لەو دەرکەوتە کەم بایەخانە دەتوانین بڵێین جیهانیبوون ئاماژە بە پرۆسەیەک دەکات کە لەوێدا ئۆرگانە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەی ڕۆژئاوا خۆیان بە گشت جیهان بڵاو دەکەنەوە. هەر وەکو پێشتر باسمان کرد والرشتاین لەو بیرمەندانە بوو کەوا جیهانی وەکو یەک سیستەمی یەکە گریمانە دەکرد کە لەسەر بنەڕەتی ئاڵوگۆڕی ناهاوشێوەی نێوان کەمەرە و نێوەند دامەزراوە. ئەم دەربڕینە لە لایەن والرشتاین یەکەمین هەنگاو بۆ تێگەیشتنێکی باشتر لە جیهان بوو.

ئەو ئۆرگانە مۆدێرنە ڕۆژئاوایانە کەوا بە خێرایی ڕێگەی جیهانیبوونیان تێپەڕ کردووە بریتین لە : بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، تەوەرەیی بوونی پیشەسازی، تەکنۆلۆجی، فۆڕمی سیاسی دەوڵەت – نەتەوە کە لە فۆڕمە جۆربەجۆرەکاندا بۆ گشت جیهان بڵاوبۆتەوە. [1] هەندێک لەسەر ئەم باوەڕەن کە لە پرۆسەی جیهانیبوون، بەرەبەرە جیهان دەبێتە شوێنێکی یەکە.[2] کاتێک دەتوانین لە جیهانیبوون باشتر تێبگەین کە جیهان وەکو یەک سیستەم چاو لێبکەین و ئەوە هەمان کار بوو کەوا «والرشتاین» کردی. ڕێبازی نوێسازی، دەوڵەتەکان بە شێوەی بەراوردی و لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان دەخاتە بەر چاو. بە بۆچوونی مۆدێرنیستەکان وڵاتەکان لە یەک ڕیزبەندی هێڵی دان. گرووپێک پێشترن لە گرووپێکی دیکە و گرووپی دووەم ڕێگەی گرووپی یەکەم تێپەڕ دەکەن و بەوان دەگەنەوە. چوارچێوبەندی ئێستای جیهان بۆچوونی مۆدێرنیستەکان (ڕێبازی نوێسازی) پشت ڕاست ناکاتەوە. بەپێچەوانەی ڕێبازی نوی سازی، لە تیۆریی سیستەمی جیهانیدا بابەتی گەشە و نوێ بوونەوە پێوەندیی هەیە بە پێکهاتنی یەک سیستەمی جیهانی کە سەرمایەداری ناوەڕۆکی ئەم سیستەمە جیهانییە دەستنیشان دەکات.

**وزەی هاندەری جیهانیبوون:**

ئەگەرچی جیهانیبوون لە سەردەمی ئێمە و بەدرێژایی دوو دەیەی ڕابردوو چوارچێوە و لایەنی نوێی بەخۆیەوە گرتووە، بەڵام دیاردەیەکی نوێ سەرهەڵداو نییە. جیهانی مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە هەموو کات بەرەو جیهانیبوون هەنگاوی ناوە، بەڵام لە درێژەی چەند دەیەی ڕابردوو، پێشکەوتنی مرۆڤ بە قۆناغێکی نوێ گەیشتووە. وزەی هاندەری جیهانیبوون سروشتی بەرهەمهێنەری مرۆڤە. بەرهەمهێنانی مرۆڤ هەموو کات بەرەو کۆمەڵایەتی بوون هەنگاوی ناوە و ئەم کۆمەڵایەتی بوونە لە سەردەمی ئێمەدا بە قۆناغێکی زۆر بەرز گەیشتووە. لە سەدە و دەیە ڕابوردووەکان، «سەرمایەداری» وزەی هاندەری کۆمەڵایەتی بوونی زیاتری بەرهەمهێنان و جیهانیبوون بووە.

سەرمایەداری لە درێژەی سێ قەڵەمبازی گەورە، جیهانیبوونی گەیاندووەتە دۆخی ئێستا. قەڵەمبازی یەکەم لە سەردەمی کۆلۆنیالیزم بوو و لە سەدەی هەڤدەی زایینی دەستی پێکرد و تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم درێژەی بوو. لەو سەردەمەدا ئەو وڵاتانەی کەوا بەرەو گەشەی سەرمایەداری هەنگاویان نابۆوە بۆ هەناردەکردنی کەلوپەلەکانیان، کە بە کەڵک وەرگرتن لە ئامێرە نوێیەکان هەموو ڕۆژێ قەبارەی زیاتریان بە خۆوە دەگرت، و هەروەها بۆ دابینکردنی ماددە خاوەکان و تالانی سامانی وڵاتانی تر، گشت جیهانیان خستبۆ ژێر فەرمانڕەوایی خۆیان.[٣] پێوەندیی کۆلۆنیالی کە لەو سەردەمەدا زیاتر لە ڕێگەی پێوەندیی بازرگانی ساز دەبوو، بنەمای ئابووری وڵاتە ژێر دەستەکانی بە توونەدی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە و ئەوی بەرەو گۆڕانکارییەکی نوێ هان دەدا.

قەڵەمبازی دووەمی جیهانیبوونی سەرمایەداری لەگەڵ سەردەمی ئێمپریالیزم دەستی پێکرد کە خاڵی سەرهەڵدانی ئەو دەیە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیە. ئەوەی کە ئەم قۆناغە (قۆناغی ئێمپریالیزم) لە قۆناغی پێشتر جیا دەکاتەوە هەم بە شوناس و هەم بە ڕەهەندەکانی کێشەکە پێوەندیی هەیە. لە قۆناغی پێشتر تالانی وڵاتە ژێردەستەکان لە بنەڕەتدا بە شێوەی جێگۆڕکێی زێدەی ئابووری لە وڵاتە ژێردەستەکانەوە بەرەو وڵاتە کۆلۆنییەکان بوو. لە درێژەی ئەم ماوەیەدا

سامانێکی هەرە گەورە لە ئەمریکای باشوور بەرەو ئێسپانیا و لە هێند بەرەو ئینگلیس و ئەورووپا گوێستراوە. ئەو سامانەی کەوا بۆ ئەورووپا گوێستراوە یارمەتی زۆری بە کەڵەکەکردنی سەرمایە لە وڵاتە سەرمایەدارەکان کرد. بەڵام لە قۆناغی دووەم هەناردەی سەرمایە لە وڵاتە سەرمایەدارەکان بۆ وڵاتە ژێردەستەکان ڕەهەندی نوێی بە خۆوە دی. ئەوە بوو بە هۆی ئەوەی کە ئێستا قازانجوەرگرتن لە وزەی کاری وڵاتە ژێردەستەکان بە بەراورد لەگەڵ جێگۆڕکێی زێدەی ئابووری پێگەیەکی گرینگ بە دەست بێنێ. هاندەر بۆ هەناردەی سەرمایە، دۆخی قازانجوەرگرتنی زیاتر لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بوو. بە واتایەکی تر، هاندەر بۆ هەناردەی سەرمایە، کەم بوونەوەی نرخی قازانج لە وڵاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارەکان بوو. بەپێی یاسایەکی ئابووری چوونە سەرەوەی ئاوێتە کردنی ئۆرگانیکی سەرمایە دەبێتە هۆی هاتنە خوارەوەی نرخی قازانج. چوونە سەرەوەی تێکەڵەی ئۆرگانیکی سەرمایە پێویستی بە چوونە سەرەوەی ئاستی تەکنۆلۆجی و کەڵک وەرگرتن لەم تەکنۆلۆجیە لە بەرهەمهێنانی کەلوپەلە. لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان نرخی قازانج بە هۆی نزم بوونی ئاستی پیشەسازی و لە ئەنجامدا نزم بوونی تێکەڵەی ئۆرگانیکی سەرمایە، لە سەرەوەیە. کەوایە سەرمایە حەزی لە ڕۆیشتن بەرەو ناوچەگەلێک هەیە کە ئاستی گەشە و فرەوانبوونی تەکنۆلۆجی لەوێدا نزمە.

هەناردە کردنی سەرمایە شەپۆلێکی نوێی لە گۆڕانی بنەمای ئابوری وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ساز کرد. لە قۆناغی پێشتر، گۆڕانکارییەکان زۆرتر بە شێوەی بەرهەمهێنانی کەلوپەلە هەناردەییەکان بە مەبەستی هەناردەکردن بۆ وڵاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارەکان بوو، بۆ وێنە بەرهەمهێنانی لۆکە، کائۆچۆ، کاکائۆ و مادده خواردەمەنییەکان. لە قۆناغی نوێ، جمووجوڵێک هەروەها لە پیشەسازی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ساز بوو. ئەم بابەتە هەروەها چووەتە ناو تێکەڵەی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان. چینی مامنێوەندی و چینی کرێکار لەم وڵاتانە پەرەیان سەند و لە ڕێگەی داخوازییەکانیان وزەیەکی هاندەری نوێیان بە سیاسەت و گەشەی سیاسی

بەخشی. هەڵبەت لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان، پیشەسازی لە پێوەندیی لەگەڵ پێداویستییە بیانییەکان پەرەی سەند. کەوایە هەر لە سەرەتاوە لە ڕێگەیەکی تایبەتدا گیرسایەوە تا بتوانێ پێداویستییە ئابوورییەکانی وڵاتە گەشەسەندووەکان دابین بکات؛ و جیا لەوەش چارەیەکی نەبوو، بە هۆی ئەوەی کە جیهانی ئێمە بەرەو هاوپێوەندییەکی تایبەت دەڕوات.

نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٧٠ وەکو سەرەتای قۆناغی سێیەم و قۆناغی نوێی جیهانیبوون ناسراوە. لەم قۆناغەدا فازێکی نوێ لە هاوپێوەندیی ئابووری — کۆمەڵایەتی و جموجۆلی نوێ لە سیاسەت و کولتووری جیهانی سەری هەڵدا. ئەم فازە نوێیە ئەگەرچی پاشماوەی قۆناغە پێشووەکانە، بەڵام شوناس و ڕەهەندی نوێی بە دەست هێناوە. گرینگتر ئەوەیە کەوا وشەی «جیهانیبوون» کەوتووەتە ناو باسەکانەوە و لە ڕاستیدا مرۆڤ لە بابەت جیهانیبوون بە ئاگامەندی گەیشتووە و گەلێک ڕهەندی نوێ لە هاوپێوەندییەکان بۆ هەموان ئاشکرا بووە. لە درێژەی ئەم باسەدا لە بابەت سروشتی ئەم پرۆسە نوێیە لێدوانێک دەخەینە بەر چاو.

## جیهانیبوون و پێداچوونەوە لەسەر بنەمای سەرمایەداری:

لەبابەت ئەوەی کە سروشتی جیهانیبوون چیە و هۆکارەکانی پێکهاتنی ئەو کامەن تیۆرییگەلی جۆربەجۆر هەیە. پێناسەکردنی ڕوانگە جۆربەجۆرەکانی ئەو بوارە خۆی پێویستی بە باسێکی تێروتەسەل هەیە و مەودای تری دەوێ. ئێمە لێرەدا بە یەک دوو ڕوانگە کە هەم لەگەڵ باسەکەی ئێمە پێوەندیی زیاتری هەیە و هەم لە ڕوانگەی ئێمەوە نێزیکترە، ئاماژە دەکەین و پاشان خەریکی چۆنێتی پێوەندیی جیهانیبوون و گەشە دەبین. ڕەنگە لە سەرەتا خراپ نەبێ ئاماژە بە یەکێک لە تیۆرییە بەناوبانگەکان بکەین کە پێگەیەکی لێکۆڵەرانە و لۆجیکی فرەوانی هەیە. «مانوئێل کاستلز» لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی «سەدەی زانیاری»[٤] ڕوانینێکی تایبەتی سەبارەت بە جیهانیبوون هەیە کەوا بە جۆرێک

پێوەندیی لەگەڵ باسەکەی ئێمە هەیە. ئێمە پێمان وابوو کە جیهانیبوون لەگەڵ قۆناغێکی نوێ لە جموجۆلی سەرمایەدارەکان پێوەندیی هەیە. ئێستا دەبێ چاو لەوە بکەین کەوا سەرمایەداری لە قۆناغی نوێ چ گۆڕانکاریەکی بە خۆیەوە دیوە کە توانیویێتی کاریگەری لەسەر گۆڕانکارییە هەنووکەییەکانی جیهان دابنێ.

**پێداچوونەوە لەسەر بنەمای سەرمایەداری:**

«کاستلز» دەڵێ شارستانییەتی مرۆڤ لە سەرەتاوە تا ئێستا دوو سەردەمی گرینگی تێپەڕاندووە و ئێستا چۆتە ناو سەردەمی سێیەمەوە. سەردەمی یەکەم سەردەمێکە کە هەوڵی مرۆڤ بۆ مانەوە لە بەرامبەر وزەی بەهێزی سروشتی و هەروەها دەسەڵاتی سروشت لەسەر کولتوور جێگەیەکی سەرەکی بووە. ئەم سەردەمە لە سەرەتای سازبوونی مرۆڤ تا شۆڕشی پیشەسازی درێژەی بووە. سەردەمی دووەم لەگەڵ سەرکەوتنی هەوڵەکانی مرۆڤ بەسەر سروشت بە تایبەت لەگەڵ قازانجوەرگرتن لەشۆڕشی پیشەسازی دیاری دەکرێ. لەو سەردەمەدا مرۆڤ هێز و وزە سروشتییەکان دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. «کاستلز» سەردەمی سێیەم بە سەردەمی کۆمەڵگەی تۆڕی ناو دەبا. کۆمەڵگەی تۆڕی هەر ئەو دۆخەیە کە جیهانی ئەمڕۆ پێکدێنێ. ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم کۆمەڵگەیە، تەکنۆلۆجی زانیارییەکانە. هۆی ئەم گۆڕانکارییانە دەبێ لە پێداچوونەوە بە بنەمای سەرمایەداری بزانین.

سەرمایەداری لە دەیەی ۱۹۸۰ سەردەمێکی گرینگی بۆ پێداچوونەوە بە بنەماکەی تێپەڕاند. سەرچاوەی پێداچوونەوە لەسەر بنەما لە »شۆڕشی تەکنۆلۆجی زانیارییەکان» دەستی پێکرد و لە دەیەی ۱۹۷۰ و ۱۹۸۰ پاڕادایمێکی نوێی لە تەکنۆلۆجی پێکهێنا. پەرەسەندنی پیشەسازی ئەلکترۆنیک لە پانتایی پیشەسازی و داهێنان و پەرەسەندنی ئازادی لە پانتایی بازرگانی و پشکنین، هۆکارەکانی یارمەتیدەر بەم پەرەسەندنە بوون. «کاستلز» لەسەر ئەم باوەڕەیە کە شێوازی ئابووری «کینزی »لە سەرەتای دەیەی ۱۹۷۰ توانایی خۆی لە دەست دا. شێوازی ئابووری «کینزی» لە درێژەی سەردەمی پاش شەڕی

دووەمـی جیهـانی سـەقامگیری و گەشـەی ئـابووری ڕۆژئـاوای گـارانتی کـرد. بـە بۆچوونی «کاستلز» بە دوای ئەوەی کە ئـابووری «کێنزی» لـە سـەرەتای دەیـەی ١٩٧٠ توانای خۆی لە دەست دا، خولێکی نوێ لـە وەسـتان و ئاوسـاویی ئـابووریی سـەرمایەداری دەسـتی پێکـرد. دەوڵـەت و کۆمپانیـا سـەرمایەدارەکان بـۆ چارەسەرکردن و کۆتایی هێنـان بـە ئاوسـاوی بـەرەو مێتـۆدە نوێیـەکان هـەنگاویان نا. ئـەم مێتۆدانـە کـە بـە شـێوەی ئـەزمون و خـەتا بـەڕێوە دەچـوون، بـوو بـە هـۆی ئەوەی کە پێداچوونەوە لـە بنـەمای سـەرمایەداری جێبـەجێ بکرێ. پیاچوونـەوە بـە بنـەما هاوکاتـە لەگـەڵ گۆڕانکـاری لـە ڕێکخسـتنی بەرهـەمهێنان و دابەشـکاری بـە شـێوەیەکی نـەرمتر. تـەکنۆلۆجی نـوێی ڕاگەیاندنـەکان (کەمپیوتـەر) ئـەم ڕێکخسـتنە نوێیەی شیمانە کرد. لاوازی وزەی کـاری ڕێکخراویـی لـە ئـەورووپا کـە لایـەنگری ئـابووری «کینـزی» و سوسـیال دیمۆکراسـی بـوو یارمـەتی بـە پێداچوونـەوەی ڕێکخراوەیی کـرد. یـەکێتی سـۆڤییەت کـە بـە هـۆی ئـابووری سـەخت و نـەگۆڕی خۆی لەم پیاچوونەوە بنەماییە ولانرا، لە کۆتاییدا توشی ڕوخان هات.

جیهـانیبوون لـە فۆرمـەکانی ئێسـتای خـۆی لەگـەڵ تـەکنۆلۆجی نـوێی ڕاگەیاندنەکان پێوەندیی هەیە. ئەم تەکنۆلۆجیە بە مەبەستی ڕێکخستنی جیهانیی ئابووری، هەلومەرجی پێویستی پێکهێناوە. بێ تـەکنۆلۆجی ڕاگەیاندن و کەمپیوتـەر ڕێکخسـتنی ئـابووریی جیهـانی مەحاڵـە. ئـابووریی «جیهـانی کـراو» نـابێ لەگـەڵ «ئابووری جیهانی» تێکەڵ بکەین.

«ئـابووریی جیهـانی» لـە سـەدەی شـازدەهەم بـەولاوە بـوونی بـووە. ئـابووریی جیهانی جۆرە ئابوورییەکە کە لەوێدا کەڵەکەکردنی سـەرمایە لـە ئاسـتی جیهانیدا جێبەجێ دەکرێ. بەڵام «ئابووریی جیهانی کراو» ئابوورییەکە کـەوا لـە یـەک کاتـدا دەتوانێ وەکو یەک یەکە لە ئاستی جیهان کار بکات. ئەم ئابوورییە ئێستا بە کـەڵک وەرگـرتن لـە تـەکنۆلۆجی زانیارییـەکان بەسـەر لەمپـەرە کـاتی و جێگەییـەکان زاڵ بـووە. هەنووکـە جێگـۆڕکێی سـەرمایە لـە شـوێنێک بـۆ شـوێنێکی تـر لـە چەنـد خولەکێک دەتوانێ جێبەجێ کرێ.

جگـه لـەوە تـەکنۆلۆجی زانیارییـەکان، تۆرەکـانی کۆمپانیـا جیهانییـەکانی لـە ڕێگەی فۆرمولـە جۆربەجۆرەکان دابین کردووە. شـێوازە نوێیەکانی بەرهـەمهێنان پشتبەسـتوو بـە فۆڕمـە جیاجیاکـانی هاوپەیمانییـەکان و هاوکارییـە درێژخایـەن و کاتییەکانی نێوان کۆمپانیاکـان و هـەروەها پێوەندیی تۆڕە بچـوک و مامنێوەنـدی و گـەورەکان لـە کۆبەندێکدایـە. سـتراتیجی بەڕێوەبەرایـەتی ئـەم کۆمپانیانـە بـەپێی دەسکەوتی زۆرتر لـە ڕکەبەرییەکان و لەسـەر بنـەڕەتی دۆخـی ڕێژەیی لـەنێو ئـەم تۆڕەدایە. ئەم بنەمایە هەموو کات لە حاڵی دیسـان بەرهەمهێنانـەوە، فرەوانبوونـەوە و قووڵبوونەوەدایە.

**دابەشکاری کاری نوێی جیهانی و پێوەندیی نێوەند– کەمەرە:**

بنـەمای ئـابووری زانیارییـە نوێیەکان وەکو ئابوورییـەکی تێکهەڵکێشـراو هـەروا لەسـەر تـەوەرەی ناهاوشـێوە بـوون لـە نێـوان ناوچـە ئابوورییـەکان دەخولێتـەوە. مـەودای نێـوان ناوچـە خـاوەن تەکنۆلۆجییـە زانیارییـە دەوڵەمەنـدەکان و ناوچـە هەژارە دەستکورتەکان بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوو هـەر بـەرەو زیـاتربوون دەچێ. لە لایەک سێ ناوچەی ئەمریکای باکوور، ئۆقیانوسی ئارام – ئاسیا و ئـەورووپا و لە لایەکی تر ناوچـە کەمـەرەکان بوونیان هەیـە. هەندێک جار بـەپێی چالاکییـەکانی ناو تۆڕی جیهانیی ئابووری، هەندێک لەناوچـەکانی کەمـەرە ڕاکێشـی نێوەند دەبن. وڵاتە نوێ پێشـەبووەکانی باشـووری ئاسیا لەوانـەن. هـەر کـام لەناوچـە ئابوورییـە نێوەنـدەکان خـاوەن کەمـەری خۆیـانن. ئـەمریکای باشـوور بـۆ ئـەمریکای بـاکوور، ئـەورووپای ڕۆژهـەڵاتی بۆ ئـەورووپای ڕۆژئـاوا و ئاسـیا بـۆ ئۆقیانوسـی ئـارام – ئاسـیا، ناوچـە کەمـەرەکان پێکدێنن. هـەروەها ڕۆژهـەڵاتی نـاوین بـە تـۆڕی مـاڵی جیهـانی و دابـین کردنـی وزەی سیسـتەمی جیهـانی لکاوەتـەوە. لـە دابەشـکارییەکی گشتی تر کەوا «باکوور» و «باشـوور» نـاو نـراوە هـەروەها چـەند گۆڕانکارییـەک دەبینـدرێ. بـۆ وێنـە باشـوور لـەنێو خۆیـدا توشـی گۆڕانکـاری و دابەشـکاری نـوێ بووەتەوە. هەندێک لە وڵاتە باشوورییەکان چوونـەتـە ڕیـزی وڵاتـە باکوورەکـان. بـۆ

وێنە ئەندۆنیزیا لە ڕێگەی سەرمایەگوزاری ژاپۆنییەکان و چینی تەبارەکان ڕاکێشی ناوچەی ئابووری ئاسیا – ئۆقیانوسی ئارام بووەتەوە.

«کاستلز» نویٚ ترین دابەشکاری کاری نێونەتەوەیی بە شێوەی خوارەوە پێشکەش دەکات:

١- بەرهەمهێنەرەکانی وزەی کاری گران و پشتبەستوو بە زانیارییەکان

٢- بەرهەمهێنەرەکانی کەلوپەلە خاوەن قەبارە زۆرەکان و پشتبەستوو بە کاری هەرزان

٣- بەرهەمهێنەرەکانی مادده خاوەکان پشتبەستوو بە بەهرە سروشتییەکان

٤- بەرهەمهێنەرەکانی زێدەی ئابووری کە بە وزەی کاری کەم بایەخ نوشوستیان هێناوە.

هەروەها دابەشکاری جیهانی کار کە پێشتر لەسەر بەرهەمهێنەرەکانی مادده خاوەکان لە لایەک و بەرهەمهێنەرەکانی کەلوپەلە پیشەییەکان لە لایەکی تر دامەزرابوو، گۆڕانی بەسەر هاتووە. چۆنێتی ڕەوشی یەک وڵات لە دابەشکاری جیهانی کار پێوەندیی بە تایبەتمەندی وزەی کاری ئەو وڵاتە و شێوەی پێوەندیی گرتنی ئەو بە ئابووریی جیهانی هەیە.(٥)

«ئابووریی جیهانیکراو» ناهاوشێوەیی زۆری تێدایە. هەروەها لە شێوازی سادەی نێوەند – کەمەرە ئاڵۆزی نویٚ سەری هەڵداوە. لەم شێوازەدا توێژە چەندلایەنەکان ساز بوون. ئەگەر ئاسیای گەشەسەندوو بریتی لە ژاپۆن و وڵاتە نویٚ پیشەبووەکانی ئاسیا (کوریا، سەنگاپور، تایوان و. . . ) وەکو ناوچەیەک گریمانە بکەین، دەبینین کە ئەم ناوچەیە بە بوونی ٢٦/٩ لە سەدی بەرهەمهێنانی جیهان بە بەراورد لەگەڵ بەشی ئەورووپا کە ٢٤/٦ لە سەد و بەشی ئەمریکای باکوور کە ١٨ لە سەدە، گەورەترین ناوچەی ئابووری جیهانی پێکهێناوە. ئەم ناوچەیە هەنووکە بووەتە نێوەندی گەورەی کەڵەکەکردنی سەرمایە. سەرهەڵدانی سەرمایەداری ئاسیا – ئۆقیانوسی ئارام، لەگەڵ پرۆسەی گەشەی بەردەوامی چین و ژاپۆن و گەشەی خێرای سەرمایەگوزاری ژاپۆن و چینی تەبارەکان و کۆمپانیا کورییاییەکان لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا خەریکە

ڕواڵەتێکی نویێ بە بنەمای جەمسەری بوونی ئابووری جیهان دەبەخشێ. خاڵی گرینگ ئەوەیە کە جەمسەربەندی ئێستا نە تەنیا لە ئاستی وڵاتەکان بەڵکو تەنانەت بە ناو وڵاتەکاندا ڕۆیشتوە. واتە هەمان دابەشکردنی هەژاری و سامان کەوا پێشتر ڕواڵەتی جیهانی لە ئاستی وڵاتەکان دیاری دەکرد، ئێستا تەنانەت لەنێوەوەی یەک وڵات ئەم چەشنە دابەشکردنی هەژاری و سامان و گەشە و گەشەنەسەندوویی بەپێی ناوچەکان ساز بووە. لە شێوازی ئێستای دابەشکاری جیهانی کار هەندێک لە وڵات و ناوچەکان (بۆ وێنە هێند) بە خێرایی گەشە دەکەن و دەڕۆنە ناو پانتایی جیهانییەوە و ناوچەکانی تر بە خێرایی نوشوست دێنن و دەکەونە پەراوێزەوە. ناوچەکانی لە حاڵی نزمبوونەوە لە «جیهانی سێیەم» بۆ «جیهانی چوارەم »فڕێ دەدرێن.[٧]

### جیهانگەرایی و ناوچەگەرایی:

لە جیهانی ئەمڕۆدا وێڕای جیهانیبوون دیاردەیەکی تریش دەبینین کە بە ڕواڵەت لەگەڵ دیاردەی یەکەم ناکۆکە. ئەم دیاردەیە بریتییە لەناوچەگەرایی. لەگەڵ جیهانیبوون و هەر بەم ڕیتمە شاهیدی ناوچەگەرایی واتە پەرەگرتنی ڕێکخراوە ئابوورییە ناوچەییەکانین. ئایا ئەم دوو دیاردەیە لەگەڵ یەکتر هاوڕێگەن؟ ئابووری جیهانیکراو هیچ ناکۆکییەکی لەگەڵ ناوچەگەرایی ئابووری نییە. ئابووری جیهانیکراو، بە پێچەوانەی ئابووری ناوچەیی کاروباری خۆی بە پشت بەستن بە یەک تۆڕی جیهانی جێبەجێ دەکات. تۆڕی جیهانی لە سنووورە ناوچەیی و نەتەوەیی و جوگرافییەکان تێدەپەڕێ. هەڵبەت ئەم بابەتە، هەروەکو لە داهاتوودا ئاماژەی پێ دەکەین، بە واتای بەری بوونی ئابووری جیهانیکراو لە سنورە سیاسییەکان و دەوڵەتە نەتەوەییەکان نییە. گەرچی دەوڵەت نەتەوەکان ڕۆڵی کاریگەریان لە ئابووری هەیە، بەڵام ئەوە یەکەی ئابووری جیهانییە کە حەزەکانی خۆی پێش دەخات، بە هۆی ئەوەی کە چالاکییە ستراتیژییەکانی بەرهەمهێنان، بازرگانی، کەڵەکەکردنی سەرمایە، بەرهەمهێنانی زانست و بەڕێوەبەرایەتی

زانیارییەکان لە پێوانەی جیهانیدا ڕو دەدات. کۆمپانیا فرەنەتەوەکان تۆڕی جیاجیا لە فۆڕمی جیاواز و نەرم سازدەکەن کە سنورە سەرزەوییەکان، شوناسەکان و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان تێدەپەڕێنن.

**ئابووریی جیهانی بوو و دەوڵەت نەتەوەکان:**

ئەگەرچی باس لە بچووک بوونەوەی یەکجار زۆری دەوڵەت نەتەوەکان لە پرۆسەی جیهانیبوون دروست نییە، بەڵام کەم بوونەوەی ڕۆڵی دەوڵەت زۆر ناڕاست نییە. پێگەی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت تا ڕادەیەکی زۆر کەم بووەتەوە. ئێستا کۆمپانیا فرەنەتەوەکان بەشێکی گرینگ لە ئەرکی کەڵەکەکردنی سەرمایە بە خۆیان تەرخان دەدەن. دەوڵەتەکان بە مەبەستی بردنەسەرەوەی توانای ڕکەبەری بەرهەمە نێوخۆییەکانیان ڕویان هێناوە بۆ کەم کردنەوەی باجەکان و لە ئەنجامدا کەم کردنەوەی تێچووە کۆمەڵایەتییەکان. ئەوە بەواتای قوربانی کردنی توێژە هەژارەکان لە بەرامبەر بازاڕ دایە. جیهانیبوون لەسەر تەوەرەی بازاڕ، لەگەڵ کارکردەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی دژایەتی هەیە. ئێستا ئۆرگانە نێونەتەوەییەکان وەکو ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی، سندوقی نێونەتەوەیی دراو و بانکی جیهانی کە هەنووکە خەریکی بەڕێوەبەرایەتی کەڵەکەکردن لە ئاستی نێونەتەوەیی دان، وێڕای ئەوەی کە بەشێک لە کارکردەکانی دەوڵەت نەتەوەکانیان گرتووەتەوە، بەڵام ناتوانن کێشەی بەڕێوەبەرایەتی کەڵەکەکردن چارەسەر بکەن. «سەمیر ئەمین» لەسەر ئەو باوەڕەیە، بەڕێوەبەرایەتی بازاڕ کە لیبڕاڵەکان بانگەشەی دەکەن، بابەتێکی خەیاڵییە و بەڕێوەبەرایەتی سیستەمی سەرمایەداری پێویستی بە بازاڕ و دەوڵەتە.[٨]

لەوە دەچێ جیهانیبوون ڕواڵەتێکی دووانەی هەبێ واتە لە لایەکەوە دەبێتە هۆی لاوازکردنی کارکردەکانی دەوڵەت نەتەوەکان و لە لایەکی دیکە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی حەزە نەتەوەییەکان. ڕەوتە نەتەوەگەرا، قەوم گەرا و بنەڕەتگەراکان لە ڕووداوەکانی تری جیهانی سەردەمە کە ڕێک بە پێچەوانەی کارکردەکانی دەوڵەت نەتەوەکانە. دەوڵەتە نوێ سەربەخۆکان کە لەگەڵ پەرەسەندنی سیستەمی

جیهانی ساز بوون لە هەوڵی ڕێکخستنی ژیانی نەتەوەیی لەژێر گوشاری پێداویستییەکانی بازاڕ و هێزە گەورەکانن کە داوکاریان لە دەوڵەتە نوێ سەربەخۆکان ئەوەیە، سیاسەتی خۆیان ملکەچی لۆژیکی بازاڕ بکەن.

## جیهانیبوون؛ هۆکاری گەشە یان وەستان:

سەبارەت بە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان، یەکێک لەو کێشانە کەوا مێشکی زۆر لە بیرمەندانی سەرقاڵ کردووە ئەوەیە کە ئایا خۆبەستنەوە بە ڕەوتی جیهانیبوون و فۆڕمە بانگەشەکراوەکانی لایەنگرانی ئەو دەبێتە هۆی گەشەی ئەو وڵاتانە یا بە پێچەوانە دەبێتە هۆی خەسار گەیاندن بەوان. پێش هەر شتێک دەبێ بڵێین ئەم پرسیارە وڵامێکی سادەی نییە. ئەم کێشەیە پێوەندیی بە هۆکارە چەندلایەنەکان هەیە کە دەوڵەت نەتەوەکان دەبێ بە شێوەی هەمەلایەنە پشکنینی لەسەر بکەن. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی تر لەم بوارەدا دوو دەستە بۆچوون و ڕوانین دەتوانین لە بەرامبەر یەک دابنێین. لیبڕاڵەکان و نوێ لیبڕاڵەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کەوا بازاڕی ئازاد و ئازادسازی ئابووری باشترین سیاسەت بۆ گەشەیە. ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا بازاڕ ڕۆڵی «خۆ –ڕێکخەر»ی هەیە و ئەگەر دەوڵەتەکان دەستێوەردان لە ئابووری نەکەن، بازاڕ مەیلی هاوسەنگی و گەشەبەخشینی خۆی بە باشترین شێوە بەڕێوە دەبات.[٩] بۆ ئەم مەبەستەش (ڕۆڵی گەشەبەخشی) دەوڵەتەکان دەبێ ڕێگە بۆ بازاڕی ئازاد بکەنەوە و خۆیان لەسەر ڕێگەکە بکێشنەوە. بەڵام ڕادیکاڵەکان سا نەتەوەگەراکانی ڕادیکاڵ و بەتایبەت زۆر لە لێکۆڵەرە مارکسیستەکان باوەڕەیان بەو بانگەشەیە نییە. بەشێکی زۆر لە ڕەخنەگرە مارکسیستەکانی لیبڕالیزم لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان لەسەر ئەم باوەڕەن کەوا :

١- بازاڕی ئازاد بەو جۆرە کەوا نوێ لیبڕاڵەکان ئێستا باسی دەکەن تەنیا درۆیەکە و سەرجەم درۆکانی نوێ لیبڕاڵەکان شتێک جگە لە دەربڕینی یەک ئایدیالۆژی بۆ هۆ ڕوونکردنەوەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان نییە.

٢- بازاڕی ئازادی سەرمایەداری نە تەنیا حەز لە هاوسەنگی ناکات بەڵکو تەنانەت لە ڕووی سروشتییەوە حەزی لە قەیرانە. هەندێک لەو لێکۆڵەرانە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەوەی کە بەووەتە هۆی سەقامگیری ڕێژەیی و گەشەی ئابووری لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی، سیاسەتە سوسیال دیمۆکراتییەکان و مۆدێلی ئابووری «کینزی» بووە نەک سیاسەتە نوێ لیبڕاڵەکان. [١٠]

لە نێو لێکۆڵەرە مارکسیستەکان دوو دەستە لێکۆڵین دەتوانین لە یەکتر جیا بکەینەوە. دەستەی یەکەم کە وڵاتەکان زیاتر بە هۆکارە سیاسییەکان دەبەستێتەوە و لە ڕاستیدا ئەوە بە »جیهانی سازی» دەزانێ و دەستەی دووەم کە وڵاتەکان بە هۆکارە ئابوورییەکان، واتە ئاڵوگۆڕی گرینگ لە بنەما سەرمایەدارییەکان پەیوەند دەدات. ڕەنگە بتوانین «سەمیر ئەمین» لە دەستەی یەکەم جێ بکەینەوە. بەپێی لێدوانی «سەمیر ئەمین» ئیمپریالیزم بۆ زاڵبوون بە سەر جیهان دوو شەپۆلی تێپەڕاندووە و ئێستا دەچێتە ناو شەپۆلی سێیەمەوە. شەپۆلی یەکەم زاڵبوون بە سەر قارەی ئەمریکا بوو کە لەگەڵ قۆناغی «مێرکانتلیستی» گەشەی سەرمایەداری هاوکات بوو. شەپۆلی دووەم کە لەگەڵ قۆناغی گەشەی پیشەسازی هاوکاتە، بوو بە هۆی زاڵبوون بە سەر ئاسیا و ئافریقا بە مەبەستی پێکهێنانی بازاڕی فرۆشی کەلوپەلە پیشەییەکان و تاڵانی سەرچاوە سروشتییەکان. شەپۆلی سێیەم لەگەڵ داڕمانی یەکێتی سۆڤییەت و ڕژیمە نەتەوەگەرا پۆپۆلیستەکان (گەل پەروەر) لە جیهانی سەرمایەداریدا دەستی پێکرد. ئیمپریالیزم لەم قۆناغەدا هەمان ئامانجەکانی پێشتر دەگرێتە بەر: کۆنترۆڵی بازاڕی فرۆش و سەرمایە، تاڵانی سەرچاوە سروشتییەکان و قازانج کێشانەوە لە وزەی کار لە ئاستی جیهانیدا. هۆهینانەوەی ئاخاوتنی – ئایدیالۆژیکی ئەم قۆناغە بریتییە لە »جیهانی سازی »، «بەرگری لە دیمۆکراسی و مافی مرۆڤ» (و ئەگەر «ئەمین» دووبارە چاو بە کتێبەکەی بێنێتەوە »شەڕ دژی تیروریزم» بە بابەتەکانی سەرەوە زیاد دەکات).

**ئیمپراتوری نوێ:**

لــە بەرامبــەردا، «نیکــوس پــولانزاس» کــەوا لــە مارکسیســتە بنەماگــەرا فەرەنسییەکانە، سەرهەڵدانی پرۆسەی جیهانی سازی دەگەڕێنێتەوە بۆ گۆڕانکاری لـە بنـەمای ئـابووری. ئێمـە دیتمـان «مانۆئێل کاسـتڵز»هـەروها جـەختی لەسـەر گۆڕانکاری بنەمای سـەرمایەدارییە. بـەڵام لێدوانـەکانی «پـولانزاس» و «کاسـتڵز» جیاوازی زۆری هەیە. لێرەدا وا باشە چاوێک بە بۆچوونی «پولانزاس» بخشێنین کە بەش بە حاڵی خۆی سەرنج ڕاکێشە. «پولانزاس» وەکو «سەمیر ئەمین» و زۆر لـە هـاوبیرانی، هێژمـۆنی نەتـەوە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا وەکـو پاڵپشـتی سـەرەکی ڕەوتـی جیهـانی سـازی دەبینـێ. ئـەویش بـە پێچەوانـەی پڕوپاگەنـدا هەنووکەییەکان لە بابەت کەم بوونەوەی ڕۆڵی دەوڵـەت نەتـەوەکان جـەخت لەسـەر ئـەم خاڵـە دەکـات کـە دەوڵـەت بـە هـەمان شـێوەی پێشـوو لـە کـۆنترۆڵ کردنـی ئابووری ڕۆڵی سەرەکی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕوانگەی ئەو لەگەڵ ڕوانگەی ئەو کەسـانەی کـە هێژمـۆنی ئـەمریکا وەکـو پاڵپشـتی سـەرەکی «جیهـانی سـازی » دەزانن، جیاوازی زۆری هەیە. «پولانزاس»جەخت لەسەر دوو خاڵ دەکاتەوە:

١- کاتێـک سـەرمایەی فرەنەتـەوەیی دەچێتـە نـاو فۆرماسـیۆنی ئـابووری – کۆمەڵایەتی وڵاتی خوازیار، نە وەک «سـەرمایەگوزاری بیانی تاک» بەڵکو وەک، وزەیەکی کۆمەڵایەتی گۆڕانکەر دەچێتە ناو ئەو فۆرماسیۆنەوە؛

٢- کاریگـەری و کارتێکـەری سـەرمایەی بیـانی لەگـەڵ سـەرمایەی نێوخـۆیی دەبێتـە هـۆی توانـەوەی بـورژوازی نەتـەوەیی کـە وەکـو نێوەنـدی بەرژەوەندییـە نەتەوەییەکانە، بەڵام دەوڵەتی خوازیار نە تەنیا گرینگی خۆی لە دەست نادا بەڵکو خۆی بۆ ئـەرکێکی تێکچنراو بریتـی لـە ڕێکخسـتنی پێوەندیی نێوان سـەرمایەداری نێونەتـەوەیی و بورژاوزی نێوخۆ لـە دۆخێکدا کە شـەڕی چینایـەتی و سیاسـی و هەروەها فۆرمە ئایدیالۆژیکەکان بوونیان هەیە، ئامادە دەکات. [(١١)]

پولانزاس لـە سـەر ئـەم باوەرەیە کـە ئیسـتا پێوەندیی نێوان نێوەندەکان واتـە میترۆپۆلەکان لە سیستەمی ئیمپریالیستیدا لـە سـەر بنـەڕەتی بنـەمای فـەرمانڕەوایی و پاشـکۆبوون لـەنێو زنجیرەیـەکی ئیمپریالیسـتی ڕێکدەخرێ. هێژمـۆنی ئـەمریکا

هاوشێوەی هێژمۆنی نێوەندێک بەسەر نێوەندێکی تر نییە؛ جیاوازی ئەم هێژمۆنییە لەگەڵ هێژمۆنییەکانی پێشوو (ئینگلیس لە سەدەی ١٩) ئەوەیە کەوا، ئەم هێژمۆنییە بە شێوەی سەقامگیربوونی پێوەندییە سەرمایەدارییەکانی ئەمریکا و فەرمانڕەوایی ئەو لەنێو نێوەندێکی دیکە دەناسرێ. ئەم هێژمۆنییە دەتوانێ دۆخی ئایدیالۆژیکی و سیاسی ئێمپریالیستی ئەمریکا لەنێو فۆڕماسیونەکانی تر دووبارە بەرهەم بێنێتەوە.

تیۆریی «پولانزاس» لە پاش ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٤ لە ئینگلیس لە جێگاکانی دیکە دووپات بووەتەوە. لە ساڵی ١٩٧٤ لە پاش زنجیرەیەک ناڕەزایەتی کرێکاری لە ئینگلیس، دەوڵەتی پارێزکار کە لەو کاتەدا دەسەڵاتی بە دەستەوە بوو، تووشی قەیران بوو و لە هەڵبژاردنێکی چاوەڕوان نەکراو حزبی کرێکار دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت. وەزیری دارایی حزبی کرێکار هەڕەشەی کرد کە بۆ بەهێزکردنی پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی، دەوڵەمەندەکان دەبێ زیاتر لە پێشوو بکەونە ژێر گوشارەوە. دژکردەوەی بازاڕ لە بەرامبەر ئەو وتەیەی وەزیری دارایی، دابەزینی توندی نرخی لیرە بوو. دەوڵەتی کرێکار ناچاربوو بۆ چاک کردنەوەی پێگەی لیرە داوای قەرز لە سندوقی نێونەتەوەیی دراو بکات. دەوڵەتی نیکسۆن کە هێرشی کردبووە سەر سیاسەتەکانی «سۆسیال دیمۆکراتەکان»، لە بری قەرز مەرجی بۆ دەوڵەتی کرێکاری دانا کە ئەوە بە مانای داخستنی سیستەمی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بوو. پەیمانێک ناسراو بە پەیمانی واشنگتۆن لە نێوان ئینگلیس و سندوقی نێونەتەوەیی دراو واژۆ کرا کە بەپێی ئەو پەیمانە دەوڵەتی کرێکاری ئینگلیسی ناچار بە لابردنی سیستەمی دەوڵەتی خۆشگوزەران دەبوو.

«ڕێککەوتننامەی واشنگتۆن» بە بۆچوونی «پولانزاس» سەرەتای خولێکی نوێ لە مێژووی ئێمپریالیزم و هەروەها نوێ لیبراڵیزم بوو. پاشان ئەمریکا توانی سەرمایەی جیهانی بە شێوەیەکی بنەڕەتی دووبارە ڕێکخاتەوە، بە جۆرێک کە دەسەڵاتداریتی ئەمریکا لەوە بە دواوە لەنێو وڵاتە نێوەندەکانی تر دووبارە بەرهەمبێتەوە. لە پاش پەیمانی واشنگتۆن لە ماوەی ٢٠ ساڵ لە ١٩٧٩ تا ١٩٩٧،

ڕۆژانە ٢/٥ مادده پەیمانی نێونەتەوەیی گرێ دراوە کە ٩٨ لە سەدی ئەو پەیمانانە لە بابەت سیاسەتە نوێ لیبراڵەکان و کارئاسانی بۆ سەرمایەگوزاری بیانی بووە.[١٣]

لە ساڵی ١٩٩٨ لەکاتی قەیرانی کۆریای باشوور ئەم شێوەیە بۆ ئەم وڵاتە بە کار هاتووە. لەو قەیرانەدا دەوڵەتی کۆریای باشوور بۆ کۆنترۆڵ کردنی قەیران و بەرگری لە دارمانی ئابووری کۆریا داوای قەرزی کرد. بەڕێوەبەرانی خەزینەداری ئەمریکا لە ڕەوشێکی هەستیاردا و لە ڕۆژی چێژن، وەزیری دارایی ژاپۆن و بەڕێوەبەرانی بانکە نێوەندییەکانی ئالمان و ئینگلیسیان لە پشت مێزی وتوویژ کۆکردەوە و پاش وتوویژی زۆر مەرجەکانی قەرزپێدان بە دەوڵەتی کۆریا دەستنیشان کرا. دوای پەسەندکردنی قەرز بۆ کۆریا و تێپەرکردنی ڕۆژە سەختەکانی وتوویژ کاتێک بەڕێوەبەری خەزێنەداری ئەمریکا سیئۆلی بە جێ هێشت و بۆ واشنگتۆن گەڕایەوە، لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنی گوتی: «لایەنی ئەرێنی قەیرانی کۆریا ئەوە بوو کە ئێستا کۆریای باشوور لە کۆنترۆڵی خەزێنەداری ئێمە دایە و بە بۆنەی ئێمەوە کار دەکات.»

## هەڵسەنگاندنی بانگەشەی نوێ لیبراڵی:

نوێ لیبراڵەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا ئەگەر دەوڵەت لە ئابووری دەست بکێشێتەوە، سازوکارە خۆڕێکخەرەکانی بازاڕ دەتوانن ڕێگەی گەشەی کۆمەڵگە بکەنەوە. ئایا لەو وڵاتانەی کەوا جەختی زۆر لەسەر مێتۆدی نوێ لیبراڵ دەکەن، ئاوا مێتۆدێک بە ڕاستی کاری پێکراوە؟ یانی دەوڵەتەکان لە ئابووریدا دەستێوەردان ناکەن؟ گەرچی لە ڕاستیدا بازاڕ لە وڵاتە گەشەسەندووەکانی نێوەند جێگەیەکی گرینگی لە ڕێکوپێکی ئابووری هەیە، بەڵام بابەتەکانی پێ شێل کردنی بانگەشەی سەرەوە کەم نییە. چاولێکردنە سادەکان و خوێندنەوە ئەزموونییەکان نیشان دەدا کە دەوڵەتەکانی وڵاتە نێوەندەکان وەکو ئەمریکا، ئینگلیس، ئەڵمان، فەڕانسە و ژاپۆن پشتیوانی فرەوانیان لە هەندێک کۆمپانیای گەورە کردووە. لێکۆڵینەوەیەک کە دوو کەس لە لێکۆڵەران لە بابەت کۆمپانیا

فرەنەتـــەوەکان کردوویانـــە نیشـــان دەدا کـــە لـــەکردەوەدا ســـەرجەم کۆمپانیـــا گـەورەکانی جیهـان پشـتیوانی سـەرنجڕاکێشـی دەوڵەتـەکانی خۆیـان لەگەڵدایـە. لـەو خوێندنەوەیـەدا هـاتووە کـەوا لـە نێوان ١٠٠ کۆمپانیا کە لـە سـاڵی ١٩٩٣ لـە لایـەن گۆڤـاری «فۆرچۆن» وەکو کۆمپانیا هـەڵبژێردراوەکان هەڵسـەنگێندروان زیـاتر لـە ٢٠ کۆمپانیا ئەگـەر پشـتیوانی دەوڵەتـەکانی خۆیـان لەگـەڵ نەبایـە، نەیاندەتوانی بـە شـێوەی سـەربەخۆ لـە کارەکانیـان بـەردەوام بـن. «مارگارێـت تـاچێر» یـەکێک لـە لایەنگرانی کللەڕەقی بازاڕی ئازاد و لە پێشڕەوانی لابردنـی سیاسـەتەکانی دەوڵـەتی خۆشـگوزەران لــە ســاڵی ١٩٧٧ کاتێـک ســەرۆک وەزیـری ئینگلـیس بـوو، بـۆ وەرگرتنـی قـەرزێکی ٢٢ میلیـون پۆنـدی لـە حیسـابی یارمەتییـە بیانییـەکان بـۆ دەوڵەتی تورکیا بە مەبەستی کڕینی چەک، خۆی تووشی دەستێوەردان کرد.

شتی زۆر لەو بابەتـەوە هەیە و لێرەدا جێگـەی باسکردنی ئـەوان نییـە، بـەڵام ئـەم شـتانە نیشـاندەری ئەوەیـە کـە ڕسـتەڕیزکردنی نـوی لیبرالـەکان زۆرتـر هـۆ ڕوون-کردنەوەیــە بــۆ پێشخســتنی بابــەتی جیهــانی ســازی کــە لــە خزمــەت فرەوانبـوونی هێژمـۆنی ئەمریکایـە. (١٤) لـە ئێسـتادا وڵاتـانی گرووپـی نێوەنـد، بـە پێچەوانەی بانگەشەی نویَ لیبراڵی، پێنج ڕووبـەر لـە ڕووبـەرە مـاڵی، تـەکنۆلۆجی و ڕاگەیاندنەکانیان خستۆتە پاونی خۆیانـەوە و بۆ پاراستنی ئـەم پاوەنـە پـەنا دەبەنـە سـەرجەم ئامێرەکـان وەکو گوشـاری دیپلۆماتیک، سیاسـی و میلیتـاری. ئـەم پێـنج ڕووبەرە بریتین لە :

١- کۆنترۆڵی بازاڕی ماڵی کە بە ڕای «پولانزاس» و هاوبیرەکانی، هێژمـۆنی سـەرمایەداری ئـەمریکا لـە تێکهـەڵچوونی وڵاتـەکان، دیسـان بەرهـەم دێنێتـەوە و ئەسبی ترۆوای ئیمپریالیزمی ئەمریکا تەنانەت لە وڵاتە مێترۆپۆلەکانیشە،

٢- پاوەن لە تەکنۆلۆجی نوێی زانیارییەکان،

٣- پاوەن لە بەرهەمهێنانی چەکە پێشکەوتووە کۆمەڵ کوژەکان،

٤- پـاوەنی ڕاگەیانـدن لـە ئاسـتی جیهـانی بـۆ قـازانجوەرگرتن لـە پێشخسـتنی سیاسەتە کولتوورییەکان و دەستەمۆکردنی ڕای گشتی،

٥- دەست بەسەرداگرتنی پاوەنی بەسەر زۆربەی سەرچاوە سروشتییەکان لە ئاستی جیهانیدا. [١٥]

**جیهانیبوون و پەرەسەندنی ئابووری:**

لاینگرانی تیۆریی نویٰ لیبرالیزم هەنگاونان بەرەو ڕەوتی جیهانیبوون بە شێوەی نویٰ لیبراڵی وەکو هۆیەک بۆ گەشە و پەرەسەندنی ئابووری ڕەهەندەکانی نێوخۆیی و جیهانی وڵاتەکان دەزانن. بەڵام بەرهەڵستکارەکانی ئەوان لەسەر ئەم باوەڕەن کەوا جیهانیبوونی سەرمایەدارانە لە ئاستی جیهانی، نە تەنیا نبووەتە هۆی سەرکەوتنی وڵاتەکان، بەڵکو بە پێچەوانە هۆی وەستانی وڵاتەکانی سازکردووە. «سەمیر ئەمین» جیهانیبوونی سەرمایەدارانەی وەکو هۆیەکی سەرەکی وەستانی ٢٥ ساڵەی ڕابردوو لە ئاستی جیهان ناوبردووە. بە بۆچوونی ئەو لاوازبوونی ئابوری گرووپی حەوت لە پاش «خولی تۆکیۆ» بۆتە هۆی زیابوونی ڕادەی بێکاری، دابەزینی مووچەکان، فروان بوونی پاشکۆبوونی خواردەمەنی لە وڵاتە کەمەرەکان، نزم بوونەوەی ئاستی تەندروستی و پەروەردە و ڕاهێنان، کەم بوونەوەی پێوانەکانی ژینگە و هاتنە خوارەوەی توانای بەرهەمهێنانی زۆر لە وڵاتە کەمەرەکان. [١٦] هاوسەنگی نێوان سیاسەتە سەرەکییەکانی دەزگا پارەییە نێونەتەوەییەکان لەگەڵ سیاسەتەکانی گرووپی حەوت (پاشان گرووپی هەشت) ئەم ڕێگەیەی بەهێز کرد. ڕەنگە کەمێک سەیر بێ کە بۆچی جیهانیبوون و بەڕێوەبەرانی جیهانی سازی دەبێ لاینگری وەستان بن. بەڵام «سەمیر ئەمین» دەڵێ ئەگەر سەرنج بدەین بەوە کە، سەرمایەداری لە پلەی یەکەمدا لە دوای قازانجە و هەندێک جار قازانج لەنێو قەیران دایە، ئەو کات تێدەگەین کە بۆچی هەندێک جار کۆمپانیا فرەنەتەوەکان قەیران پەسەند دەکەن.

لەگەڵ ئەوەش ڕاستەوخۆ ناتوانین جیهانیبوون بە هۆکاری وەستان دانێین. ئەوەی کە بوو بە هۆی پەرەسەندنی وەستانی ناوبراو، لەنێوچوونی هەندێک لە پاژەکانی سیستەمێک بوون کەوا لە پاش شەڕی جیهانی دووەم، جیهانیان پێکهێنابوو، ئەم پاژانە بریتی بوون لە: ١- ئابووری کینزی و دەوڵەتی

خۆشگوزەران لە ڕۆژئاوا ٢- سیستەمی سوسیالیستی لە ڕۆژهەلات و ٣- بزاڤە ڕزگارکەرە نەتەوەییەکان لە ولاتە ژێر چەپۆکەکان. هەولی سەرمایەداری بۆ لاوازکردنی ئەم ووزانە، ڕەوەشی جموجۆلی ئابووریی پاش شەڕی ساز کرد. [١٧] «سەمیر ئەمین» پێمان نالێ کە چۆن و بە هۆی چ سازوکارێک وەها ڕووداوێک سەری هەلداوە، بەلام ئەویکە دیار بێ ئەوەیە کە «سەمیر ئەمین» ڕۆلی یەکەمی بە هۆکاری سیاسی داوە و ئەوە هەمان شتە کەوا کەوتووەتە بەر ڕەخنەوە. [١٨]

سیستەمی جیهانی لە لایەکی تریشەوە توشی قەیران بووە. ئەگەر قەیران وەکو دۆخیک گریمانە بکەین کە لەوێدا لۆژیکی سیستەمی زال بۆ دابین کردنی چاوەڕوانی و داخوازییەکانی زۆربەی خەلک بێ توانا بێت، دەبێ بگوترێ کە سەرمایەداری لە قۆناغی جیهانیبوون توشی قەیران بووە. [١٩] زۆربەی جەماوەر خوازیاری شتگەلێکی وەکو کار و پیشە، باشبوونی خزمەتگوزاری کۆمەلایەتی و کەرەسە و دەرفەتەکانی گەشەی کۆمەلایەتین. بەلام سەرمایەداری جگە لە کار و پیشەی ناتەواو، بێکاری، هەژاری و پەڕاوێزنشینی شتێکی دیکەی لەگەل خۆی بە دیاری نەهێناوە.

جگە لەوە، سیستەمی سەرمایەداریی جیهانی بەم شێوەیە ناتوانێ وەلامدەری داخوازییەکانی زۆر لە نەتەوەکانی جیهان بێ؛ ئەو نەتەوانەی کەوا خوازیاری سەربەخۆیی و ڕێزگرتن لە گەورەیی و سەروەری خۆیانن. لۆژیکی سەرمایەداری لە بەرامبەر داخوزییەکانی ئەم نەتەوانە وەکو پێشوو هەمان لۆژیکی گوشار و چەوساندنەوەیە. [٢٠]

## جیهانیبوون و جیهانیسازی:

ئەگەرچی لە وێژەی سیاسی وشەی جیهانیبوون وەکو وشەیەکی بێ لایەن دێتە بەرچاو کەوا باسی پڕۆسەیەک لە ڕاستی جیهانی دەکا، بەلام لە ژێر ناویی ئەم وشەیە دوو ڕەوتی جیاواز خەریکە ڕوو دەدا. یەکیان «جیهانیبوون» کە یەک پڕۆسەیە و ئەوی تر «جیهانی سازی» کە یەک پرۆژەیە. «جیهانیبوون» وەکو یەک پڕۆسە ئاماژە بە دۆخێک دەکات کە جیهانی ئێمە بە هۆی پەرەسەندنی وزە

نێوخۆیەکانی سیستەمی بەرهەمهێنان و ڕەوتی چارەنەکراوی مێژووی هاوچەرخ، تێپەڕی دەکات. بەڵام «جیهانی سازی» پڕۆگرامێکی سیاسییە کە وڵاتە نێوەندەکان و لە سەرەوەی هەموان نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ جیهان، سازیان کردووە و دیانهەوێ بە ئامێرە سیاسی و میلیتارییەکان ئەو پڕۆگرامە پێش بخەن. قوربانی ئەم جۆرە سیاسەتە، وڵاتە گەشەنەسەندووەکانن کە دەبێ خۆیان لەگەڵ پڕۆگرامی جیهانی سازەکان هاوسەنگ کەن.

تا ئێرە ئێمە جیهانیبوون و جیهانی سازیمان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە یەکتر جیا کردەوە. لێرەدا جیاوازی ئەم دوو بابەتە بە ڕوونی باس دەکەین. ئێمە جیهانیبوونمان وەکو شەپۆلێکی نوێ لە فرەوان بوون و گەشەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی، هاوکات و هاو واتا داناوە.

ئەم شەپۆلە نوێیە لە ڕێگەی فرەوانبوونی چالاکی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان، هاوپێوەندیی زۆر قوڵ لە نێوان زنجیرە ئابوورییەکان لە ئاستی جیهانیدا و بەکورتی پێکهێنانی یەک سیستەمی تۆڕی، دیاری دەکرێ. بەڵام «جیهانی سازی» لە پلەی یەکەمدا بە فرەوانبوونی نۆرمە لیبراڵەکان لە لایەن وڵاتە نێوەندەکان و سەپاندنی ئەو بەسەر وڵاتانی دیکە دیاری دەکرێ. ئەم سەپاندنە لە ڕووی هەڵبژاردنەوە جێبەجێ دەکرێ، واتە وڵاتانی پلە یەکی نێوەند لە هەر شوێنێک کە بە قازانجیان بێ لەسەر ڕێزگرتن لەو نۆرمانە پێداگری دەکەن. گوشار بە مەبەستی ئازادسازی ئابووری و ئازاد هێشتنەوەی ئەو بۆ لۆژیکێکی ئاوەڵا و لکاندنەوەی بابەتی گەشە بەو لۆژیکەوە وەکو سەرەکیترین لایەنەکانی «جیهانی سازی»یە.

لە جیهانی سازی تێپەڕ بین، «جیهانیبوون » ڕەوتێکە کەوا وڵاتە کەمەرەکان نە دەتوانن گرینگی پێ نەدەن و نە دەتوانن خۆی لێ لادەن. کەوایە کێشە لەوەدا نییە کە وڵاتە کەمەرەکان نابێ تێکەڵ بە ڕەوتی «جیهانیبوون» بن، بەڵکو ئەوەیە کەوا چۆن لەگەڵ ئەم ڕەوتە پێوەندیی بگرن تا بتوانن لەو دەرفەتانەی کەوا جیهانیبوون دروستی دەکات کەڵکی زیاتر وەرگرن و خۆیان لەو خەسارانە کە لەگەڵ دەرفەتەکانە، بپارێزن تا زیانێکی کەمتریان لێکەوێ. ئەم دەوڵەتانە دەتوانن

بە مەبەستی پێکەوەبوون لەگەڵ ڕەوتی «جیهانیبوون» پرۆگرامێکی تۆکمەیان هەبێ. بۆ وێنە چین و هێند توانیان لە دەرفەتەکانی «بە جیهانیبوون» بە باشی کەڵک وەرگرن بەڵام وڵاتەکانی وەکو کۆریای باشوور، فیلیپین، ئەندۆنیزیا، برازیل و ئارژانتین، وێڕای قازانجوەرگرتن لە هەندێک بابەتەوە، توشی زیانی زۆر بوونەوە. بە هەر حاڵ، لە هەلومەرجی ئێستادا پێشوەبردنی بابەتی گەشە بە بێ گرینگیدان بە ڕەوتی بە هێزی جیهانیبوون شیمانەی نییە.

جیهانی سازەکان هەروەها بەش بە حاڵی خۆیان هەوڵ دەدەن جیهانیبوون بەرەو لایەک ڕێنوێنی بکەن کەوا زۆرترین قازانجیان پێ بگەیێنێ. ئەم قازانجە، تێچووی جۆربەجۆری بۆ وڵاتە کەمەرەکان هەیە. قورسترین تێچوو، پتەوکردنی زنجیرەکانی پاشکۆبوونە، بە شێوەیەک کەوا بەشە سەرەکییەکانی ئابووری وڵاتە کەمەرەکان دەکەوێتە دەستی دەزگا دارایی و ئابوورییەکانی وڵاتە نێوەندەکان. ئەگەر لەگەڵ «پولانزاس» هاوبیر بین، دەبێ بڵێین ئاوا ڕووداوێک ڕووی داوە و ئێستا سەرمایەداری ئەمریکا بە زاڵبوونی سەرمایە ماڵییەکانی، خۆی لەنێو وڵاتەکانی دیکە لەوانە وڵاتانی گرووپی نێوەند بەرهەم دێنێتەوە. بە دیتنی وەها ڕوانگەیەک لە ڕووی لۆژیکییەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە جیهانیبوون کەم و زۆر لەگەڵ «ئەمریکایی بوون» هاو ئاستە. لە ڕاستیدا هەندیک کەس جیهانیبوون هەر بەو واتایە وەردەگرن؛بەڵام لەوە دەچێ کە پێشکەشکردنی وەها دەربڕینێک ئاسان نەبێ و پێویستی بەلێکدانەوەی قوڵ و هەمەلایەنەی زانستی هەیە. ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئێستا وەها لێکۆڵینەوەیەکمان لەبەر دەستدا نییە و باشتر وایە لایەنی هۆشیاری زانستی ڕاگرین. هەر وەکو «کاستلز» دەری خستووە لە ئاسیا – ئۆقیانوسی ئارام ئابوورییەکی بەهێز خەریکی سەرهەڵدانە کە ئەگەر بمانەوێ بۆچوونەکەی «پولانزاس» گشتی کەینەوە پێویستی بە پشکنین و بەڵگەنامەی زانستی زیاتر هەیە کە تا ئێستا لەبەر دەستدا نییە.

جیهانی سازی بە مانای هەوڵدان بۆ فرەوان کردنی پرەنسیپ و نۆرمە نوێ لیبراڵەکان لە هەمان حاڵ ئامێرێک بۆ پێشخستنی ئامانجە هێژمۆنییەکانی ئەمریکاشە. لەبەر ئەوە زۆر لە وڵاتە کەمەرەکان لەم بابەتەوە ڕەشبینن. هەوڵدان

بۆ پێشخستنی ئەم ئامانجانە، گوشارێکی دوو ئەوەندە دەخاتە سەر وڵاتە کەمەرە و گەشەنەسەندووەکان. کەلێنە کولتوورییەکانی ئەم سیاسەتانە قورسایی ئەم گوشارانە زیاتر دەکات. لە ڕەوشێک کەوا، جەماوەرێکی زۆری وڵاتانی کەمەرە چوونەتە ناو سیاسەتی چالاکانەوە و خۆڕاگری لە بەرامبەر ئەم گوشارانە بۆیان دژوار بووەتەوە، سیاسەتە جیهانی سازەکان هەڕەشەیەک بۆ سەر ئاسایشی جیهانین.

### جیهانیبوون و مەڵبەندی سەرمایە:

هەندێک لە لایەنگرانی نوێ لیبڕالیزم بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا، هەنووکە باس لە ئێمپریالیزم کردن و جێگۆڕکێی زێدەی ئابووری یا بەهای زیادە لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکانەوە بۆ وڵاتە گەشەسەندووەکان واتای نییە. ئێستا کۆمپانیا فرەنەتەوەکان دەور دەگێڕن و سەرمایەی ئەوان سەر بە وڵاتێکی تایبەت نییە؛بە پێی ئەم بانگەشەیە کۆمپانیا گەورەکان لە ڕاستیدا جیهانین و سەر بە سنوورێکی دیاریکراو نیین. بەڵام ئەم بانگەشەیە ڕاست نییە. کۆمپانیا گەورەکان ئەگەرچی بە فرەنەتەوە ناویان ناون، بەڵام لە راستیدا خاوەن مەڵبەندی نەتەوەیین. ئەوان سەربە وڵاتە نێوەندە گەورەکانن. ئەو قازانجانەی کە ئەم کۆمپانیانە بە دەستی دێنن دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتانە کەوا ئەم کۆمپانیانە سەر بە ئەوانن. کەوایە ئەگەرچی ڕەنگ بێ قۆناغی بەرهەمهێنانی کەلوپەلێک و هەروەها بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەو، بەپێی قازانجە ڕێژەییەکان هەرکام لە جێگە و مەڵبەندە جۆربەجۆرەکانی جیهان بڵاو بووبێتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا ئەوە وڵاتی مەڵبەندی کۆمپانیای سەرەکییە کە خاوەن کەلوپەلی کۆتاییە و دیارە زۆرترین نرخی زێدەی دەست دەکەوێ. ئەو وڵاتانەی کەوا قۆناغە جۆربەجۆرەکانی بەرهەمهێنان لەواندا جێبەجێ دەکرێ هیچ قازانجێکیان لە نرخی زێدەی کۆتایی دەست ناکەوێ. بەشی ئەوان لە بنەڕەتدا لە وزەی کاری سەرچاوە سروشتییەکانەوە پێکدێ و ئەوان لە سەرمایە و بەڕێوەبەرایەتیدا کەمترین بەشیان هەیە. هەر بەم هۆیەوە بەشی

سەرەکی نرخی زێدە بۆ مەڵبەندی نێوەندی کۆمپانیا لە وڵاتە گەشەسەندووەکان و لە سەروی هەموان بۆ نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگوێسترێتەوە.

**جیهانیبوون و جەمسەری هەژاری و دەوڵەمەندی:**

جیهانیبوون گۆڕانێکی لە پەرەسەندنی نارێکوپێکی کەوا، لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییە، ساز نەکردووە. نارێکوپێکی بەردەوام یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی جیهانی ئەمڕۆیە. بەو پێیە مەودا لە نێوان گەشەسەندن و گەشەنەسەندن و دەوڵەمەندی و هەژاری لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی جیهانییە. ئەو مەودایانە لە بارودۆخی جیهانیبووندا نە تەنیا کەم نبوونەتەوە بەڵکو زۆرتریش بووەتەوە. یەکێک لە لێکۆڵەران دەڵێ؛«جیهانیبوون، جەمسەری بوون و پەراوێزبوون بە هۆی پرۆسە هاوشێوەکان، پێوەندییان بە یەکترەوە« هەیە.[٢١] تەکنۆلۆجی مۆدێرن لە هەندێک لە وڵاتە پلە یەکە پیشەییەکان نێوەندگر (متمرکز)ە. زۆر لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان لەو خەڵاتانە بێ بەشن یا بە شێوەی پەراوێزی بەشداری تێدا دەکەن.

ڕاپۆرتێک لەسەر گەشەی مرۆڤی، لە ساڵی ١٩٩٦ باس لەوە دەکات کەوا لە ٧٠ وڵاتی لە حاڵی گەشەدا ئاستی مووچەکان لە چاو دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ هاتووەتە خواری.[٢٢] وڵاتە هەژارەکان وەکو پێشتر هەژارتر و وڵاتە دەوڵەمەندەکان، دەوڵەمەندتر دەبن. بەپێی ئەم خوێندنەوەیە تەنانەت بەشی چینی مامنێوەندیش لە حاڵی نزم بوونەوە دایە.

**پەراوێزەکان:**

1- See:Anthony Mc Crow,"A Global society?"in S. Haletal. (eds) ***Modernity and Its Future*** , Combridge, polity, 1992.

2- Ronald Robertsone ,***Globalization: Social Theory and Globd Culture*** , London, Sage, 1992.

٣- رونالد رابرتسون، ***جهاني شدن***، تئوريهاي اجتماعي و فرهنگ جهاني، ترجمه كمال پولادي، نشر ثالث، ١٣٨٠.

٤- هري مک داف، ***امپرياليزم***، ترجمه هوشنگ مقتدر، انتشارات كوير، ١٣٧٤.

٥- مانوئل كاستلز، ***عصر اطلاعات***، ترجمه علي پايا و ديگران، ٣ ج، تهران : انتشارات طرح نو، ١٣٨٠.

٦- ***هەمان سەرچاوە***، بەرگی ١، لا ١٨٠.

٧- ***هەمان سەرچاوە***، بەرگی ٣، نەسكی چوارەم.

٨- ***هەمان سەرچاوە***، بەرگی ٢، نەسكی دووەم

٩- ***هەمان سەرچاوە***، بەرگی ١، لا ٢٣٦.

١٠- سمير امين، ***سرمايه داري در عصر جهاني شدن***، ترجمه ناصر زرافشان (تهران)، نشر آگه، ١٣٨٢)، ص ١٠١.

11- Berndt Roettger:***Neoliberale Globalisierung and Erokapitalistische Regulation***, Dampf boot 1997.

12- Samir Amin ,"Political Economy of Twentith Century",***Monthly Review*** , VOL 55 N. 2 , June 2000,PP. 1-17.

١٣- سندوقی نێونەتەوەیی دراو بەرهەمی دانیشتنی Bretton Woods بوو کەوا لە ژوییەی ١٩٤٤ لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڕێوە چوو. لەم کۆنفرانسەدا بڕیارگەلی گرینگ لە بابەت سیستەمی قەرزدانەوە نێونەتەوییەکان درا.

١٤- سەمیر ئەمین، ***سەرچاوەی پێشوو***.

15- Nicanor Perlas , ***Die Globalisieruns gestalten von Zivilgesellchaft*** und ***Drageliderang***, erschinen beiinfo, 2000

16- ***Globalisierang als politische Heraus Forderung*** , Global Govermente zwischen utopia and Realitot erschinebei werke and Budrich , 2004.

17- Ulrich Teusch, ***Wasist Globalisierung erschinen bei primus***, verlag 2004 kulturelle Globalisirung and Regionale.

١٨- نوام چامسكي، ***نئوليبراليزم و نظم نوين***، ترجمه مرتضوي، تهران، نشر ديگر، 1379، ص 45.

١٩- سەمير ئەمين، ***سەرچاوەی پێشوو***، لا ٥٨.

٢٠- ***هەمان سەرچاوە***، لا ٥٠.

٢١- ***هەمان سەرچاوە***، لا ١١٤.

٢٢- مارتين خور، ***جهاني شدن و جنوب***، ترجمه احمد ساعي، تهران، نشر قومس، 1383، ص 15.

٢٣- ***هەمان سەرچاوە***، لا ١٦.

# کۆی باسەکە

گەشەسەندن وەکو گەورەترین دڵەڕاوکێی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم زۆرترین زەخیرەی فیکری بیرمەندان و سیاسەتمەدارەکانی بە خۆیەوە تەرخان کرد. گشت نەریتە فیکری و ڕێبازە هزرییەکان بابەتی گەشەیان وەکو بابەتێکی هەرە گرینگ داناوە. سیستەمی دوو جەمسەری لە پانتایی نێونەتەوەییدا ئەم بابەتی زیاتر لە جاران زەق کردبۆوە، بە هۆی ئەوەی کە هەر کام لەو دوو جەمسەرە، بانگەشەی شێوازێکی تایبەت لە گەشەیان دەکرد و شێوازی دیاریکراوی خۆیان بەشێوازی باشتر بۆ گەشە پێناسە دەکرد. سیستەمی دوو جەمسەری لە هەمان کاتدا بەشێکی سێیەمیشی هەبوو کەوا «جیهانی سێیەم» ناو نراوە. بەشی سەرەکی باسەکانی پێوەندییدار بە گەشە، لەگەڵ کێشەکانی جیهانی سێیەم و چارەنووسی ئەو پێوەندیی هەبوو. بارودۆخی جیهانی سێیەم و هەوڵدانی ئەو بۆ گەشە، بوو بە سەرەکی ترین بابەتی باسە تیۆرییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم. ئەم بابەتە وێڕای ئەوەی کە ڕێبازە هزرییە جۆربەجۆرەکانی بۆ هەڵوێست گرتن و تیۆرییدارشتن لەو بوارەدا هاندا، خۆی دەستەیەکی فرەوان لە تیۆرییەکانی پێکهێنا کە لە دڵی ئەواندا تیۆرییەکانی ڕێبازی «پاشکۆبوون» سەریان هەڵدا. هەر کام لەم ڕێبازانە چەند بابەت و کێشەی گرینگیان لەمەر گەشەسەندن پێشکەش کرد و ڕەخنەیان لە بابەت و بۆچوونەکانی ڕێبازەکانی دیکە گرت و وێژەیەکی فرەچەشنی و هەندێک جار عەینییان پێکهێنا.

ئێمە لەپاش باسێک سەبارەت بە جیهانی سێیەم وەکو چەمکێکی گرینگ لە پانتایی باسەکانی پێوەندیدار بە گەشەوە سەرەتا نەسکێکمان بە ڕێبازە کلاسیکەکانی گەشە تەرخان دا. کارڵ مارکس یەکێک لە بیرمەندە کلاسیکەکان بوو کەوا تیۆرییەکانی بە شێوەی جۆربەجۆر پێوەندیی لەگەڵ باسی گەشە ساز دەکرد. مەترسی سەرەکی لای مارکس جۆرە واتایەک لە گەشەسەندن بوو کەوا لە نیوەی

دووەمـــی ســـەدەی بیســـتەم پێشـــکەش کرابـــوو. ســـەرقاڵیی ســـەرەکی مـــارکس چارەنووسی چینێک بە ناوی پرۆلتاریا و هاوپەیوەند لەگەڵ ئەو جمووجۆڵەکانی سیستەمی سەرمایەداری بوو. مارکس پشکنینێکی وردی لە سەرجەم لایەنەکانی سیستەمی سەرمایەداری بەڕێوە برد کە بەشێک لەو، لەگەڵ کێشەی یاساکانی گەشەی ئەم سیستەمە پێوەندیی ساز کرد. تیۆرییەکانی مارکس لەو جۆرە تیۆرییانە بوو کەوا لە نێوان بیرمەندان، تیۆرییداڕێژان، سیاسەتمەدارەکان و بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان دەنگدانەوەی فراونی ساز کرد. تیۆرییەکانی مارکس نەریتێکی هزری فرەوانی بە ناوی «مارکسیزم» پێکهینا. ئەم ڕێبازە زۆر زیاتر لەو شتەی کەوا ناووکی سەرەکی تیۆرییەکانی مارکسی پێک دێنا، چووە پێش و ئەوە نابی لەگەڵ ئەو شتەی کەوا لە هزری مارکسدا بوو، وەکو یەک چاو لێکەین.

مارکسیزم لە نێوان ڕوناکبیران، چالاکە سیاسییەکان، کاربەدەستە دەوڵەتییەکان و تیۆرییداڕێژەکانی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ڕەنگێکی دیکەی بە خۆیەوە گرت و یەکسەر لە خزمەت کێشەی گەشە دانرا. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کەوا، زۆرجار تەفسیرەکانی سەر هزری مارکس کە بۆ تیۆرییداڕشتن لە بابەت باسی گەشە پێشکەش دەکران، بە توونـدی دژ بە یەک ڕادەوەستان. تیۆرییەکانی لێنین، ترۆتسکی، مائۆ کە ئێمە ئەوان وەکو تەفسیرە کلاسیکەکانی گەشە دەناسین، لەم تەفسیرانەن کە بە دژ یەک ڕادەوەستن. ئەم بیرمەندانە لەو چالاک و تیۆرییداڕێژانەن کە هەوڵیان دا تیۆرییەکانی مارکس لەگەڵ دۆخی تایبەتی وڵاتی خۆیان کە کەوتبوونە ناو گەشەی مۆدێرنەوە، بگونجێنن.

تیۆرییەکانی مارکس تا ئەو جێگەیە کەوا پێوەندیی بە گەشەی وڵاتە گەشەنەسەندووەکانەوە هەیە کەمە و ناڕوونییەکی ساز کردووە کە بۆتە هۆی پێکهاتنی تەفسیرە جۆربەجۆرەکان (هەر وەکو ئاماژەمان پێ کرد کێشەی گەشەی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بابەتی پشکنینەکانی مارکس نەبوو. ) مارکس لە بابەت ڕۆڵی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیس لە هێند چەند بابەتێکی لە »نیویۆرک دیلی تریبۆن» (نەسکی دووەمی کتێبی سەرمایە)نووسیوە کە باس لە ڕۆڵی سەرمایەداری ڕۆژئاوا بۆ گۆڕانکاری لە سیستەمی ئابووری – کۆمەڵایەتی وەستاوی ڕۆژهەڵات دەکات.

مارکس هەر لەو باسەدا ئاماژە بە کاریگەری دووانەی کۆلۆنیالیزم دەکات، بەڵام بە سەرنجدان لە قووڵایی تیۆریی مارکس دەبینین کەوا کاریگەری ئەرێنی کۆلۆنیالیزم زۆر قورستر لە کاریگەری نەرێنی ئەو لێکدەداتەوە. مارکس باسی لە گۆڕانکاری سیستەمی درێژخایەنی «ئاسیایی» کردبوو کە ئەوە گۆڕانکارییەکی گرینگ دێتە ئەژمار. لە حاڵێکدا «ستالین» دەیهەویست ئەم تیۆرییانەی مارکس بشارێتەوە. «ویتفۆگل» هاوڵاتی مارکس ئەو باسەی کردە هەوێنی تیۆرییداڕشتنێکی گرینگ کە لە ناخی ئەودا تیۆریی «سیستەمی ئاسیایی» و «زۆرداری ڕۆژهەڵاتی» هاتە دەرێ. ئەنجامی لۆژیکی تیۆریی ویتفۆگیل ئەوەیە کە سیستەمە گەشەنەسەندووەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە پێوەندیی لەگەڵ سەرمایەداری پێشکەوتووی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوور بە ناو ڕێگەی گەشەی سەرمایەداری تێ دەپەڕێن. تیۆریی مارکس و پەرەسەندنی لەنێو تیۆریی ویتفۆگل لەوە زیاتر پێوەندیی لەگەڵ وڵاتە گەشەنەسەندووەکان نامێنێ، بە هۆی ئەوەی کە بابەتی لێکۆڵینەوەکانی ئەم دوو بیرمەندە لە ڕاستیدا شتێکی ترە.

«ولادیمیر ئیلیچ لینین» یەکێکیتر لە لایەنگرانی مارکس بوو کە پەرەی بە تیۆریی مارکس دا و بۆ گەشەسەندنی ڕووسییە کەڵکی لێ وەرگرت. «لینین» تیۆریی «بەهای» مارکسی گەشە پێدا و تیۆریی ئیمپریالیزمی خۆی پێشکەش کرد. تیۆریی ئیمپریالیزم باسی زۆر گرینگی لە بابەت کێشە هزرییەکانی گەشە تێدایە. تیۆریی «لینین» دەتوانین هەتا تەفسیری دیاردەی جیهانیبوون، درێژەی پێ بدەین. «لینین» لە پەرتووکی «ئیمپریالیزم، دوایین قۆناغی سەرمایەداری»، جموجوڵی ئیمپریالیزمی لەگەڵ بابەتی دابەزینی نرخی قازانج لە سیستەمی سەرمایەداری و قەیرانی کەڵەکەکردن کە بە هۆی ئەوەوە سەرهەڵدەدا، گرێ داوە. ئامانجی سەرمایەداری لە ڕووهێنان بەرەو وڵاتە گەشەنەسەندووەکان، گوێستنەوەی سەرمایە بە ئامانجی قازانجی زۆرتر و چارەسەرکردنی قەیرانی کەڵەکەکردن لەنێو وڵاتە سەرمایەدارەکانە. دیاردەی ئیمپریالیزم و بەشێک لە دیاردەی کۆلۆنیالیزم دەتوانین لە ڕێگەی ئەم تیۆرییە لێکبدەینەوە و تاوتوێی بکەین.

«لێنین» زۆرتر خۆی سەرقاڵی گەشەسەندنی ڕووسییە کرد. ڕووسییە لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم یەکێک لە وڵاتە کەمتر گەشەسەندووەکان بوو. ڕوناکبیرە شۆڕشییەکان بریتی لە »نارۆدنیکەکان« و «سۆسیال دیمۆکراتەکان» دەیانهەویست لە ڕێگەی جوڵانەوەی شۆڕشگێرانە ڕووسییە بخەنە ناو قۆناغێک لە گەشەسەندن کەوا شۆڕشی سۆسیالیستی و سەقامگیربوونی سۆسیالیزم لەوێدا ساز بێت. «لێنین» لە هەوڵی گەشەی سۆسیالیستی دابوو، هەر بۆیە بەشێکی دیکە لە تیۆرییەکەی ئەو لێکدانەوەی «گەشەی ناهاوسەنگ» لە نێوان وڵاتە سەرمایەدارەکان بوو. «لێنین» تیۆریی «شۆڕشی سۆسیالیستی» خۆی لەگەڵ تیۆریی «گەشەی ناهاوسەنگ» پەیوەند دا بە هەمان شێوە کەوا تیۆریی «گەشەی ناهاوسەنگی» لەگەڵ تیۆریی «قەیرانی کەڵەکەکردن» پەیوەند دابوو. «لێنین» ئەم تیۆرییەی پێشکەش کردبوو کەوا، پەرەسەندنی ناهاوسەنگ دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بازنەیەکی لاواز لە زنجیرە وڵاتە سەرمایەدارەکان و شۆڕش دەتوانی هەر لەم بازنە لاوازەوە دەست پێ بکات. «لێنین» وەکو، ڕێبەری بزاڤێکی سیاسی تیۆرییەکەی خۆی خستە جێ. ئەگەرچی دەبی چەند دەیە تێپەڕێ تا بتوانین هەڵسەنگاندنێکی دروستمان لە تۆوەیەک بێ کەوا تیۆریی «لێنین» لە ڕووسییە چاندوویەتی.

شۆڕشی ڕووسییە و سەرهەڵدان و پەرەسەندنی سۆڤییەت دیاردەیەکی بە ناوی «جیهانی سێیەم» ساز کرد کە بوو بە نێوەندی باسی گەشەسەندن. لە دەیەی یەکەمی پاش شەری دووەمی جیهانی کە سەرجەم بۆچوونەکان، لە ئۆرگانە نێونەتەوەییەکانەوە بگرە تا کاربەدەستە دەوڵەتییەکان و چالاکە سیاسییەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم سەرنجیان کەوتبووە سەر گەشەی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان. لە نێوان زاناکانی وڵاتە گەشەسەندووە ڕۆژئاواییەکان کە بەپێی نەریتی کۆمەڵناسی سەبارەت بە گۆڕانکاری کۆمەڵگەکان لێکۆڵینەوەیان دەکرد، تیۆرییە گەشبینەکانی گەشەسەندن پەرەیان سەند و بە تیۆریی نوێسازی ناویان دەرکرد. زۆر لە بیرمەندان لەو بوارەدا تیۆرییان پێشکەش کرد کەوا لە نەسکی سێیەمی ئەم کتێبە باسی گرینگترینی ئەوانمان کرد. کێشەیەک کە

بەرەورووی ئەم تیۆرییداڕێژانە بۆوە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ پێوەندیی لەگەڵ بابەتی گەشە لە وڵاتە گەشەنەسەندووەکان ساز دەکرد. کێشەی سەرەکی تیۆرییداڕێژانی نوێسازی لە خولی یەکەم (دەیەی ١٩٥٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٦٠) جموجۆڵە نێوخۆییەکانی سیستەمە ڕۆژئاواییەکان بوو. بەشێکی گرینگ لەم تیۆرییانە پێوەندیی لەگەڵ نەریتی کۆمەڵناسی هەبوو و لە ڕێگەی «پارسۆنز«ەوە پێوەندیی بە بۆچوونەکانی «دۆرکیم»، «سپەنسە» و «ماکس ڤێبر» دەگرت. «تالکۆت پارسۆنز» لە ڕێگەی ستراتیجی «کارکردگەرایی بنەمایی» خۆی، نەریتێکی بەهێزی لەنێو نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراند. ئەو جۆرە تیۆرییانە کە بە تیۆرییەکانی «شیکردنەوەی سیستەمی» ناوبانگیان دەرکرد لە بنەڕەتدا کاریگەریان لە تیۆریی «پارسۆنز» وەرگرتووە. لە تایبەتمەندییەکانی ئەو جۆرە تیۆرییانە گەشبینی ئەوان سەبارەت بە گەشەسەندنی سەرجەم کۆمەڵگەکانە. بە ڕای ئەم دەستە لە تیۆرییەکان، بە هەمان شێوە کەوا سیستەمە ڕۆژئاواییەکان دۆخی گەشەیان تێپەڕاندووە، سیستەمەکانی تریش هەروەها ئەم دۆخە تێپەڕ دەکەن و بە پێشەنگە ڕۆژئاواییەکانیان دەگەنەوە. ئەم گەش بینییە لەگەڵ تیۆریی «شیکردنەوەی سیستەمی»پێوەندیی ساز دەکات کە جەوهەری ئەو بریتییە لە جیاکاری بنەمای سیستەمەکان لە گونجاندن لەگەڵ چوراچێوە (محیط)بە مەبەستی پاراستنی مانەوە. «پارسۆنز» کەوا تیۆریی عەقڵانیبوونی «ماکس ڤێبر»ی بە تیۆریی سیستەم گۆڕی، خۆی لە ڕەشبینی «ماکس ڤێب» پاراست و ڕێگەی ئەم جۆرە لێکدانەوەیەی خۆش کرد.

بەڵام گەشبینی ئەو زۆر درێژەی نەبوو. چاوەڕوانی ئەو بۆ گەشەی خێرای وڵاتە گەشەنەسەندووەکان نەهاتە دی. هەر بەو هۆیەوە بۆچوون و ستراتیجی نوێ لە لایەن تیۆرییە ڕەشبینەکان لە بابەت گەشە پێشکەش کرا. ئەم جار نۆرەی بیرمەندانی جیهان سێیەم بوو کە بێنە ناو گۆڕەپانی تیۆرییداڕشتنەوە. ئەگەر «لێنین» و هاوبیرەکانی بیریان لە گەشەی ڕوسیە لە فۆڕمی سۆسیالیستی دەکردەوە و ئەگەر «پارسۆنز» و هاوبیرانی دۆخی سیستەمە پێشکەوتووە ڕۆژئاواییەکانیان وەکو نموونە باس دەکرد، ڕوناکبیرەکانی جیهانی سێیەم و ئەو

کەسانەی کە وەکو ڕوناکبیر لە جیهانی یەکەم و دووەم بیریان لە چارەنووسی جیهانی سێیەم دەکردەوە، لە هەوڵی پێشکەشکردنی تەفسیرە نوێیەکان بە مەبەستی چارەسەرکردنی ڕەوشی نالەباری جیهانی سێیەم بوون. ئەزمونی مێژوویی و تێپەڕبوونی کات نیشانی دا کە کێشە گەشە کێشەیەکی ئاڵۆزە. لەوەها بارودۆخێکدا تیۆرییە نوێیەکان سەریان هەڵدا و پەرەیان سەند. ئەم تیۆرییانە بە تیۆرییە پاشکۆبوونەکان ناوبانگیان دەرکرد.

تیۆریی پاشکۆبوون سەرنجی خۆی لەسەر پاشکۆبوونی وڵاتە گەشەنەسەندووەکان بە وڵاتە گەشەسەندووەکان وەکو هۆکاری سەرەکی دواکەوتوویی دانا و بەم جۆرە دەستەیەک لە تیۆرییەکانی پێوەندییدار بەم کێشانەی پێشکەش کرد. زۆربەی ئەم تیۆرییانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کەوا پاشکۆبوون بۆتە هۆی شڵەزایی شێوازی گەشەی وڵاتە پاشکۆکان. سەرجەم تیۆرییەکانی پاشکۆبوون جەختیان لەسەر ئەم شڵەزاییە هەیە، بەڵام لە بابەت ڕەهەندەکانی ئەم شڵەزاییە و ڕێگەکانی دەرچوون لەو، بۆچوونی جۆربەجۆر هەیە. زۆربەی بیرمەندانی پێوەندییدار بەم جۆرە تیۆرییانە سەر بە وڵاتە گەشەنەسەندووەکانن. جگە لەوە سەرجەم تیۆرییەکانی پاشکۆبوون کەم یا زۆر کاریگەری لە تەفسیرە مارکسیەکان وەردەگرن. ئەوەی کە کام یەک و تا چ ڕادەیەک بە تیۆرییەی مارکس نێزیکترن باسێکی ترە. لەو دەستە تیۆرییانەی کەوا پێوەندییان بە ستراتێجی پاشکۆبوون هەیە، ڕەوتێک بە ناوی تیۆرییە نوێ مارکسیستەکان هەیە کەوا پێوەندیی بە تیۆریی مارکس زیاترە و لە ڕاستیدا دەبێ ئەو وەکو ڕەوتێکی جیا لە بەر چاو بگرین. ڕەوتێکی تر کەوا بە ناوی تیۆریی سیستەمی جیهانی ناوبانگی دەرکردووە و خۆی ڕێبازێکی جیا ساز دەکا هەروەها لە هەندێک لایەنەوە خاڵی هاوبەشی لەگەڵ تیۆریی پاشکۆبوون هەیە. لەگەڵ ئەوەش، وێڕای سەرنجدان بەم خاڵە هاوبەشانە نابێ خاڵە جیاوازەکانی ئەوان پشت گوێ خەین. هەندێک لە بیرمەندانی سەر بەو ڕێبازە کە لە پلەی کاربەدەستی دەوڵەت یا ئابووریزان چالاکییان هەیە، هەوڵیان بۆ جێبەجێ کردنی تیۆرییەکانی خۆیان داوە. بەڵام هەر وەکو لە نەسکی چوارەم و پێنجەم ئاماژەمان پێکرد ئەم کار

و چالاکییانە سەرکەتوو نەبوون. زۆربەی ئەم چالاکییانە بۆ پتەوکردنی بنەمای پیشەسازی نەتەوەیی بە مەبەستی ڕزگاربوون لە دەسەڵاتداریتی وڵاتە ئیمپریالیزمەکان هەوڵیان داوە. ئەو هەوڵانە ئەگەرچی هەندێک ئەنجامی لە گەشەی پیشەسازی هەندێک وڵاتی گەشەنەسەندوو هەبوو، بەڵام ڕزگاری ئەو وڵاتانەی بەو جۆرەی کەوا سیاسەتداڕێژانی ئەو وڵاتانە چاوەڕوانیان دەکرد، بە دواوە نەبوو. هەر بۆیە ئەم تیۆرییانە کەوا مەبەستیان ڕزگارکردنی وڵاتە پاشکۆکان بوو لە کۆتاییدا سەبارەت بە ئەگەری ڕزگاربوون، جۆرێک ڕەشبینی لە باسەکانیاندا دەبیندرا. دوایین نووسراوەکانی «گوندر فرانک» بیرمەندی بەناوبانگی تیۆریی پاشکۆبوون لەم چەشنە نووسراوانەیە.

بۆچوونی ڕادیکاڵ لە ڕێبازی پاشکۆبوون، سەرجەم چالاکی و تایبەتمەندییە ئابوورییەکانی وڵاتە پاشکۆکان وەکو، دەنگدانەوەی دۆخی پاشکۆبوونی ئەوان بە وڵاتە ئیمپریالیزمەکان دەزانێ. بەپێی ئەم ڕوانگەیە گەشەسەندوویی و گەشەنەسەندوویی بەرامبەر بە یەک پەیوەندیان هەیە. گەشەسەندنی دەستەیەک لە وڵاتەکان دواکەوتوویی دەستەیەکی دیکەی بەدواوەیە. دواکەوتوویی و گەشەسەندن تەواوکەری یەکترن. زۆربەی بیرمەندانی سەر بەم بۆچوونە، تەنیا ڕێگەی ڕزگاربوون لە پاشکۆبوون لە ڕێگەی شۆڕشی سۆسیالیستی جیهانیدا دەبینن. هەنووکە ڕادەی ئەو کەسانە کەوا دڵیان بە ڕێگەی شۆڕشی سۆسیالیستی جیهانی خۆش کردووە زۆر کەمترە و لە بەرامبەردا ڕادەی ئەو کەسانەی کەوا توشی بێ هیوایی بوون زۆرترە.

تیۆریی «سیستەمی جیهانی» کەوا لە گەڵ ناوی «والرشتاین» گرێ دراوە تیۆرییەکی تێکچنراو و بەهێزترە. «والرشتاین» بە جێی ئەوەی کە وڵاتەکان وەکو یەکەی شیکردنەوە گریمانە بکات، سەرجەم جیهانی وەکو یەک سیستەمی یەکە خستە بەر پشکنین و لێکۆڵینەوە. جیهان لە سیستەمێک لە نێوەندەکان و کەمەرەکانە پێکهاتووە. گرووپێک لە وڵاتەکان بەپێی کارکردی ئابووری – کۆمەڵایەتی لەنێو نێوەندەکان دادەنرێن و گرووپێک لەنێو کەمەرەکان. سەر بە نێوەند یا کەمەرەبوون دۆخی یەک وڵات دەستنیشان دەکات. ئەم دۆخە لەگەڵ ئەرکێک کەوا هەر وڵاتێک

له سیستەمی جیهانی هەیەتی گونجاوە. ئابووری سەرمایەداری ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم سیستەمە جیهانییە پێکدێنێ. تیۆریی سیستەمی جیهانی لە دەیەی ١٩٧٠ بەملاوە سەرنجی زۆر لە لێکۆڵەرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. «والرشتاین» جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە نابێ وا بیر بکەینەوە وڵاتەکان وەکو تۆپەکانی سەر مێزی بیلیارد لە یەک دەدرێن و بە لای یەکتردا تێدەپەڕێن. سەرمایەداری بە هەمان شێوە کەوا لەنێوەوەی وڵاتێک سەرجەم فۆڕمەکانی ژیان لە ڕەهەندەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکاری و هۆگری چینایەتی بە یەکدا دەدا، لە ڕەهەندە جیهانییەکانیش هەروەها هەر بەم چەشنە کار دەکا. سەرمایەداری جیهان وەکو سیستەمێکی یەکە لێدەکات، ئەگەرچی ئەم سیستەمە بە شێوەی هیرارشی بریتییە لە نێوەندەکان، کەمەرەکان، کەمەرەکانی کەمەرەکان.

«مانوئێل کاستڵز» لە کتێبی «چەرخی زانیارییەکان» هەروەها سەرنجی بە گۆڕانکاری لەم شێوازە داوە. «کاستڵز» جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردووە کەوا شێوازی نێوەندەکان و کەمەرەکان ئێستا تەنانەت لەنێوەوەی وڵاتێکیش ساز بووە. لەنێوەوەی وڵاتێکیش ئێمە لەگەڵ ناوچە نێوەندەکان، ناوچە کەمەرەکان و ناوچە تەواو پەڕاوێزەکان ڕووبەڕوو دەبین. جگە لەوە »کاستڵز» دابەشکارییەکی نوێ لە سیستەمی جیهانی پێشکەش دەکات کە سەرنجی ئەو لەسەر چۆنێتی وزەی کار لە لایەنی ڕادەی تێکچنراوی و پسپۆڕییە. هەروەها ئەو توێژبەندییەکی نوێ لەنێو سیستەمی جیهانی دەبینێ و پێناسەی دەکات و ئەم پێناسەیە دەبێتە هۆی چڕکردنەوە و پەرەپێدان بە تیۆریی «والرشتاین» کە تا کۆتایی ئەم هەزارەیە بەدوایدا دەڕوا. لە دابەشکاری نوێدا، وڵاتانێکی نوێ لەناوچە دەرەوەیەکان هاتونەتە ناو ناوچە نێوەندەکانەوە (بۆ وێنە هەندێک لە وڵاتەکانی ئاسیای باشووری ڕۆژهەڵات). ئەم جموجۆڵە وێڕای ئەوەی کە لە شوێنی خۆیدا گرینگە، بەڵام هێشتا بە واتای گۆڕانی شێوازی گشتی جیهان و سیستەمی هیرارشی ئەو نییە. هەر ئێستاش هیرارشی نێوەند و کەمەرە و هاوکات لەگەڵ ئەو گەشەسەندوویی و گەشەنەسەندوویی، دیاریکەری ڕواڵەتی جیهانی ئێمەن.

## سەرچاوەکانی فارسی


1 – آزاد ارمکی، تقی، ***نظریه های جامعه شناسی***، چاپ دوم، تهران: انتشارات سروش، 1381.

2 – ازکیا، مصطفی، ***جامعه شناسی توسعه***، چاپ سوم، تهران:موسسه نشر کلمه، 1380.

3 – امین، سمیر، ***سرمایه داری در عصر جهانی شدن***، ترجمه ناصر زرافشان، تهران، نشر آگه، 1382.

4 – باران، پل، ***اقتصاد سیاسی رشد***، ترجمه کاوه آزادمنش، تهران، خوارزمی.

5 – بروف، رایان روکس، ***نظریه های توسعه نیافتگی***، ترجمه ی علی هاشمی گیلانی، تهران:سفیر، 1369.

6 – بشیریه، حسین، ***جامعه شناسی سیاسی***، چاپ دوم، تهران:نشر نی، 1374.

7 – بلونتشلی در آبراهام، ج، اچ، ***مبانی رشد جامعه شناسی***، ترجمه حسن پویان، تهران:انتشارات چاپخش، 1363.

8 – چامسکی، نوام، ***نیولیبرالیزم و نظم نوین***، ترجمه حسن مرتضوی، تهران، نشر دیگر، 1379.

9 – چیلکوت، رونالد، اچ، ***درآمدی بر مسائل اقتصادی کشور های جهان سوم : نظریه های توسعه وتوسعه نیافتگی***، ترجمه و تلخیص احمد ساعی، چاپ اول، تهران، نشر قومس، 1383.

10 – خور، مارتین، ***جهانی شدن و جنوب***، ترجمه احمد ساعی، چاپ اول، تهران، نشر قومس، 1383.

11 – دویچ، کارل و رابرت کوهن و جوزف نای، ***نظریه های روابط بین الملل***، ترجمه و تدوین وحید بزرگی، جلد اول، تهران:نشر ماجد، 1375.

12 – روکس بروف، یان، ***نظریه های توسعه نیافتگی***، جامعه شناسی توسعه، ترجمه مصطفی ازکیا، تهران: نشر توسعه، 1370.

13 – رهنما، سعید، ***نظریه های وابستگی***، تهران:نشر پیمان، 1357.

14 – زارع، بیژن، ***نظریه های نوسازی***، کتاب مجموعه مقالات سمینار جامعه شناسی و توسعه، جلد اول، تهران:انتشارات سمت، 1372.

15 – ساعی، احمد، ***درآمدی بر شناخت مسایل اقتصادی-سیاسی جهان سوم: سیاست، قدرت و نابرابری***، چاپ پنجم، تهران نشر قومس، 1383.

16 - ___________، ***مسایل اقتصادی-سیاسی جهان سوم***، چاپ دوم، تهران : انتشارت سمت، 1378.

17 – سانتوس، تی دوس، " بحران نظریه توسعه و مسئله وابستگی در آمریکای لاتین"، ترجمه گیتی اعتماد، ***توسعه و توسعه نیافتگی*** (مجموعه مقالات)، گردآوری شده توسط گروه تحقیقات و مطالعات شهری و منطقه ای، بی جا، نشر ایران، 1358.

18 – سلیمی، حسین، " تاملی در نظریه نظام جهانی"، ***ماهنامه اطلاعات سیاسی-اقتصادی***، شماره 108-107، 1375.

19 – سیف زاده، حسین، ***نظریه پردازی در روابط بین الملل***، چاپ اول، تهران: انتشارات سمت، 1376.

20 – فرانک، آندره گوندر، ***مصاحبه با فصلنامه راهبرد***، سال دوم، شماره 2، زمستان 1372.

21 – __________، ***مصاحبه با فصلنامه فرهنگ***، سال دوم، شماره 3، بهار 1371.

22 – فرخجسته، هوشنگ، ***ویژگی های جوامع سنتی و جوامع صنعتی***، کتاب توسعه، شماره3، نشر توسعه، 1373.

23 – کاستلز، مائول، ***عصر اطلاعات***، ترجمه علی پاپا و دیگران، سه جلد، تهران: انتشارات طرح نو، 1380.

24 – کوزر، لوئیس، ***زندگی و اندیشه بزرگان جامعه شناسی***، ترجمه محسن ثلاثی، تهران: انتشارات علمی، 1368.

25 – مایر، جراید ام و سیرز، دادلی، ***پیشگامان توسعه***، ترجمه سید علی اصغر هدایتی و علی یاسری، تهران: انتشارات سمت، 1368.

26 – مگ داف، هری، ***امپریالیسم***، ترجمه هوشنگ مقتدر، تهران:انتشارات کویر، 1374.

27 – نقیب زاده، احمد، ***درآمدی بر جامعه شناسی سیاسی***، چاپ اول، تهران:انتشارات سمت، 1379.

28 – ورسلی، پیتر، ***جامعه شناسی مدرن***، ترجمه حسن پویان، جلد اول، تهران.

29 – هانت، دایانا، ***نظریه های اقتصاد توسعه؛تحلیلی از الگوهای رقیب***، ترجمه غلامرضا آزاد ارمکی، چاپ اول، تهران:نشر نی 1376.

30 – ی. سو، آلوین، ***تغییرات اجتماعی وتوسعه***، چاپ اول، تهران:پژوهشکده مطالعات راهبردی، 1378.

## سەرچاوەکانی ئاڵمانی


1- Althusser,Louis:Ideologie und ideologische Staatsapparate,inL ders:Marxismus and Ideologie,berlin:VSA,1973 .

2- Ders:Thesen zur Vorlesung:Monopul and Staat im hochentwikkelten kapitalismus,I:WS 74. 75,II:SS 75,Unveroffentichte Manuskripte. Berlin:1974. 75 .

3- Baran,Paul:Politische okonomie des wirtchaftlichdn Wachstums. Neuwied / Berlin: Luchterhand, 1966 .

4- Barandes,Valkhard / Bassam Tibi: Handbuch 2, Unternatwicklung. Frankfurt / koln: Europaische Verlagsanstalt, 1975 .

5- V. Braummuhl,Claudia: Kapitalakkumulation im Weltmarktzusammen-hang. Zum methodischen Ausatz einer Analyse des Burlichen Nationalstaates , in: Gesellschaft. Beitrage zur Marxschen Theorie Nr. 1. Frankfurt: Suhvamp,1974 .

6- Busch,Klaus:Die multinationalen Konzerne. Zur Analyse der Weltmartbewegung des capitals. Frankfurt:Suhrkamp,1974 .

7- Cardose,Fernando Henrique/Enzo Faletto:Dependenciay desarrolio en Americalationa. Buenos Aires: Siglo XXI,1969;deulsch:Abhangigkeit und Entwicklung in Lateinamerrika. Frankfurt,Suhrkamp. 1976 .

8- Cardoso,Fernando Henrique: Estadoy Sociedad en America Latina Buenos Aires: Ed. Nuuva Vision,1972 .

9- Cardova,Armando:Strukturelle Heterogenitat and Wirtschaftliches Wachstum. Frankfurt:Sukrkamp,1973 .

10- Ecki,Jurgen:Populimus and autoritarer staat in Lateinamerika. zum Funktionswanolel des states in Gefolge der Weltwirtschaftskrise am Beispiel Brasiliens and Mexicos- Vargas and Cardena. Hannover:Unv. Habilitationsschrift,1977 .

11- Emmanuel,arghiri:Lediannge inegal. Paris:Maspero,1969 .

12- Evers,Tilman T. /Feter V. Wogau:Dependencia:Lateinamerikanisch Beitrage zur Theorie der Uniterentwicklung,in Das Argument Nr. 79,Juli 1973 .

13- Feder,? Ernest (Hrsg): Ausbeutung and Gewalt. Lateinamerikas Landwirtschaft. Hamburg: Hofmann and Campe,1973 .

14- fernandes, Florestan: Klassengesellschaft and Unterentwicklung,in: H. A steger (Hrsg): Die aktulle Situation Lateinamerikas. Frankfurt: athenaeum,1971 .

15- Frank,Andre Gunder: Kapitalismus and Unterentwicklung in lateinamerika. Frankfurt: Europaische Verlagsanstalt,1969 .
16- Ders. u. a. :Kritik des burgerlichen Anti-Imoerialismus. berlin:Rotbuch,1969 .
17- Friedensanalysen:Fur Theorie and Praxis 3. Schwerpunkt:Untek entwicklung. Frankfurt: Suhrkamp,1976 .
18- Frobel,m Folker/ Juegen Heinrichs/Otto Kreye: Die neue international Arbeitsteilung. Reinbek bei Hamburg: Rowohlt,1977 .
19- Galseano, Eduardo;Die offenen Adern Lateinamerikas. Wuppertal: Hammer,1973 .
20- Gerschenkron,Alexander:Economic Backwardness in historical perspective. Harvard:Harvard Univ. Press,1962 .
21- Gerstenberger, Heide:Zur Politischen okonomie der burgerlichen Gesellschaft. Die Historischen Bedingungen ihrer constitution in den USA. Frankfurt:Fischer Athenaum,1973 .
22- dies. :zur Theorie der historischen Konstitution des Burgerlichen Staats,in: Probleme des klassenkampfs,Nr. 8. 9,1973 .
23- Gonzalez Casanova,Pablo:la democracia en Mexico. Mexico. Era, 1965.
24- Gonzalez Soriano,Raul:El Estado Mexicanoy la crisis econemica,in Historiyay sociedad (Mexico),no. 6,Verano,1975 .
25- Gramsci,Autonio: Philosophie der praxis Frankfurt:Fischer,1967 .
26- habermas,Jurgen:Legitimationsprebleme in Spatkapitalismus, Frankfurt: Suhrkamp, 1973 .
27- Hirsch,Joachim:zur Analyse des politischen Systems, in: Gesellschaft, Beitrage zur Marxschen Theorie, Nv. 1. Frankfurt: Suhrkamp,1974 .
28- Ders. : Zum Problem einer Ableitung der form – and funktious bestimmungem des burgerlichen Staats,i:Karl Marx/Friedrich Engels: Staatstheorie. Frankfurt: Ullstein,1974 .
29- Hochberger,Hanno:Proleme einer materialistischen Betimmung des Staats,in Gesellschaft. Beitrage zur Marxschen Theorie,Nr. 2 Frankfurt: Suhrkamp,1974 .
30- Jaguaribe,Helio: Gesellschaftliche stabilitat durch Kolonialfaschismus? In: Celso fportado (Hrsg):Brasilien heute. Frankfurt: Athenaum,1971 .
31- Lenin,W. I:Der Imperialismus des hochstes stadium des kapitalismus. Berlin : Dictz Verlang,1970 .

32- Ders. :Staat and Revolution. Berlin/DDR:Dietz Verlag,1970 .
33- Mandel,Ernest: Classes Sociales et Crise Politique en Amerique Latine, in: Critique de Economie Politique,No. 16. 17,1974 .
34- Ders: Der Spalkapitalismus. Frankfurt:Suhrkamp, 1972 .
35- Miliband, Ralph: Der Staat in der Kapitalistischen Geselschaft. Frankfurt: Shrkamp,1975 .
36- Ders: Marx and der Staat. Berlin: Merve, 1971 .
37- Mires, Fernando L Kurze Geshitch des pepulismus,in:Kritik der Politischen okonomie,Nr. 2,1974 .
38- Nitsch,Manfred:Legitimations problem in der Dritten Welt-ausgeh-end vom Brasilianischen Modell. Ebenhausen: Hektogr,1975 .
39- Nohen,Dieter/Franz Nuscheler (Hrsg):Handbuch der Dritten Welt. Hamburg: Hoffmann und Campe,Bd. 1,1974,Bd. 2 Und 3, 1976 .
40- Offe,Claus: Politische Herrschaft und Klassenstruren. Zur Anylase spatkapitalistischer Gesellschaftssystemme,in. Kress and Senglass: Politikwissenschaft. Frankfurt:Fischer,1969 .
41- Ders. :Strukturprobleme de kapitalistischen Staats. Frankfurt: Suhrkam, 1972 .
42- Ders: Die Internationalisiergung der kapitalistischen Produkutions Verhaltnisse und der Nationalstaat. Berlin: Merve, 1973 .
43- Ders. / Ralph Milliband: The problem of the capitalist state, in: Robin Blackburt (Hrsg): Ideology in Social Science. Bungay (Suffolk): Fontana/Collins,1972 .
44- Ders. /Ralph Milliband/Ernesto laclau: Kontroverse uber den kapitalistischen staat. Berlin:Merve,1976 .
45- Project Klassenanalyse: Thesen zum verhaltnis von burgelicher gesellschaft und staat, inL Beitrage zum wissenschaftlichen sozielismu, Heft 6, Januar, 1976 .
46- Senglass, Dieter (Hrsg): Imperialism und strukturelle gervalt. Analysen uber Abhangigkeit und unterentrricklung. Frankfurt: Suhrkamp,1974 .
47- Ders. : Weltrrirtschaft Sordnung und Entwichlungspolitik. Pladoyer fur Dissoziation. Frankfurt: Suhrkam, 1977 .
48- Warren,Bill: Imperialism und Capitalist Industrialization, in: New Left Review,1973 .